## سنن الترمذي به کوردی به سەرجەم وتەکانی (ترمذی)ەوە- بەرگی سێیەم
## نووسینی: لأبي عيسى محمد بن عيسى (الترمذي)، ناصح ئیبراهیم سازانی(وەرگێڕ)


چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
سازانی، ناصح ئیبراهیم
سنن الترمذي به کوردی - بەرگی سێیەم، لأبي عيسى- محمد بن عيس (الترمذي)، ناصح ئیبراهیم سازانی(وەرگێڕ)
٦٨٦ لاپەڕە،
١٧* ٢٤ سم
بابەت، فەرموودە
ISBN: 978-9922-632-89-6

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٧٥) ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین: نوسینگەی تەفسیر

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# سنن الترمذی

## بەکوردی

لأبی عیسی محمد بن عیسی الترمذی
(٢٠٩ - ٢٧٩ هـ)

بەرگی سێیەم

لە فەرموودەی

(2945-2036)

وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی

# باسەکانی پزیشکی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٢٦ - أَبْوَابُ الطِّبِّ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

### دەربارەی بەدورکەوتنەوە لەهەندێ خواردن لەبەر نەخۆشیە لە نەخۆشیەکان

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْحِمْيَةِ

٢٠٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُحَمَّدٍ الفَرْوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا حَمَاهُ الدُّنْيَا، كَمَا يَظَلُّ أَحَدُكُمْ يَحْمِي سَقِيمَهُ الْمَاءَ. وَفِي البَابِ عَنْ صُهَيْبٍ، وَأُمِّ الْمُنْذِرِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ. وَقَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ الظَّفَرِيُّ هُوَ أَخُو أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ لِأُمِّهِ، وَمَحْمُودُ بْنُ لَبِيدٍ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَآهُ وَهُوَ غُلَامٌ صَغِيرٌ.

واتە: لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆی خۆشویست دەیپارێزێ لەشتی دونیایی و پلەو پایە، وەك چۆن

کەسێ نەخۆشەکەی دەپارێزێ لە ئاوخواردن لە کاتێکدا کە ئاوخواردن بۆی خراپ بێت).

٢٠٣٧ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ، عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ عَلِيٌّ وَلَنَا دَوَالٍ مُعَلَّقَةٌ، قَالَتْ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ وَعَلِيٌّ مَعَهُ يَأْكُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَلِيٍّ: مَهْ مَهْ يَا عَلِيُّ، فَإِنَّكَ نَاقِهٌ، قَالَ: فَجَلَسَ عَلِيٌّ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ، قَالَتْ: فَجَعَلْتُ لَهُمْ سِلْقًا وَشَعِيرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَلِيُّ، مِنْ هَذَا فَأَصِبْ، فَإِنَّهُ أَوْفَقُ لَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ فُلَيْحٍ، وَيُرْوَى عَنْ فُلَيْحٍ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

واتە: لە (ئوم المنذر)ی کچی قەیسی ئەنصاریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لام، پێشەوا عەلیشی رەزای خوای لێ بێ لەگەڵدا بوو، لەوکاتەدا پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ تازە لە نەخۆشی چاك دەبۆوە، هێشوی فەریکە خورمامان هەبوو هەڵمان واسیبوو بۆ ئەوەی پێ بگات و لێی بخۆین، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا لێی خوارد، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دەستی بۆ برد بیخوات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیهێشت بیخوات پێی فەرموو: ( مەکە نەیخۆی تۆ تازە لە نەخۆشی هەستاویتەتەوە دەبێ پارێز بکەی لەهەندێ خواردن هەتا بە تەواوی چاك دەبیتەوە)، فەرمووی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دانیشت و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خورمای دەخوارد، (ئوم

المنذر) فەرمووی: جۆو سلقم بۆ دروست کردن و بۆم هێنان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەلی لەمە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ باشترەو بەسود ترە).

٢٠٣٧ (م) - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَعْقُوبَ، عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ الأَنْصَارِيَّةِ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ يُونُسَ بْنِ مُحَمَّدٍ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: أَنْفَعُ لَكَ وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ: وَحَدَّثَنِيهِ أَيُّوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

## دەربارەی سوربوون لەسەر چارەسەرکردنی نەخۆش

## ٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّوَاءِ وَالحَثِّ عَلَيْهِ

٢٠٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ، قَالَ: قَالَتِ الأَعْرَابُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ نَتَدَاوَى؟ قَالَ: نَعَمْ، يَا عِبَادَ اللهِ تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ شِفَاءً، أَوْ قَالَ: دَوَاءً إِلاَّ دَاءً وَاحِدًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا هُوَ؟ قَالَ: الهَرَمُ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي خُزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەندێ عەرەبی دەشتەکی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا چارەسەری خۆمان بکەین؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەی بەندەکانی خوا چارەسەری خۆتان بکەن و داو دەرمان بەکاربهێنن، ئەوەش بزانن خوای پەروەردگار هەر دەردێکی دانابێ شیفاو دەرمانیشی بۆ داناوە، یان فەرمووی: (جگە لەیەك نەخۆشی نەبێ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! چییە: فەرمووی: (پیرییە).

## دەربارەی چ خواردنیَ دەدرێت بە نەخۆش

## ٣ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يُطْعَمُ الْمَرِيضُ

٢٠٣٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ السَّائِبِ بْنِ بَرَكَةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَخَذَ أَهْلَهُ الوَعَكُ أَمَرَ بِالحِسَاءِ فَصُنِعَ ثُمَّ أَمَرَهُمْ فَحَسَوْا مِنْهُ، وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّهُ لَيَرْتُقُ فُؤَادَ الحَزِينِ، وَيَسْرُو عَنْ فُؤَادِ السَّقِيمِ كَمَا تَسْرُو إِحْدَاكُنَّ الوَسَخَ بِالمَاءِ عَنْ وَجْهِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَى الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا مِنْ هَذَا. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الطَّالَقَانِيُّ، عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەسێ لە خانەوادە و کەسوکارەکەمانی تای بوایە فەرمانی دەکرد حەلّوای بۆ دروست بکەن، ئەوانیش بۆیان دروست دەکرد، جا فەرمانی دەکرد دەرخواردی بدەن، دەیفەرموو: (دڵی غەمبار بەهێز دەکات و، ئازاری دڵی نەخۆش ناهێڵێ، وەك چۆن یەکێ لەئێوە دەم و چاوی پاك دەشوات و پیسی پێوە ناهێڵێت).

## دەربارەی خواردن و خواردنەوە بەزۆر مەدەن بە نەخۆشەكانتان

٤ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ

٢٠٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ يُونُسَ بْنِ بُكَيْرٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەزۆر خواردن و خواردنەوە مەدەن بە نەخۆشەكانتان خوای گەورە بۆ خۆی خواردن و خواردنەوەیان پێ دەبەخشێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەشكە

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ

٢٠٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ وَالسَّامُ الْمَوْتُ. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَبَّةُ السَّوْدَاءُ هِيَ الشُّونِيزُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن ڕەشكە شیفایە بۆ هەموو نەخۆشی و دەردێ جگە لە مردن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میزی وشتر

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شُرْبِ أَبْوَالِ الإِبِلِ

٢٠٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، وَثَابِتٌ، وَقَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ فَاجْتَوَوْهَا فَبَعَثَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إِبِلِ الصَّدَقَةِ وَقَالَ: اشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کۆمەڵێ لە هۆزی عورەینە هاتن بۆ مەدینە ئاو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت و نەخۆشکەوتن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردن کە بڕۆن بۆ دەرەوەی شار بۆ ناو ڕانە وشترە شیردەرەکان، فەرمووی: (لەوێ شیر و میزی وشترەکان بخۆن هەتا چاك دەبنەوە).

## دەربارەی کەسێ خۆی بکوژێ بە زەهر یان هەرشتێکی تر

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ أَوْ غَيْرِهِ

٢٠٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَرَاهُ رَفَعَهُ قَالَ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ جَاءَ يَوْمَ القِيَامَةِ وَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا أَبَدًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە پارچە ئاسنێ

خۆی بکوژێت ئەوە لە رۆژی قیامەتدا دێت پارچە ئاسنەکەی بەدەستەوەیەو پەیتا پەیتا دەیکات بە سکی خۆیدا ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەرکەس زەهر بخواتەوەو بە زەهر خۆی بکوژێت ئەوە لە رۆژی قیامەتدا زەهرەکەی بەدەستەوەیەو پەیتا پەیتا دەیخواتەوە، ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە).

٢٠٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَرَدَّى فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە پارچە ئاسنێ خۆی بکوژێت ئەوە لە رۆژی قیامەتدا دێت پارچە ئاسنەکەی بەدەستەوەیەو پەیتا پەیتا دەیکات بە سکی خۆیدا ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەرکەس زەهر بخواتەوەو بە زەهر خۆی بکوژێت ئەوە لە رۆژی قیامەتدا زەهرەکەی بەدەستەوەیەو پەیتا پەیتا دەیخواتەوە، ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەرکەس لەکێوێ یان بەرزاییەکەوە خۆی بخاتەخوارەوە و خۆی بکوژێت ئەوە هەمیشە لەو کێوەوە خۆی هەڵدەداتە ناو ئاگری دۆزەخەوە و و پیشەیەتی و هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە).

٢٠٤٤ م - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَ حَدِيثِ شُعْبَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَهُوَ أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ هَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَرَوَى مُحَمَّدُ بْنُ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ عُذِّبَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ: خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَهَكَذَا رَوَاهُ أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهَذَا أَصَحُّ لأَنَّ الرِّوَايَاتِ إِنَّمَا تَجِيءُ بِأَنَّ أَهْلَ التَّوْحِيدِ يُعَذَّبُونَ فِي النَّارِ ثُمَّ يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَمْ يُذْكَرْ أَنَّهُمْ يُخَلَّدُونَ فِيهَا.

٢٠٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الدَّوَاءِ الخَبِيثِ. يَعْنِي السُّمَّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنەوەی دەرمانی پیس و حەرام بۆ چارەسەری. واتە: زەهر.

## دەربارەی بەکارهێنانی مادەی سەرخۆشکەر بۆ چارەسەری نەخۆشی

## ٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّدَاوِي بِالمسْكِرِ

٢٠٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سِمَاكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَأَلَهُ

سُوَيْدُ بْنُ طَارِقٍ، أَوْ طَارِقُ بْنُ سُوَيْدٍ عَنِ الخَمْرِ فَنَهَاهُ عَنْهُ فَقَالَ: إِنَّا نَتَدَاوَى بِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهَا دَاءٌ. حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، وَشَبَابَةُ، عَنْ شُعْبَةَ، بِمِثْلِهِ، قَالَ مَحْمُودٌ: قَالَ النَّضْرُ: طَارِقُ بْنُ سُوَيْدٍ، وَقَالَ شَبَابَةُ: سُوَيْدُ بْنُ طَارِقٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە، لەباوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئامادەی کۆڕ و دانیشتنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، تاریقی کوڕی سوەید یان سوەیدی کوڕی تاریق ڕەزای خوای لێ بێ دەربارەی خواردنەوەو دروستکردنی مادەی سەرخۆشکەر لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ڕێگری لێ کرد، وتی: ئەی چارەسەری خۆمانی پێ نەکەین؟ فەرمووی: (ئەوە دەرمان نیە بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکارناهێنرێت بەڵکو خۆی دەردو نەخۆشیە).

## دەربارەی دەرمان تکاندنە لوت

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّعُوطِ وَغَيْرِهِ

٢٠٤٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَدُّوَيْهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حَمَّادٍ الشُّعَيْثِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ السَّعُوطُ وَاللَّدُودُ وَالحِجَامَةُ وَالمَشِيُّ، فَلَمَّا اشْتَكَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَدَّهُ أَصْحَابُهُ، فَلَمَّا فَرَغُوا قَالَ: لُدُّوهُمْ قَالَ: فَلُدُّوا كُلُّهُمْ غَيْرَ العَبَّاسِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین شتێ کە خۆتانی پێ چارەسەر بکەن: دەرمان تکاندنە لوت و دەرمان کردنە لایەکی دەمی نەخۆش و خواردنیەتی لەلایەن نەخۆشەوە هەروەها کەڵەشاخ و دەرمانێ کە نەخۆش ڕەوان

بکات و بچێ بۆ سەر ئاو). کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەخۆشکەوت هاوەڵانی دەرمانیان کردە لایەکی دەمیەوەو خواردیەوە، کاتێ کە لێبوونەوە فەرمانی کردو فەرمووی: (دەرمان بکەنە لایەکی دەمی هەموویانەوە). – چونکە وەك لە ریوایەتی پێشەوا موسلیم دا هاتووە ئاماژەی کردووە دەرمان نەکەنە دەمیەوە - ئیبنو عەباس فەرمووی: دەرمانیان کردە لایەکی دەمی هەموویانەوە جگە لە عەباس رەزای خوای لێ بێ – لەبەرئەوەی لەوکاتەدا کە دەرمانەکەیان کردە دەمیەوە ئەو لەوێ ئامادە نەبوو - .

٢٠٤٨ – **(ضعيف إلا فقرة الإكتحال بالإثمد فصحيحة)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ اللَّدُودُ وَالسَّعُوطُ وَالحِجَامَةُ وَالمشِيُّ، وَخَيْرُ مَا اكْتَحَلْتُمْ بِهِ الإِثْمِدُ، فَإِنَّهُ يَجْلُو البَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ. " وَكَانَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ بِهَا عِنْدَ النَّوْمِ ثَلاَثًا فِي كُلِّ عَيْنٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبَّادِ بْنِ مَنْصُورٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین شتێ کە خۆتانی پێ چارەسەر بکەن: دەرمان کردنە لایەکی دەمی نەخۆش و خواردنیەتی لەلایەن نەخۆشەوە و دەرمان تکاندنە لوتی و کەڵەشاخ و دەرمانێ کە نەخۆش رەوان بکات و بچێ بۆ سەر ئاو، هەروەها چاکترین کلی ئێوەش کلی رەشە چاوتان پاك دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، مووی برژانگیشتان دەروێنێتەوە). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کلدانێکی هەبوو هەموو شەوێ هەرلایەکی چاوی سێ جار دەڕشت.

## دەربارەی ڕێگری لە خۆ داخکردن بە مەبەستی چارەسەری

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّدَاوِي بِالكَيِّ

٢٠٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الكَيِّ قَالَ: فَابْتُلِينَا فَاكْتَوَيْنَا فَمَا أَفْلَحْنَا وَلاَ أَنْجَحْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: نُهِينَا عَنِ الكَيِّ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری کرد لە خۆ داخکردن بە مەبەستی چارەسەری، عیمران فەرمووی: بەڵام ئێمە خۆمان داخ دەکرد، نە سەرکەوتو دەبووین نە ڕزگاریشمان دەبوو واتە سودی نەبوو بۆمان.

## دەربارەی روخسەتی خۆ داخکردن بە مەبەستی چارەسەری

١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

٢٠٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَوَى أَسْعَدَ بْنَ زُرَارَةَ مِنَ الشَّوْكَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أُبَيٍّ، وَجَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دەستی خۆی ئەسعەدی کوڕی زوراره‌ی

دەخکرد بە مەبەستی چارەسەری نەخۆشی (شَوْكَة).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڵەشاخ

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْحِجَامَةِ

٢٠٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ القُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، وَجَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْتَجِمُ فِي الأَخْدَعَيْنِ وَالكَاهِلِ، وَكَانَ يَحْتَجِمُ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَمَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسلم لـە دوو دەمـاری ئـەملاولای ملی و ناوشانی کەڵەشاخی دەکـرد، لـە حەڤـدەو نـۆزدەو بیسـت و یـەکی مـانگی عەرەبی دا کەڵەشاخی دەکرد.

٢٠٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بُدَيْلٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هُوَ ابْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: حَدَّثَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ أَنَّهُ لَمْ يَمُرَّ عَلَى مَلَإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ إِلاَّ أَمَرُوهُ أَنْ مُرْ أُمَّتَكَ بِالحِجَامَةِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی شەوڕەوی خۆی کرد کە چوو بۆ ئاسمان، کاتێ بەلای هەر کۆمەڵە مەلائیکەیەکدا تێ دەپەڕی فەرمانیان پێ دەکـرد فـەرمان

بکات بە ئومەتەکەی کەڵەشاخ بکەن.

٢٠٥٣ - (**ضعيف الإسناد**) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ، يَقُولُ: كَانَ لِابْنِ عَبَّاسٍ، غِلْمَةٌ ثَلاَثَةٌ حَجَّامُونَ فَكَانَ اثْنَانِ مِنْهُمْ يُغِلاَّنِ عَلَيْهِ وَعَلَى أَهْلِهِ، وَوَاحِدٌ يَحْجُمُهُ وَيَحْجُمُ أَهْلَهُ.

واتە: لە عیکریمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ سێ غولامی هەبوو کەڵەشاخیان دەکرد، دوانیان داهاتی کەڵەشاخ کردنەکەیان دەدا بە خۆی و بە خانەوادەکەی، یەکێکیان کەڵەشاخی دەکرد بۆ ئیبنو عەباس خۆی و خانەوادەکەی.

(**ضعيف**) قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نِعْمَ العَبْدُ الحَجَّامُ، يُذْهِبُ الدَّمَ، وَيُخِفُّ الصُّلْبَ، وَيَجْلُو عَنِ البَصَرِ.

ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین بەندە ئەو بەندەیە کەڵەشاخ دەکات بۆ خەڵك، خوێنی لەبەر دەڕوات، پشتی سوك دەکات، چاو پاك دەکاتەوەو بەهێزی دەکات).

(**صحيح**) وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ عُرِجَ بِهِ مَا مَرَّ عَلَى مَلَإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ إِلاَّ قَالُوا: عَلَيْكَ بِالحِجَامَةِ.

فەرمووی: ئەو شەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم باسی شەوڕەوی پێ کرا، کاتێ بەلای هەر کۆمەڵە مەلائیکەیەکدا تێ دەپەڕی فەرمانیان پێیان دەفەرموو: ئاگاداربە پابەند بە کەڵەشاخەوە.

(**صحيح**) وَقَالَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَحْتَجِمُونَ فِيهِ يَوْمَ سَبْعَ عَشْرَةَ وَيَوْمَ تِسْعَ عَشْرَةَ وَيَوْمَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ وَقَالَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ السَّعُوطُ وَاللَّدُودُ وَالحِجَامَةُ وَالمشِيُّ.

هەروەها فەرموویەتی: (چاکترین ڕۆژێ کەڵەشاخی تێدا بکەن ڕۆژی حەڤدەو

نۆزدەو بیست و یەکی مانگی عەرەبییە، چاکترین شتێ کە خۆتانی پێ چارەسەر بکەن: دەرمان تکاندنە لوت و دەرمان کردنە لایەکی دەمی نەخۆش و خواردنیەتی لەلایەن نەخۆشەوە و کەڵەشاخ و دەرمانێ کە نەخۆش رەوان بکات و بچێ بۆ سەر ئاو).

(**صحيح دون قوله**: (لَدَّهُ العَبَّاسُ)، **بل هو منكر، لمخالفة لقوله في حديث عائشة نحوه بلفظ: غير العباس، فإنه لم يشهدكم**) وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَدَّهُ العَبَّاسُ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ لَدَّنِي؟ فَكُلُّهُمْ أَمْسَكُوا، فَقَالَ: لاَ يَبْقَى أَحَدٌ مِمَّنْ فِي البَيْتِ إِلاَّ لُدَّ غَيْرَ عَمِّهِ العَبَّاسِ قَالَ عَبْدٌ: قَالَ النَّضْرُ: اللَّدُودُ: الوَجُورُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبَّادِ بْنِ مَنْصُورٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەس دەرمانی کردە دەممەوە با هەموویان بێدەنگ بن)، فەرمووی: هەرکەس لەو ماڵەدا بوو دەرمانیان کردە لایەکی دەمیەوەو خواردیەوە جگە لە مامی عەباس رەزای خوای لێ بێ.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی چارەسەری بە خەنە**

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّدَاوِي بِالحِنَّاءِ

٢٠٥٤ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ خَالِدٍ الخَيَّاطُ، قَالَ: حَدَّثَنَا فَائِدٌ، مَوْلًى لآلِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ جَدَّتِهِ سَلْمَى، وَكَانَتْ تَخْدُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: مَا كَانَ يَكُونُ بِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرْحَةٌ وَلاَ نَكْبَةٌ إِلاَّ أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَضَعَ عَلَيْهَا الحِنَّاءَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ فَائِدٍ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ فَائِدٍ،

وَقَالَ: عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَدَّتِهِ سَلْمَى، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَلِيٍّ أَصَحُّ، وَيُقَالُ: سُلْمَى. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، عَنْ فَائِدٍ، مَوْلَى عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ مَوْلاَهُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَدَّتِهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَه بمعناه.

واتە: لە عەلی کوڕی (عبيد الله)وە، لە نەنکیەوە سەلما کە خزمەتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەر شوێنێکی بە شمشێر یان بە چەقۆ یا هەر شتێکی لەو شێوە بریندار ببوایە فەرمانی پێ دەکردم خەنەی بۆ تێ بگرم، هەروەها هەر شوێنێکی بە بەرد بریندار ببوایە یان دڕکی پێدا بچوایە فەرمانی پێ دەکردم خەنەی بۆ تێ بگرم.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خراپی نوشتەکردن

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الرُّقْيَةِ

٢٠٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَقَّارِ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اكْتَوَى أَوْ اسْتَرْقَى فَقَدْ بَرِئَ مِنَ التَّوَكُّلِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خۆی داخ بکات بەمەبەستی چارەسەری و نوشتە بکات ئەوە پشتی بە خوا نەبەستوە و تەوەکولی لەدەستداوە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی روخسەت لەمەدا

### ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ

٢٠٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الخُزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الحُمَةِ وَالْعَيْنِ وَالنَّمْلَةِ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، وَأَبُو نُعَيْمٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الحُمَةِ وَالنَّمْلَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ: وَهَذَا عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ سُفْيَانَ. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَجَابِرٍ، وَعَائِشَةَ، وَطَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ، وَعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، وَأَبِي خُزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەی داوە بە نوشتەکردن بۆ چارەسەری ژەهری مار و دوپشك و جرجانەوەری ژەهردار و کەسێ بە چاوەوە بووبێ یا کەسێ برین لەلاتەنیشتی دەرهاتبێ.

٢٠٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ. وَرَوَى شُعْبَةُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمِثْلِهِ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوشتەکردن دروست نیە

مەگەر بۆ چارەسەری کەسێ بە چاوەوە بووبێ، یان بۆ چارەسەری ژەهری مار و دوپشك و جرِوجانەوەری ژەهردار).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی نوشتەکردن بە (معوذتین)**

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّقْيَةِ بِالمعَوِّذَتَيْنِ

٢٠٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُونُسَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ الْمُزَنِيُّ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ مِنَ الجَانِّ وَعَيْنِ الإِنْسَانِ حَتَّى نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنای دەگرت بە خوا لە شەیاتینی جنۆکە و چاوی پیس دەیفەرموو: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیاتینی جنۆکە و چاوی پیس، هەتا ئەم دوو سورەتە دابەزین: **(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ)**. سورة الفلق: ١ ، و **(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)**. سورة الناس: ١. ئیتر لەپاش ئەوە هەر ئەو دوو سورەتەی دەخوێند و وازی لە دوعاکانی تر هێنا لەو بارەوە.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی چاوەزار**

١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّقْيَةِ مِنَ العَيْنِ

٢٠٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عُرْوَةَ وَهُوَ ابْنُ عَامِرٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ الزُّرَقِيِّ، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيْسٍ قَالَتْ: يَا

رَسُولَ اللهِ، إِنَّ وَلَدَ جَعْفَرٍ تُسْرِعُ إِلَيْهِمُ العَيْنُ أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ القَدَرَ لَسَبَقَتْهُ العَيْنُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلَّالُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ بِهَذَا.

واتە: لە عوبەیدی كوڕی ریفاعەی زورەقیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە ئەسمائی كچی عومەیس فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! منداڵەكانی جەعفەر بەرچاون و زوو زوو دەبن بە چاوەوە، ئایا نوشتەیان بۆ بكەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر شتێ پێش قەدەر بكەوتایە ئەوا چاوی پیس پێشی دەكەوت).

١٨ - بَابٌ

٢٠٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، وَيَعْلَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الحَسَنَ وَالحُسَيْنَ يَقُولُ: أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ، وَيَقُولُ: هَكَذَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يُعَوِّذُ إِسْحَاقَ وَإِسْمَاعِيلَ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلَّالُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعای پەناگرتنی بۆ حەسەن و حوسەین دەكردوو دەیفەرموو: (پەناتان پێ دەگرم بە وشە تەواوەكانی خوای گەورە، لەشەڕ و خراپەی شەیتان و جانەوەران كە ژەهریان هەبێ و، لەهەموو چاوێكی پیس).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاوی پیس هەقە

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ العَيْنَ حَقٌّ وَالغَسْلُ لَهَا

٢٠٦١ - **(ضعيف لكن قوله : (العين حق) صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ أَبُو غَسَّانَ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي حَيَّةُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ شَيْءَ فِي الهَامِ، وَالعَيْنُ حَقٌّ.

واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ( (هام) هیچی تێدا نیە، بەڵام چاوی پیس هەق و راستە).

٢٠٦٢ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ بْنِ خِرَاشٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِسْحَاقَ الحَضْرَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ القَدَرَ لَسَبَقَتْهُ العَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَحَدِيثُ حَيَّةَ بْنِ حَابِسٍ حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَرَوَى شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ حَيَّةَ بْنِ حَابِسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، وَحَرْبُ بْنُ شَدَّادٍ، لاَ يَذْكُرَانِ فِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر شتێ پێش قەدەر بکەوتایە ئەوا چاوی پیس پێشی دەکەوت، ئەگەر کەسێ بوو بە چاوتانەوە داوایان لێ کردن خۆتان بشۆن ئەوە خۆتان بشۆن).

## دەربارەی کرێ وەرگرتن لەسەر دوعاو نوشتەکردن

٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الأَجْرِ عَلَى التَّعْوِيذِ

٢٠٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ فَنَزَلْنَا بِقَوْمٍ، فَسَأَلْنَاهُمُ القِرَى فَلَمْ يَقْرُونَا، فَلُدِغَ سَيِّدُهُمْ فَأَتَوْنَا فَقَالُوا: هَلْ فِيكُمْ مَنْ يَرْقِي مِنَ العَقْرَبِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ أَنَا، وَلَكِنْ لاَ أَرْقِيهِ حَتَّى تُعْطُونَا غَنَمًا، قَالُوا: فَإِنَّا نُعْطِيكُمْ ثَلاَثِينَ شَاةً، فَقَبِلْنَا فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ: الحَمْدُ لِلَّهِ سَبْعَ مَرَّاتٍ، فَبَرَأَ وَقَبَضْنَا الغَنَمَ، قَالَ: فَعَرَضَ فِي أَنْفُسِنَا مِنْهَا شَيْءٌ فَقُلْنَا: لاَ تَعْجَلُوا حَتَّى تَأْتُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَيْهِ ذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي صَنَعْتُ، قَالَ: وَمَا عَلِمْتَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ اقْبِضُوا الغَنَمَ وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو نَضْرَةَ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ بْنُ مَالِكِ بْنِ قُطْعَةَ وَرَخَّصَ الشَّافِعِيُّ لِلْمُعَلِّمِ أَنْ يَأْخُذَ عَلَى تَعْلِيمِ القُرْآنِ أَجْرًا، وَيَرَى لَهُ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى ذَلِكَ، وَاحْتَجَّ بِهَذَا الحَدِيثِ وَرَوَى شُعْبَةُ، وَأَبُو عَوَانَةَ، وَهِشَام، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەگەڵ لەشکرێکی سی کەسیدا ناردینی بۆ شوێنێ، لای هۆزێك لاماندا داوامان لێ کردن ببینە میوانیان بەڵام هۆزەکە میواندارییان نەکردین، دووپشکێك دای بەگەورەکەیانەوە، هەموو هەوڵێکیاندا بۆ ئەوەی ئازاری نەمێنێ و چاك بێتەوە بەڵام سوودی نەبوو، بۆیە هاتن بۆ لامان وتیان: ئایا کەسێکتان تێدا نیە نوشتەیەکی بۆ بکات بەڵکو شیفای بۆ بێت و چاك بێتەوە؟ وتم: بەڵێ، من، بەڵام بۆی ناکەم هەتا مەڕێکمان نەدەنێ

بۆ خۆمان لە جیاتیدا، وتیان: سی مەڕتان دەدەینێ، ئێمەش قبوڵمان کرد، حەوت جار سورەتی فاتیحەم بەسەردا خوێند،کە تا ئەو کاتەش ئازارێکی زۆر زۆری هەبوو، هەر وەك وشترێکی بەسراوە بەرەڵای بکەی ئاوا رزگاری بوو ئازاری نەماو چاك بوویەوە، مەڕەکانیان داینێ و بردمان بۆ خۆمان، هاوەڵان لە نێوان خۆیاندا شتێکیان بۆ دروست بوو وتیان: بڵێی حەرام نەبێت، پەلەمەکەن لە گۆشتەکەیان ناخۆین هەتا نەچین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و پرسیاری لێ نەکەین، کاتێك کە گەشتینەوە مەدینە هەواڵەکەمان دا بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چۆنتان زانی ئەوە بۆ دوعاو نوشتە دەبێت؟ مەڕەکان ببەن بۆ خۆتان بەراستی پێکاتان بەشی منیش بدەن).

٢٠٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْمُتَوَكِّلِ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرُّوا بِحَيٍّ مِنَ العَرَبِ فَلَمْ يَقْرُوهُمْ وَلَمْ يُضَيِّفُوهُمْ، فَاشْتَكَى سَيِّدُهُمْ فَأَتَوْنَا فَقَالُوا: هَلْ عِنْدَكُمْ دَوَاءٌ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، وَلَكِنْ لَمْ تَقْرُونَا وَلَمْ تُضَيِّفُونَا، فَلاَ نَفْعَلُ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً، فَجَعَلُوا عَلَى ذَلِكَ قَطِيعًا مِنَ الغَنَمِ، قَالَ: فَجَعَلَ رَجُلٌ مِنَّا يَقْرَأُ عَلَيْهِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ فَبَرَأَ، فَلَمَّا أَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، قَالَ: وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟، وَلَمْ يَذْكُرْ نَهْيًا مِنْهُ، وَقَالَ: كُلُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ الأَعْمَشِ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ، وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي وَحْشِيَّةَ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَجَعْفَرُ بْنُ إِيَاسٍ هُوَ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي وَحْشِيَّةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە هەندێك لە هاوەڵانی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دایان بەلای هۆزێكی عەرەبدا، هۆزەكە میواندارییان نەكردن، گەورەكەیان نەخۆشكەوت، هاتن بۆ لامان وتیان: دەرمانی چارەسەری نەخۆشتان لایە؟ وتمان: بەڵێ، بەڵام ئێوە میوانداریتان نەكردین هەتا كۆمەڵێ مەڕمان نەدەنێ ئەو كارە ناكەین، ئەوانیش كۆمەڵێ مەڕیان دانێ، وتی: یەكێكمان سورەتی فاتیحەی خوێند بەسەریا چاك بوویەوە، كاتێ كە هاتینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵەكەمان پێ راگەیاند، فەرمووی: (چۆنتان زانی ئەوە بۆ دوعاو نوشتە دەبێت؟). نەهی لێ نەكردن بەڵكو فەرمووی: (لە گۆشتەكەیان بخۆن و سەهمێكیش بۆ من بهێنن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نوشتە و دەرمان

٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّقَى وَالأَدْوِيَةِ

٢٠٦٥ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رُقًى نَسْتَرْقِيهَا وَدَوَاءً نَتَدَاوَى بِهِ وَتُقَاةً نَتَّقِيهَا، هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئًا؟ قَالَ: هِيَ مِنْ قَدَرِ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ كِلْتَا الرِّوَايَتَيْنِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَنِ ابْنِ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، وَقَدْ رَوَى غَيْرُ ابْنِ عُيَيْنَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ وَهَذَا أَصَحُّ وَلاَ نَعْرِفُ لأَبِي خِزَامَةَ عَنْ أَبِيهِ غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو حیزامەوە، لە باوكیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە

فەرموویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەم نوشتەو دەرمانانەی کە بەکاریان دەهێنین بۆ چارەسەری هیچ لە قەدەری خوا دەگێڕێتەوە؟ فەرمووی: (ئەویش هەر قەدەری خوایە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی دومەڵان و خورمای عەجوە

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَمْأَةِ وَالعَجْوَةِ

٢٠٦٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْهَمْدَانِيُّ وَهُوَ ابْنُ أَبِي السَّفَرِ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: العَجْوَةُ مِنَ الجَنَّةِ وَفِيهَا شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ، وَالكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَهُوَ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ عَامِرٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە، شیفایە بۆ هەموو ژەهرێ، دومەڵان وێنەی ئەو گەزۆیەی کە بۆ بەنی ئیسرائیل دەباری ئاوەکەی دەرمانە بۆ دەردی چاو).

٢٠٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عُبَيْدٍ الطَّنَافِسِيُّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ (ح) وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ســەعیدی كــوڕی زەیــدەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دومـەڵان وێنـەی ئەو گەزۆیەی كە بۆ بەنی ئیسرائیل دەباری ئاوەكەی دەرمانە بۆ دەردی چاو).

٢٠٦٨ - (صحيح بما قبله ) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا: الكَمْأَةُ جُدَرِيُّ الأَرْضِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ، وَالعَجْوَةُ مِنَ الجَنَّةِ وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە هەندێ لە هـاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتیان: دومەڵان دركـەو مێكوتـەی زەویـیـە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دومەڵان وێنەی ئەو گەزۆیەی كـە بۆ بەنی ئیسرائیل دەباری ئاوەكەی دەرمانە بـۆ دەردی چـاو، خورمـای عـەجوە لـە بەهەشتەوەیە، شیفایە بۆ هەموو ژەهرێ).

٢٠٦٩ - (ضعيف الإسناد مع وقفه) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حُدِّثْتُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: أَخَذْتُ ثَلَاثَةَ أَكْمُؤٍ أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا فَعَصَرْتُهُنَّ فَجَعَلْتُ مَاءَهُنَّ فِي قَارُورَةٍ فَكَحَلْتُ بِهِ جَارِيَةً لِي فَبَرَأَتْ.

ئـەبو هـورەیرە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەفـەرمووێت: سـێ یـان پێـنج یـا حـەوت دومەڵانم گوشی ئاوەكەیم كردە ناو شوشەیەكەوە چاوی كەنیزەكەمم پێ ڕشـت چـاك بوویەوە.

٢٠٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حُدِّثْتُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: الشُّونِيزُ دَوَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ قَالَ قَتَادَةُ:

يَأْخُذُ كُلَّ يَوْمٍ إِحْدَى وَعِشْرِينَ حَبَّةً فَيَجْعَلُهُنَّ فِي خِرْقَةٍ فَيَنْقَعُهُ فَيَسْتَعِطُ بِهِ كُلَّ يَوْمٍ فِي مَنْخَرِهِ الأَيْمَنِ قَطْرَتَيْنِ وَفِي الأَيْسَرِ قَطْرَةً، وَالثَّانِي فِي الأَيْسَرِ قَطْرَتَيْنِ وَفِي الأَيْمَنِ قَطْرَةً، وَالثَّالِثُ فِي الأَيْمَنِ قَطْرَتَيْنِ وَفِي الأَيْسَرِ قَطْرَةً.

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموویێت: ڕەشکە دەرمانی هەموو دەردێکە جگە لە مردن، قەتادە فەرمووی: هەموو ڕۆژێ بیست و یەك دەنك ڕەشکەی دەکردە ناو پارچە پەڕۆیەك و دیخستە ناو ئاوەوە، جا لە ئاوەکەی هەموو ڕۆژێ دوو قەترەی دەتکاندە لای ڕاستی لوتیەوە و قەترەیەکی دەتکاندە لای چەپی لوتیەوە، بۆ ڕۆژی دووەم دوو قەترەی دەتکاندە لای چەپی لوتیەوە و یەك قەترەی دەتکاندە لای ڕاستی لوتیەوە، بۆ ڕۆژی سێیەم دوو قەترەی دەتکاندە لای ڕاستی لوتیەوە و یەك قەترەی دەتکاندە لای چەپی لوتیەوە.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی کرێی کاهین

### ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَجْرِ الكَاهِنِ

٢٠٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ثَمَنِ الكَلْبِ، وَمَهْرِ البَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الكَاهِنِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە کرێ و نرخ و بەهای سەگ و، مارەیی ئافرەتی زیناکار و، کولەنانی فاڵ گرتنەوە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خراپی نوشتە هەڵواسین

٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّعْلِيقِ

٢٠٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَدُّوَيْهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عِيسَى، أَخِيهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ أَبِي مَعْبَدِ الجُهَنِيِّ، أَعُودُهُ وَبِهِ حُمْرَةٌ، فَقُلْنَا: أَلاَ تُعَلِّقُ شَيْئًا؟ قَالَ: الْمَوْتُ أَقْرَبُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَعَلَّقَ شَيْئًا وُكِلَ إِلَيْهِ: وَحَدِيثُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُكَيْمٍ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُكَيْمٍ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: كَتَبَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ.

واتە: لە عیساوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: (عبد الله)ی كوڕی عوكەیم ئەبو مەعبەدی جوهەنی سوركەی بوو چوم بۆ سەردانی، وتمان: ئەوە بۆچی نوشتەیە یان یان موورویە هەڵناواسی بەخۆتدا، فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوا مردن باشترە لەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت: (هەركەس شتێ هەڵواسێ بەخۆیدا دەدرێتە دەست ئەو شتە و بەو دەسپێردرێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دابەزاندنی تا بە ئاو

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَبْرِيدِ الحُمَّى بِالمَاءِ

٢٠٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:

الحُمَّى فَوْرٌ مِنَ النَّارِ فَأَبْرِدُوهَا بِالماءِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَامْرَأَةِ الزُّبَيْرِ، وَعَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تا لە تینی گەرمای ئاگری دۆزەخەوەیە بە ئاو فێنکی بکەنەوە و دایبەزێنن).

٢٠٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَأَبْرِدُوهَا بِالماءِ. حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَفِي حَدِيثِ أَسْمَاءَ كَلَامٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا وَكِلَا الحَدِيثَيْنِ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (تا لە هاڵاوی ئاگری دۆزەخەوەیە بە ئاو فێنکی بکەنەوە و دایبەزێنن).

٢٦ - باب

٢٠٧٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَبِيبَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الحُمَّى وَمِنَ الأَوْجَاعِ كُلِّهَا أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللهِ الكَبِيرِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ العَظِيمِ مِنْ شَرِّ كُلِّ عِرْقٍ نَعَّارٍ، وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّارِ.

هَـذَا حَـدِيثٌ غَرِيـبٌ، لاَ نَعْرِفُـهُ إِلاَّ مِـنْ حَـدِيثِ إِبْـرَاهِيمَ بْـنِ إِسْمَاعِيـلَ بْـنِ أَبِي حَبِيبَـةَ وَإِبْرَاهِيمُ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ وَيُرْوَى: عِرْقٌ يَعَّارٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فێری دەکردن لەکاتی تاو هەر ئازارێکدا بڵێن: بە ناوی خوای گەورە، پەنا دەگرم بە خوای باڵا و شکۆمەند لە شەڕ و خراپەی هەموو فیچقەیەکی خوێن بەربوون، وە لە شەڕ و خراپەی گەرمی ئاگر.

## دەربارەی جوتبوون لەگەڵ ئافرەتی شیردەری سك پڕ

### ٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الغِيلَةِ

٢٠٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ ابْنَةَ وَهْبٍ وَهِيَ جُدَامَةُ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: أَرَدْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الغِيَالِ فَإِذَا فَارِسُ وَالرُّومُ يَفْعَلُونَ وَلاَ يَقْتُلُونَ أَوْلاَدَهُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ مَالِكٌ: وَالغِيَالُ أَنْ يَطَأَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ تُرْضِعُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کە جودامەی کچی وەهەب فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی ویستم ڕێگری بکەم لە جوتبوون لەگەڵ ئافرەتی شیردەری سك پڕ، بەڵام بۆیان ڕونکردمەوە کە فارس و ڕۆم ئەو کارە دەکەن و منداڵەکانیشیان ناکوژن و هیچ زیانیان پێ ناگات).

٢٠٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ أَحْمَدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ الأَسَدِيَّةِ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الغِيلَةِ حَتَّى ذَكَرْتُ أَنَّ الرُّومَ وَفَارِسَ يَصْنَعُونَ ذَلِكَ فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ قَالَ مَالِكٌ: وَالغِيلَةُ أَنْ يَمَسَّ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ تُرْضِعُ. قَالَ عِيسَى بْنُ أَحْمَدَ: وَحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عِيسَى قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جودامەی ئەسەدییەوە دەگێڕنەوە، کە بۆ خۆی وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی نیازم کرد ڕێگری بکەم لە لە جوتبوون لەگەڵ ئافرەتی شیردەری سك پڕ، هەتا بۆیان ڕونکردمەوە کە فارس و ڕۆم ئەو کارە دەکەن و منداڵەکانیشیان هیچ زیانیان پێ ناگات). مالیك وتی: (الْغَيْلَة) بریتیە لەوەی پیاوێ لەگەڵ ژنەکەی جوت ببێ لەکاتێکدا کە ژنەکەی شیر بدات.

## دەربارەی دەرمانی نەخۆشی (ذَاتِ الجَنْبِ)

## ٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دَوَاءِ ذَاتِ الجَنْبِ

٢٠٧٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَنْعَتُ الزَّيْتَ وَالوَرْسَ مِنْ ذَاتِ الجَنْبِ قَالَ قَتَادَةُ: وَيُلَدُّ مِنَ الجَانِبِ الَّذِي يَشْتَكِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو عَبْدِ اللهِ اسْمُهُ مَيْمُونٌ هُوَ شَيْخٌ بَصْرِيٌّ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەسفی زەیت و وەرسی کرد کە چەند باشن بۆ چارەسەری نەخۆشی (ذَاتِ الجَنْبِ)هەوکردنی پەردەی سیەکان - وەرس ڕوەکێکی

زەردە - ، قەتادە فەرمووی: كردیە ناو دەمیەوە ئەو لایەی كە ئازاری هەبوو.

٢٠٧٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا رَجَاءُ بْنُ مُحَمَّدٍ العُذْرِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي رَزِينٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَيْمُونٌ أَبُو عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَتَدَاوَى مِنْ ذَاتِ الجَنْبِ بِالقُسْطِ البَحْرِيِّ وَالزَّيْتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مَيْمُونٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ وَقَدْ رَوَى عَنْ مَيْمُونٍ غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا الحَدِيثَ. وَذَاتُ الجَنْبِ: يَعْنِي السِّلَّ.

واتە: زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ كردین بە (القُسْطِ البَحْرِيِّ) كە ڕوەكێكی دەریایی بۆن خۆشە لەگەڵ زەیت بەكاریانبهێنین بۆ چارەسەری نەخۆشی (ذَاتِ الجَنْبِ)هەوكردنی پەردەی سیەكان.

٢٩ - بَاب

٢٠٨٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ خُصَيْفَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ السُّلَمِيِّ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ أَخْبَرَهُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ أَنَّهُ قَالَ: أَتَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِي وَجَعٌ قَدْ كَادَ يُهْلِكُنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: امْسَحْ بِيَمِينِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ وَقُلْ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ قَالَ: فَفَعَلْتُ، فَأَذْهَبَ اللَّهُ مَا كَانَ بِي، فَلَمْ أَزَلْ آمُرُ بِهِ أَهْلِي وَغَيْرَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عثمان)ی كوڕی ئەبی عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئازارێكم هەبوو خەریك بوو لەناوم بەرێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردانم فەرمووی: (حەوت جار دەستی ڕاستت بهێنە بە

شوێنی ئازارەکەدا و بڵێ: (أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ). واتە: پەنادەگرم بە دەسەڵاتی خواو بە توانایی ئەو لەزیانی ئەو ئازارەی کە هەستی پێ دەکەم و مەترسیم لێی هەیە. (عثمان) فەرمووی: منیش ئەو کارەم کرد خوای گەورە شیفای دام و ئازاراکەم نەما، بۆیە بەردەوام فەرمان دەکەم بە خانەوادە و کەسوکارەکەم بیخوێنن لەکاتێکدا کە نەخۆش بن.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سینەمەکی

٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّنَا

٢٠٨١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُتْبَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَلَهَا: بِمَ تَسْتَمْشِينَ؟ قَالَتْ: بِالشُّبْرُمِ قَالَ: حَارٌّ جَارٌّ قَالَتْ: ثُمَّ اسْتَمْشَيْتُ بِالسَّنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ أَنَّ شَيْئًا كَانَ فِيهِ شِفَاءٌ مِنَ الْمَوْتِ لَكَانَ فِي السَّنَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەسمائی کچی عومەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێ کردوو فەرمووی: (بەچی دەرمانێ خۆت ڕەوان دەکەی؟). وتی: بە (شبرم) وەك نۆك وایە دەکوڵێنرێت و ئاوەکەی دەخورێتەوە، فەرمووی: (پلەی گەرمی جەستە بەرزدەکاتەوە و ئادەمیزاد زۆر ڕەوان دەکات، ئەسما وتی: لەپاشدا بە (سنا)سینەمەکی خۆم ڕەوان دەکرد، فەرمووی: (ئەگەر شتێ شیفا بوایە بۆ مردن ئەوا ئەو شتە (سنا)سینەمەکی دەبوو).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چارەسەری بە هەنگوین

٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّدَاوِي بِالعَسَلِ

٢٠٨٢ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً فَسَقَاهُ ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ سَقَيْتُهُ عَسَلاً فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلاَقًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اسْقِهِ عَسَلاً فَسَقَاهُ ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ سَقَيْتُهُ عَسَلاً فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلاَقًا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً فَسَقَاهُ عَسَلاً فَبَرَأَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، وتی: براکەم سکی دەچێ و ڕەوانە، فەرمووی: (هەنگوینی بدەرێ). ئەویش چوو هەنگوینی دایە و خواردی، لەپاشدا هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، هەنگوینم دایە و خواردی بەڵام خراپتر بوو، فەرمووی: (بڕۆ هەنگوینی بدەرێ). ئەویش چوو هەنگوینی دایە و خواردی، لەپاشدا هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، هەنگوینم دایە و خواردی بەڵام خراپتر بوو، لەپاشدا هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، هەنگوینم دایە و خواردی بەڵام خراپتر بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (خوای گەورە ڕاستی فەرموو بەڵام سکی براکەت درۆ دەکات بڕۆ هەنگوینی بدەرێ). ئەویش چوو هەنگوینی دایە و خواردی چاك بوویەوە.

٣٢ - بَابٌ

٢٠٨٣ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَزِيدَ أَبِي خَالِدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ الْمِنْهَالَ بْنَ عَمْرٍو يُحَدِّثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَعُودُ مَرِيضًا لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَيَقُولُ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ إِلاَّ عُوفِيَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كەسێ بچێ بۆ سەردانی نەخۆشێ كە ئەجەلی نەهاتبێ حەوت جار بڵێ: (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ، رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، أَنْ يَشْفِيَكَ). داوا لە خوای گەورە دەكەم، كە خاوەنی عەرشی گەورەو مەزنە دەرمانی دەردت بكات و شیفات بدات، ئیلا خوای گەورە شیفای دەدات و چاكی دەكاتەوە لەو نەخۆشیە).

٣٣ - بَابٌ

٢٠٨٤ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الأَشْقَرُ الرِّبَاطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْزُوقٌ أَبُو عَبْدِ اللهِ الشَّامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ثَوْبَانُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمُ الحُمَّى فَإِنَّ الحُمَّى قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ فَلْيُطْفِئْهَا عَنْهُ بِالمَاءِ فَلْيَسْتَنْقِعْ نَهْرًا جَارِيًا لِيَسْتَقْبِلَ جَرْيَةَ الْمَاءِ فَيَقُولُ: بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ، وَصَدِّقْ رَسُولَكَ، بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ فَلْيَغْتَمِسْ فِيهِ ثَلاَثَ غَمَسَاتٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي ثَلاَثٍ فَخَمْسٍ، وَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي خَمْسٍ فَسَبْعٌ، فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي سَبْعٍ فَتِسْعٍ فَإِنَّهَا لاَ تَكَادُ تُجَاوِزُ تِسْعًا بِإِذْنِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە تووشی تا بوو بێگومان تاش پارچەیەکە لە ئاگری دۆزەخ بە ئاو بیکوژێننەوە، خۆی بکات بە ناو ئاوی روبارێکدا و خۆی بشوات و بڵێ: بەناوی خوا، خودایە شیفای بەندەکەت بدە، راستگۆیی پێغەمبەرەکەت بسەلمێنە، لەدوای نوێژی بەیانی پێش خۆرهەڵاتن، سێ جار خۆی بکات بە ناو ئاوی روبارێکدا و خۆی بشوات بۆ ماوەی سێ رۆژ، ئەگەر چاك نەبوەوە تا پێنج رۆژ، ئەگەر هەر چاك نەبوەوە تا حەوت رۆژ، ئەگەر هەر چاك نەبوەوە تا نۆ رۆژ، بە ویستی خوا لە نۆ رۆژ تێپەڕ ناکات و چاك دەبێتەوە.

## دەربارەی چارەسەری بە خۆڵەمێش

٣٤ - بَابُ التَّدَاوِي بِالرَّمَادِ

٢٠٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، قَالَ: سُئِلَ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ وَأَنَا أَسْمَعُ، بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جَرْحُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، كَانَ عَلِيٌّ يَأْتِي بِالمَاءِ فِي تُرْسِهِ وَفَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْهُ الدَّمَ، وَأُحْرِقَ لَهُ حَصِيرٌ فَحُشِيَ بِهِ جُرْحَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو حازمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سەبارەت بە چی چارەسەری برینەکەی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم کرد، بۆ خۆم گوێم لێ بوو لە سەهلی کوڕی سەعدیان پرسی؟ فەرمووی: کەس نەماوە وەك من ئاگاداری بێ و بیزانێ، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ لە مەتاڵەکەی خۆیدا ئاوی هێنا — مەتاڵ لەپێست دروست دەکرا وەك قەڵغان بەکار دەهێنرا بەرامبەر بە تیر - (فاطمة)ش رەزای خوای لێ بێ خوێنەکەی پێ شت، پارچە حەسیرێکیان هێنا سوتاندیان و خۆڵەمێشەکەیان کردە ناو برینەکەیەوە.

٢٠٨٦ - (موضوع) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُوقَرِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا مَثَلُ الْمَرِيضِ إِذَا بَرَأَ وَصَحَّ كَالبَرْدَةِ تَقَعُ مِنَ السَّمَاءِ فِي صَفَائِهَا وَلَوْنِهَا»[(١)].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وێنەی نەخۆشێ کاتێ شیفای بۆ دێ و چاك دەبێتەوە بۆ سافی و ڕونی و ڕەنگەکەی وەك لە تەرزەوایە کاتێ کە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە).

٣٥ - بَابٌ

٢٠٨٧ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ خَالِدٍ السَّكُونِيُّ، عَنْ مُوسَى بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى الْمَرِيضِ فَنَفِّسُوا لَهُ فِي أَجَلِهِ فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا وَيُطَيِّبُ نَفْسَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ سەردانی نەخۆشتان کرد دڵی خۆش بکەن و باری شانی سوك بکەن - بڵێن: ئاسانە هیچ نیە (ان شاء الله) خوا شیفات دەدات و چاك دەبیتەوە و خوا تەمەن درێژت بکات وە

[(١)] قال بشار: هذا ليس من الترمذي، فلم يذكره المزي في "تحفة الأشراف"، ولا وجدناه في شيء من النسخ والشروح التي بين أيدينا، وهو حديث موضوع، ساقه السيوطي في "اللآلي المصنوعة" ٢/ ٣٩٩، ولم ينسبه للترمذي. انتهى. - وذكره الهيثمي في "مجمع الزوائد" ٢/ ٣٠٣، وقال: رواه البزار، والطبراني في "الأوسط".- ولايوجد في النسخة الخطية للكروخي.

هەروەها، ئەمەش هیچ لە قەدەری خوا ناگێڕێتەوە بەڵام دڵی پێی خۆش دەبێ).

٢٠٨٨ - حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ الأَشْعَرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَادَ رَجُلاً مِنْ وَعَكٍ كَانَ بِهِ فَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: هِيَ نَارِي أُسَلِّطُهَا عَلَى عَبْدِي الْمُذْنِبِ لِتَكُونَ حَظَّهُ مِنَ النَّارِ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی نەخۆشێکی کرد تایەکی زۆری لێ هاتبو جەستەی تێك شکابوو، فەرمووی: (موژدەت لێ بێ، بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت: ئەمە ئاگری منە زاڵی دەکەم بەسەر بەندە گوناهبارەکەمدا بۆ ئەوەی ئەوە بەشی بێ لە ئاگر).

٢٠٨٩ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: كَانُوا يَرْتَجُونَ الحُمَّى لَيْلَةً كَفَّارَةً لِمَا نَقَصَ مِنَ الذُّنُوبِ[2].

[1] قال بشار: هذا الحديث لم يذكره المزي في "تحفة الأشراف" ولا استدركه عليه المستدركون، ولاوجدناه في شيء من النسخ والشروح التي بين أيدينا، فهو ليس من الترمذي. - هذا الحديث لايوجد في النسخة الخطية للكروخي وقد ذكره الهيثمي في "المجمع" ٢/ ٢٩٨، وقال: رواه ابن ماجة باختصار، وفيه عبد الرحمن، وذكره البوصيري في "مصباح الزجاجة" ٤/ ٦١، ولم يذكر المزي لأبي صالح الأشعري رواية عند الترمذي، وإنما نص على ابن ماجة فقط.

[2] قال بشار: وهذا ليس من "جامع الترمذي" للأسباب التي ذكرناها في الذي قبله، والله أعلم.

واتە: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئومێدیان وابووە تای شەوێ ببێتە کەفارەتی گوناهەکانیان.

# باسەكانی میرات لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

# ٢٧ - أَبْوَابُ الْفَرَائِضِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## هەركەس ماڵی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوە بۆ میرتگرەكانیەتی

## ١ - بَابُ مَا جَاءَ مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ

٢٠٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأُمَوِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَنَسٍ، وَقَدْ رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَطْوَلَ مِنْ هَذَا وَأَتَمَّ مَعْنَى ضَيَاعًا: ضَائِعًا لَيْسَ لَهُ شَيْءٌ، فَأَنَا أَعُولُهُ وَأُنْفِقُ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی بمرێ و ماڵی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوە بۆ میرتگرەكانی، ئەگەر قەرزی لەسەر بوو یان خێزانی هەژار و بێ داڵدەی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوا خۆم قەرزەكەی بۆی دەبژێرم و ژیان و گوزەرانی خێزانە هەژارەكەشی لەسەر خۆمە).

## دەربارەی فێربوونی زانستی میرات

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ الفَرَائِضِ

٢٠٩١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ وَاصِلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ القَاسِمِ الأَسَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ دَلْهَمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَعَلَّمُوا القُرْآنَ وَالفَرَائِضَ وَعَلِّمُوا النَّاسَ فَإِنِّي مَقْبُوضٌ. هَذَا حَدِيثٌ فِيهِ اضْطِرَابٌ، وَرَوَى أَبُو أُسَامَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَوْفٍ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ جَابِرٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عَوْفٍ بِهَذَا نَحْوِهِ بِمَعْنَاهُ، وَمُحَمَّدُ بْنُ القَاسِمِ الأَسَدِيُّ قَدْ ضَعَّفَهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَغَيْرُهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قورئان و زانستی میرات فێربن و خەڵكیش فێر بكەن چونكە بێگومان خوای گەورە ڕۆحی من دەكێشێ و دەمرێنێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی كچان

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ البَنَاتِ

٢٠٩٢ - **(حسن)** حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي زَكَرِيَّا بْنُ عَدِيٍّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةُ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ بِابْنَتَيْهَا مِنْ سَعْدٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَاتَانِ ابْنَتَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، قُتِلَ أَبُوهُمَا مَعَكَ يَوْمَ أُحُدٍ شَهِيدًا، وَإِنَّ عَمَّهُمَا أَخَذَ مَالَهُمَا، فَلَمْ يَدَعْ لَهُمَا مَالاً وَلاَ تُنْكَحَانِ إِلاَّ وَلَهُمَا مَالٌ، قَالَ: يَقْضِي

اللَّهُ فِي ذَلِكَ فَنَزَلَتْ: آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى عَمِّهِمَا، فَقَالَ: أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ الثُّلُثَيْنِ، وَأَعْطِ أُمَّهُمَا الثُّمُنَ، وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، وَقَدْ رَوَاهُ شَرِيكٌ أَيْضًا، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ.

واتە: لە جابیری كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ژنەكەی سەعدی كوڕی ڕەبیع دوو كچی خۆی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەم دوو كچە كچی سەعدی كوڕی ڕەبیعن باوكیان لە غەزای ئوحوددا لەگەڵ تۆدا شەهید بوو، ئێستا مامەكەیان هەرچی ماڵیان هەیە بردویەتی بۆ خۆی، هیچی بۆ ئەمان نەهێشتۆتەوە، زۆرجار بەبێ ماڵ و دارایش كەس نایانخوازێت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (بۆ ئەم بابەتە خوای گەورە خۆی بڕیار دەدات). ئایەتی میرات دابەزی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ناردی بەدوای مامەكەیاندا، فەرمووی: (دوو سێیەكی ماڵەكە بدە بە دوو كچەكە، هەشت یەكیش بدەن بەدایكیان، هەرچی لەوان مایەوە بۆ تۆ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی كچی كوڕ لەگەڵ كچی پشت

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ ابْنَةِ الِابْنِ مَعَ ابْنَةِ الصُّلْبِ

٢٠٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ الأَوْدِيِّ، عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى، وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ فَسَأَلَهُمَا عَنِ الِابْنَةِ وَابْنَةِ الِابْنِ وَأُخْتٍ لأَبٍ وَأُمٍّ؟ فَقَالاَ: لِلِابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ مَا بَقِيَ، وَقَالاَ لَهُ: انْطَلِقْ إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَاسْأَلْهُ فَإِنَّهُ سَيُتَابِعُنَا، فَأَتَى عَبْدَ اللهِ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ وَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالاَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا،

وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَلَكِنِّي أَقْضِي فِيهِمَا كَمَا قَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلابْنَةِ الابْنِ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَلِلأُخْتِ مَا بَقِيَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو قَيْسٍ الأَوْدِيُّ اسْمُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ ثَرْوَانَ الكُوفِيُّ وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ.

واتە: لە هوزەیلی كوڕی شورەحبیلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆلای ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی كوڕی ڕەبیعە دەربارەی میراتی كچ و كچی كوڕ و خوشكی باوك و دایكی پرسیاری لێ كردن، وتیان: كچكەی نیوەی بۆ هەیە، خوشكەكەشی نیوەی بۆ هەیە — هیچیان دانەنا بۆ كچی كوڕ— بڕۆ بۆلای ئیبنو مەسعود ئەویش هەروەك ئێمە دەڵێ. پیاوەكە چو بۆلای ئیبنو مەسعود پرسیاری لێ كردو وەڵامەكەی ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی كوڕی ڕەبیعەی پێ ڕاگەیاند، وتی: بەڕاستی ئەگەر وابێت وتە من وەك ئێوە وەڵام بدەمەوە ئەوە دەبێت من ڕێگەم هەڵەكردبێ و سەرم لێ شێوابێ و لەڕیزی ئەو كەسانەدا نابم كە ڕێنموونیان وەرگرتووە، بەڵام بڕیار دەدەم بەو شێوەیەی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری لەسەرداوە، بۆ كچەكە نیوە هەیە، بۆ كچی كوڕەكەش شەش یەك هەیە كە تەواوكەری دوو بەش لە سێ بەش، هەرچیش مایەوە بۆ خوشكەكەیە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی برای دایك و باوكی

## ٥ – بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الإِخْوَةِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ

٢٠٩٤ – (حسن) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ: (مِنْ بَعْدِ

وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ) وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّةِ، وَإِنَّ أَعْيَانَ بَنِي الأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي العَلاَّتِ، الرَّجُلُ يَرِثُ أَخَاهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ دُونَ أَخِيهِ لأَبِيهِ، حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا زَكَرِيَّا بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمِثْلِهِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێوە ئەم ئایەتەتان خوێندۆتەوە: (مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ). سورة النساء : ١٢.
واتە: لەپاش وەیسیەتێك کە کردبێتتان یان دانەوەی قەرزێ — کە لەسەرتان بێ - . پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپێشدا بڕیاری لەسەر قەرزدانەوە دەدا لەپاشد بڕیاری لەسەر میرات دەدا، بێگومان براو خوشکی دایك و باوکی میرات دەبەن نەك ئەوانەی کە باوك و دایکیان جیاوازە، پیاو برای دایك و باوکی میراتی لێ دەگرێ نەك برای باوکی.

٢٠٩٥ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ أَعْيَانَ بَنِي الأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي العَلاَّتِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي الحَارِثِ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاریدا لەسەر ئەوەی کە براو خوشکی دایك و باوکی میرات دەبەن نەك ئەوانەی کە باوك و دایکیان جیاوازە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی کوڕان و کچان

٦ - بَابُ مِيرَاثِ البَنِينَ مَعَ البَنَاتِ

٢٠٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَعْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ فِي بَنِي سَلِمَةَ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَيْفَ أَقْسِمُ مَالِي بَيْنَ وَلَدِي؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا فَنَزَلَتْ: (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُهُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: نەخۆش بووم لای خزمەکانم هۆزی بەنی سەلیمە کەوتبووم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردانم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! چۆن ماڵ و سامانەکەم دابەش بکەم بەسەر منداڵەکانمدا؟ هیچ وەڵامی نەدامەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ). سورة النساء : ١١. واتە: خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکات دەربارەی میراتی ڕۆڵەکانتان بۆ نێرێك هەیە — لە میرات - بە وێنەی بەشی دوو مێ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی چەند خوشکێ

٧ - بَابُ مِيرَاثِ الأَخَوَاتِ

٢٠٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَقُولُ: مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي، فَوَجَدَنِي قَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَأَتَانِي وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ

وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ فَأَفَقْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي أَوْ كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي شَيْئًا، وَكَانَ لَهُ تِسْعُ أَخَوَاتٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ) الآيَةَ، قَالَ جَابِرٌ: فِيَّ نَزَلَتْ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بۆ خۆم گوێم لە جابیری کوڕی (عبد الله) ڕەزای خوای لێ بێ بووە دەیفەرموو: نەخۆش بووم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردانم بینی لەهۆش خۆم دەچم، بیپێشەوایان ئەبو بەکر و عومەری ڕەزای خوایان لێ بێ لەگەڵ بوو بە پێ دەڕۆیشتن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت و ئاوی دەستنوێژەکەی لێ پژاندم، بەئاگا هاتمەوە، وتم: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! چۆن بڕیار دەدەی لەسەر ماڵ و سامانەکەم؟ یان ماڵ و سامانەکەم چی لێ بکەم؟ هیچ وەڵامی نەدامەوە، جابیر لەو کاتەدا حەوت خوشکی هەبوو، هەتا ئایەتی میرات هاتەخوارەوە: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ). سورة النساء : ١٧٦. واتە: (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) داوای فتوات لێ دەکەن بڵێ خوا فتواتان بۆدەدات دەربارەی کەلالە (کەسێکە نەوەو کوڕو باوکو باپیری نەبێت). جابیر فەرمووی: ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزی.

**دەربارەی میراتگری بەش دیاری نەکراو[1].**

٨ - بَابٌ فِي مِيرَاثِ العَصَبَةِ

٢٠٩٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلْحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ، عَنِ ابْنِ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەپێی قورئانەکەی خوای گەورە بەشە میراتە دیاریکراوەکان بدەن بە خاوەنەکانیان، هەرچی لەوان مایەوە بیدەن بە نزیکترین خزمی مردوەکە بەمەرجێ نێرینە بێت).**

**سەبارەت بە میراتی باپیرە باوکی باوك.**

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الجَدِّ

٢٠٩٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ يَحْيَى، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ ابْنِي مَاتَ فَمَا لِي فِي مِيرَاثِهِ؟ قَالَ: لَكَ السُّدُسُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: لَكَ سُدُسٌ آخَرُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ قَالَ: إِنَّ السُّدُسَ الآخَرَ طُعْمَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِي البَابِ عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ.

---

[1] مەبەست لەو کەسانەیە کە لەدوای وەرگرتنی میراتگرە بەش دیاری کراوەکان ئەگەر شتێك مایەوە وەری دەگرن ئەگەر نەشمایەوە هیچ, عەصەبە ئەگەر خاوەن بەشی دیاریکراو(ذوي الفروض)یان لەگەڵ نەبوو هەموو میراتەکە دەبەن.

واتـە: لـە عیمرانـی كـوڕی حوصـەینەوە ڕەزای خـوای لـیٚ بـیٚ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: پیاویٚ هاتە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسـلم، وتـی: كـوڕی كوڕەكەم مردوە، لەمیراتەكەی چی بۆ منە؟ فەرمووی: (بۆ تۆ شەش یـەك هەیـە — وەك بەشـەدانراوەكان -)، كـاتیٚ كـە پشتی هـەڵكردو ویسـتی بـڕوات بـانگی كـرد فەرمووی: (بۆ تۆ شەش یەكێكی تـریش هەیـە — وەك تەعصـیب بـاوەنێتی بـۆ تـۆ ماوەتەوە - )، كاتیٚ كە پشتی هەڵكردەوە ویستی بـڕوات دیسـان بـانگی كـردەوە فەرمووی: (شەش یەكەكەی تر بەش نیە، زیادە لە هەقی خۆت ڕۆزیەكە بۆ تۆ فەرز نیە).

### ئەوەی هاتووە سەبارەت بە میراتی داپیرە

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الجَدَّةِ

٢١٠٠ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، قَالَ مَرَّةً: قَالَ قَبِيصَةُ، وَقَالَ مَرَّةً: عَنْ رَجُلٍ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ، قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ أُمُّ الأُمِّ، وَأُمُّ الأَبِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَ ابْنِي، أَوْ ابْنَ بِنْتِي مَاتَ، وَقَدْ أُخْبِرْتُ أَنَّ لِي فِي كِتَابِ اللهِ حَقًّا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا أَجِدُ لَكِ فِي الْكِتَابِ مِنْ حَقٍّ، وَمَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى لَكِ بِشَيْءٍ وَسَأَسْأَلُ النَّاسَ، قَالَ: فَسَأَلَ فَشَهِدَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَعْطَاهَا السُّدُسَ قَالَ: وَمَنْ سَمِعَ ذَلِكَ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، قَالَ: فَأَعْطَاهَا السُّدُسَ ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الأُخْرَى الَّتِي تُخَالِفُهَا إِلَى عُمَرَ، قَالَ سُفْيَانُ: وَزَادَنِي فِيهِ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَلَمْ أَحْفَظْهُ عَنِ الزُّهْرِيِّ وَلَكِنْ حَفِظْتُهُ مِنْ مَعْمَرٍ، أَنَّ عُمَرَ قَالَ: إِنْ اجْتَمَعْتُمَا فَهُوَ لَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا انْفَرَدَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا.

واتە: لە قەبیصەی كوڕی (ذُؤَیْب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: داپیرەیە دایكی باوك یان دایكی دایكێ هاتە لای پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ وتی: كوڕی كوڕەكەم یان كوڕی كچەكەم مردووە، پێم راگەیەنراوە لە قورئاندا هەقم بۆ دیاریكراوە، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لە قورئاندا هیچت بۆ دیاری نەكراوە، لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەبیستووە هیچ شتێكی بۆ بڕیاردابێ، پرسیارت بۆ دەكەم لە خەڵك، پرسیاری كرد، موغیرەی كوڕی شوعبە شایەتیدا كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەش یەكی بۆ داناوە، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: كێ لەگەڵ تۆ ئەمەی بیست كەسی ترت لەگەڵدایە بۆ ئەم شایەتیە؟ موغیرە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: موحەممەدی كوڕی مەسلەمە، فەرمووی: شەش یەكی دایە. لەپاشدا دایكی باوكی مردوەكە هاتە لای پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ كرد، پێشەوا عومەر فەرمووی: ئەگەر كۆدەبنەوە تیایدا ئەوە دابەشی بكەن، بەڵام ئەگەر تەنها یەكێكتان داپیرەی ئەو مردوە بێت، ئەوە هەمووی بۆ ئەوە.

٢١٠١ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ خَرَشَةَ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ قَالَ: جَاءَتِ الجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، قَالَ: فَقَالَ لَهَا: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ، وَمَا لَكِ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْءٌ، فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ، فَسَأَلَ النَّاسَ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطَاهَا السُّدُسَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ قَالَ: ثُمَّ جَاءَتِ الجَدَّةُ الأُخْرَى إِلَى

عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ، وَلَكِنْ هُوَ ذَاكَ السُّدُسُ، فَإِنْ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ بُرَيْدَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُيَيْنَةَ.

واتە: لە قەبیصەی کوڕی (ذُؤَيْب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: داپیرەیە هاتە لای پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ کرد، راوی وتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لە قورئاندا هیچت بۆ دیاری نەکراوە، لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم هیچت بۆ دیاری نەکراوە، ئەگەر بۆشت دانرابێ ئاگام لێی نیە، بڕۆرەوە هەتا پرسیار دەکەم لە خەڵك، پرسیاری کرد، موغیرەی کوڕی شوعبە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئامادەبووم داپیرەیەك هاتە خزمەتی شەش یەکی بۆ دانا، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کەسی ترت لەگەڵدایە بۆ ئەم شایەتیە؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ڕەزای خوای لێ بێ هەستا موغیرەی کوڕی شوعبە چی وت ئەویش هەمان قسەی ئەوی گێڕایەوە، ئیتر پێشەوا ئەبو بەکر جێبەجێی کردو شەش یەکی دا بە داپیرەکە. راوی وتی: دواتر داپیرەکەی تری مردوەکە هاتە لای پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ کرد، فەرمووی: لە قورئاندا هیچت بۆ دیاری نەکراوە، هەر ئەو شەش یەکەیە لەنێوان خۆتاندا بەشی بکەن، جا ئەگەر کۆدەبنەوە تیایدا ئەوە دابەشی بکەن، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێکتان داپیرەی ئەو مردوە بێت، ئەوە هەمووی بۆ ئەوە.

## سەبارەت بە میراتی داپیرە لەگەڵ کوڕەکەی

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الجَدَّةِ مَعَ ابْنِهَا

٢١٠٢ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَالِمٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ فِي الجَدَّةِ مَعَ ابْنِهَا: إِنَّهَا أَوَّلُ جَدَّةٍ أَطْعَمَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُدُسًا مَعَ ابْنِهَا وَابْنُهَا حَيٌّ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ وَرَّثَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجَدَّةَ مَعَ ابْنِهَا وَلَمْ يُوَرِّثْهَا بَعْضُهُمْ.

**واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی میراتی داپیرە لەگەڵ کوڕەکەی فەرموویەتی: ئەوە یەکەم داپیرە بوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەش یەکی دایە وەك تەبەروعێ لەگەڵ کوڕەکەی، کوڕەکەی زیندوو بوو – واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەش یەکی دا بە دایکی کوڕەکە، لەکاتێکدا کوڕەکەی زیندوو بوو، دایکی هیچی نەدەکەوت – .**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی خاڵ

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الخَالِ

٢١٠٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ حَكِيمِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: كَتَبَ مَعِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ إِلَى أَبِي عُبَيْدَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ، وَالخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَالمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە سەهلی کوڕی حونەیف ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ نامەی نووسی بۆ ئەبی عوبەیدە بەم شێوەیە: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خواو پێغەمبەرەکەی (مولی)سەرپەرشتیاری کەسێکن سەرپەرشتیاری نەبێت، خاڵیش (مولی)سەرپەرشتیاری کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت، ماڵی بە میرات دەگرێ و، دیلی بۆ رزگار دەکات).

٢١٠٤ - (صحيح) أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ أَرْسَلَهُ بَعْضُهُمْ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَائِشَةَ. وَاخْتَلَفَ فِيهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَرَّثَ بَعْضُهُمُ الخَالَ وَالخَالَةَ وَالعَمَّةَ، وَإِلَى هَذَا الحَدِيثِ ذَهَبَ أَكْثَرُ أَهْلِ العِلْمِ فِي تَوْرِيثِ ذَوِي الأَرْحَامِ، وَأَمَّا زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فَلَمْ يُوَرِّثْهُمْ وَجَعَلَ الْمِيرَاثَ فِي بَيْتِ الْمَالِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خاڵ (مولی)سەرپەرشتیاری کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت). - ماڵی بە میرات دەگرێ و، دیلی بۆ رزگار دەکات - .

### ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێ بمرێ و میراتگری نەبێ

### ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الَّذِي يَمُوتُ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ

٢١٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَصْبِهَانِيِّ، عَنْ مُجَاهِدٍ وَهُوَ ابْنُ وَرْدَانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ

مَوْلًى لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَعَ مِنْ عِذْقِ نَخْلَةٍ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ وَارِثٍ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَادْفَعُوهُ إِلَى بَعْضِ أَهْلِ الْقَرْيَةِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بەندەیەکی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر پەلکی دار خورمایە کەوتەخوارەوە و مرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (بڕۆن بگەڕێن بزانن میراتگری هەیە؟). وتیان: نیەتی، فەرمووی: (میراتەکەی بدەن بە کەسێ کە خەلکی ناوچەکەی ئەوبێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی بەندەی رزگارکراو

## ١٤ - بَابٌ فِي مِيرَاثِ الْمَوْلَى الأَسْفَلِ

٢١٠٦ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَوْسَجَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً مَاتَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَدَعْ وَارِثًا إِلاَّ عَبْدًا هُوَ أَعْتَقَهُ فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِيرَاثَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَالعَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي هَذَا البَابِ: إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ وَلَمْ يَتْرُكْ عَصَبَةً أَنَّ مِيرَاثَهُ يُجْعَلُ فِي بَيْتِ مَالِ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم پیاوێ مرد، میراتگری نەبوو جگە لە غولامێ کە پێشتر ئازادی کردبو، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم میراتەکەی دا بە غولامەکە.

زانایان رایان وایە ئەگەر پیاوێ بمرێت خزمی نەبوو میراتەکەی دەخرێتە

خەزێنەی موسوڵمانانەوە.

## دەربارەی پوچەڵکردنەوەی میراتی نێوان موسوڵمان و کافر

### ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِبْطَالِ الْمِيرَاثِ بَيْنَ الْمُسْلِمِ وَالكَافِرِ

٢١٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ (ح) وَحَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الكَافِرَ، وَلاَ الكَافِرُ الْمُسْلِمَ.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نە موسوڵمان میرات دەگرێ لە کافر، نە کافریش میرات دەگرێ لە موسوڵمان).

٢١٠٧ (م) - حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ هَكَذَا رَوَاهُ مَعْمَرٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ نَحْوَ هَذَا، وَرَوَى مَالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ وَحَدِيثُ مَالِكٍ وَهْمٌ، وَهِمَ فِيهِ مَالِكٌ، وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ مَالِكٍ فَقَالَ: عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، وَأَكْثَرُ أَصْحَابِ مَالِكٍ قَالُوا عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ عُثْمَانَ، وَعَمْرُو بْنُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ هُوَ مَشْهُورٌ مِنْ وَلَدِ عُثْمَانَ، وَلاَ يُعْرَفُ عُمَرُ بْنُ عُثْمَانَ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي مِيرَاثِ الْمُرْتَدِّ، فَجَعَلَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغَيْرِهِمُ الْمَالَ لِوَرَثَتِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَقَالَ

بَعْضُهُمْ: لاَ يَرِثُهُ وَرَثَتُهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الكَافِرَ وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

زانایان پەیڕەوی فەرموودەکە دەکەن، بەڵام لەسەر میراتی هەڵگەڕاوە لەدین رایان جیاوازە، هەندێ لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش دەفەرموون: ماڵ و سامانەکەی بۆ میراتگرە موسوڵمانەکانیەتی، هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: ماڵ و سامانەکەی بۆ میراتگرە موسوڵمانەکانی نابێت، بەڵگەیان فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم: (موسوڵمان میرات ناگرێ لە کافر). ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیيە.

## دەربارەی پەیڕەوانی دوو ئاینی جیاواز میراتی لە یەکتر ناگرن

### ١٦ - بَابُ لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ

٢١٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەیڕەوانی دوو ئاینی جیاواز میراتی لە یەکتر ناگرن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پوچەڵکردنەوەی میراتی بکوژ

١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِبْطَالِ مِيرَاثِ القَاتِلِ

٢١٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: القَاتِلُ لاَ يَرِثُ. هَذَا حَدِيثٌ لاَ يَصِحُّ لاَ يُعْرَفُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَإِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي فَرْوَةَ قَدْ تَرَكَهُ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْهُمْ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ القَاتِلَ لاَ يَرِثُ كَانَ القَتْلُ عَمْدًا أَوْ خَطَأً وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ القَتْلُ خَطَأً فَإِنَّهُ يَرِثُ وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەسی بکوژ میرات لە کوژراو ناگرێ و بۆی نابی). ئیتر بە ئەنقەست بیکوژێ یان بە هەڵە زۆربەی زانایان ڕایان وایە.

## دەربارەی میراتی ژن لە خوێنبایی مێردەکەی

١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الْمَرْأَةِ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا

٢١١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: الدِّيَةُ عَلَى العَاقِلَةِ، وَلاَ تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا شَيْئًا، فَأَخْبَرَهُ الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ الكِلاَبِيُّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ إِلَيْهِ: أَنْ وَرِّثْ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێشەوا

عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: خوێنبایی بۆ خزمانی باوکە، ژن هیچ میرات ناگرێ لە خوێنبایی مێردەکەی، هەتا (ضحاك)ی کوڕی سوفیان پێی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نامەی بۆ نوسیوە: بەشە میرات دابنێ بۆ ژنەکەی ئەشیەمی (ضبابي) لەخوێنبایی مێردەکەی.

## دەربارەی ماڵ و سامان بۆ میراتگران و خوێنبایش لەسەر خزمانی باوکە

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأَمْوَالَ لِلْوَرَثَةِ وَالعَقْلَ عَلَى العَصَبَةِ

٢١١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي جَنِينِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي لِحْيَانَ سَقَطَ مَيِّتًا بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قُضِيَ عَلَيْهَا بِالغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ فَقَضَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا، وَأَنَّ عَقْلَهَا عَلَى عَصَبَتِهَا. وَرَوَى يُونُسُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَرَوَاهُ مَالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَمَالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ژنێ دای لە ژنێکی سك پڕی هۆزی لیحیان خۆی و کۆرپەلەکەی کوشت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا کە خوێنی کۆرپەلەکە دەکاتە سەرێ ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یان کەنیزەك بێ، لەپاشدا ئەو ئافرەتە تاوانبارەکەش مرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاری دا میراتەکەی بۆ کوڕەکانی و بۆ مێردەکەی بێ، خوێنی ژنە کوژراوەکەش لەسەر خزمانی باوکی ژنە تاوانبارەکە بێت.

## دەربارەی میراتی كەسێ لەسەر دەستی كەسێ موسوڵمان بێ

## ٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الَّذِي يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ

٢١١٢ - **(حسن صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، وَابْنُ نُمَيْرٍ، وَوَكِيعٌ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيْ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَهْبٍ وَيُقَالُ: ابْنُ مَوْهَبٍ عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَقَدْ أَدْخَلَ بَعْضُهُمْ بَيْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ وَبَيْنَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَبِيصَةَ بْنَ ذُؤَيْبٍ. رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ عُمَرَ، وَزَادَ فِيهِ قَبِيصَةَ بْنَ ذُؤَيْبٍ، وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ وَهُوَ عِنْدِي لَيْسَ بِمُتَّصِلٍ وَقَالَ: بَعْضُهُمْ يُجْعَلُ مِيرَاثُهُ فِي بَيْتِ الْمَالِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ الوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ.

واتە: لە تەمیمی داریيەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەگەر پیاوێ لەسەردەستی یەكێ لە موسوڵمانان موسوڵمان ببێت چ حەقێكی لەسەری هەیە؟ فەرمووی: (لەژیان و لە مردنی دا لەپێشترین كەسە بۆی).

هەندێ لە زانایان پەیڕەوی فەرموودەكە دەكەن، هەندێكی تر لە زانایان دەڵێن: میراتەكەی دەخرێتە خەزێنەی موسوڵمانانەوە، ئەمەش وتەی پێشەوا شافیعیيە، بەڵگەیان فەرموودەكەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم: (هەقی میراتی بەندەی ئازاد كراو هی ئەو كەسەیە كە ئازادی كردووە).

## دەربارەی پوچەڵکردنەوەی میراتی منداڵی ناشەرعی

٢١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِبْطَالِ مِيرَاثِ وَلَدِ الزِّنَا

٢١١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ عَاهَرَ بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ فَالوَلَدُ وَلَدُ زِنَا لاَ يَرِثُ وَلاَ يُورَثُ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ ابْنِ لَهِيعَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ وَلَدَ الزِّنَا لاَ يَرِثُ مِنْ أَبِيهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر پیاوێ زینا بکات لەگەڵ ئافرەتێکی ئازاد یان کۆیلەدا منداڵی ببێ ئەوە منداڵەکە منداڵی زیناو ناشەرعییە و، نە میرات دەگرێ و نە میراتی لێ دەگیرێت).

## دەربارەی کێ میراتی بەندەی ئازادکراو دەگرێ

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَرِثُ الوَلاَءَ

٢١١٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَرِثُ الوَلاَءَ مَنْ يَرِثُ الْمَالَ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسە میراتی بەندەی ئازادکراو دەگرێ کە میراتی ماڵ و سامان دەگرێ). - ئەگەر کەسەکە خۆشی مرد خزمانی نێرینەی میراتی بەندەی ئازادکراوەکە دەگرن -.

## دەربارەی ئافرەت میراتی بەندەی ئازادکراو دەگرێ

### ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ مَا يَرِثُ النِّسَاءُ مِنَ الوَلاَءِ

٢١١٥ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا هَارُونُ أَبُو مُوسَى الْمُسْتَمْلِي البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ رُؤْبَةَ التَّغْلَبِيُّ، عَنْ عَبْدِ الوَاحِدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ النَّصْرِيِّ، عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَرْأَةُ تَحُوزُ ثَلاَثَةَ مَوَارِيثَ: عَتِيقَهَا وَلَقِيطَهَا وَوَلَدَهَا الَّذِي لاَعَنَتْ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ حَرْبٍ عَلَى هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە (وَاثِلَةَ)ی کوڕی ئەسقەعەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (میراتی ئەم سێ کەسە بۆ ژنە: ئازادکراوی خۆی، منداڵی دۆزراوەی خۆی کە لە لاکۆڵان دەیدۆزێتەوەو بەخێوی دەکات، ئەو منداڵەی کە بە هۆی شەڕە نەفرین (لیعان) - ەوە بووە بەهی خۆی).

# باسی وەسیەتەکان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٢٨ - أَبْوَابُ الْوَصَايَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی وەسیەت بە سێ یەك

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ

٢١١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: مَرِضْتُ عَامَ الفَتْحِ مَرَضًا أَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى الْمَوْتِ، فَأَتَانِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَتِي، أَفَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ إِنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً إِلاَّ أُجِرْتَ فِيهَا حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُخَلَّفُ عَنْ هِجْرَتِي؟ قَالَ: إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ بَعْدِي فَتَعْمَلَ عَمَلاً تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللهِ إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ رِفْعَةً وَدَرَجَةً وَلَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ لَكِنِ البَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ.

وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ لَيْسَ لِلرَّجُلِ أَنْ يُوصِيَ بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ، وَقَدْ اسْتَحَبَّ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يَنْقُصَ مِنَ الثُّلُثِ لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ.

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لەباوکیەوە ڕەزای خوای

لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ساڵی رزگارکردنی شاری مەککە خۆشکەوتم خەریك بوو بمرم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات سەردانی کردم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە، تەنیا کچێکیشم هەیە کە میراتم لێ بگرێت، ئایا هەموو ماڵ و سامانەکەم نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (نەخێر). ئەی دوو بەش لە سێ بەشی ماڵەکەم نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (نەخێر). وتم: ئەی نیوەی نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (نەخێر). وتم: ئەی سێ یەکی نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (سێ یەك دەبێ، سێ یەکیش زۆرە، چونکە تۆ لەپاش مردنت میراتبەرەکانت بە دەوڵەمەندی و تێر و تەسەلی بەجێ بهێڵیت گەلێ لەوە باشترە بەهەژاری بەجێیان بهێڵی و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، ئەوەش بزانە هەرچی ببەخشیت و خەرجی بکەی لەبەر رەزامەندی خوای گەورە ئەوە پاداشتی باشی لەسەر وەردەگری، تەنانەت ئەو پاروەش کە بەرزی دەکەیتەوەو دەیکەیت بەدەمی هاوسەرەکەتەوە — ئەو خەرجی و مەسرەفەی کە دەیکەیت بۆ خاو خێزانی خۆت -)، سەعد وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەترسم لەمەککە بمرم و لەگەڵ ئێوە نەگەڕێمەوە بۆ مەدینە ئەوەش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ و پاداشتی کەمترم دەستکەوێت، فەرمووی: (لەدوای وەفاتی من تۆ دەمێنیی، هەر کاروکردەوەیەکی چاك بکەیت لەبەر رەزامەندی خوای گەورە — لە جیهاد و بەخشین - بەو کردەوە چاکە پایەت بەرزدەبێتەوە لەلای خوا، ئومید دەکەم کە جارێ نەمری لەدوای وەفاتی من بژیت هەتا گەلانی موسوڵمان سودی دین و دونیات لێ ببینن و خوای گەورە بتکاتە مایەی خێر و خۆشی بۆیان و، ببی بەهۆی شکستی و زیان بۆ کافران — ئەوەبو ژیا سەرکردایەتی جەنگی قادسیەی کردو زیانێکی زۆری گەیاند بە فارسە ئاگرپەرستەکان، عێراقی رزگار کردو خەڵکانێکی زۆر لەسەر دەستی ئەو موسوڵمان بوون - ). لەپاشدا فەرمووی:

(خودایە کۆچی هاوەڵانم تاسەربێ و قبوڵ بێ لە مەدینە (دار الهجرة) بمرن، لێی پاشگەز نەبنەوە، بەڵام هەژار سەعدی کوڕی خەولە لە مەککە مرد پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەزەیی پێدا هاتەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی وەسیەتێ زیان بگەیەنێ

۲ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الضِّرَارِ فِي الوَصِيَّةِ

٢١١٧ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، وَهُوَ جَدُّ هَذَا النَّصْرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَشْعَثُ بْنُ جَابِرٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ حَدَّثَهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ وَالمرْأَةُ بِطَاعَةِ اللهِ سِتِّينَ سَنَةً ثُمَّ يَحْضُرُهُمَا الْمَوْتُ فَيُضَارَّانِ فِي الوَصِيَّةِ فَتَجِبُ لَهُمَا النَّارُ، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيَّ أَبُو هُرَيْرَةَ: (مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللَّهِ)، إِلَى قَوْلِهِ، (ذَلِكَ الفَوْزُ العَظِيمُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَنَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ الَّذِي رَوَى عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ جَابِرٍ هُوَ جَدُّ نَصْرِ بْنِ عَلِيٍّ الجَهْضَمِيِّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پیاو یان ژنێ شەست ساڵ گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەن، لەپاشدا لەکاتی سەرەمەرگدا وەسێتێك دەکەن کە زیان بە میراتگرەکان دەگەیەنێت بە هۆیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

لەپاشدا ئەبو هورەیرە ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەسەرما: (**مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ (١٢) تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ**

**الْعَظِيمُ**. سورة النساء: ١٢- ١٣. واتە: لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێك کە کرابێت یان قەرزێك کە (وەسێتەکە یاقەرزەکە بۆ میراتگران) بێ زیان بێ، ئەمە بڕیارە لەلایەن خواوە، خواش زانای لەسەرخۆیە. ئەو (یاسایانە) سنورەکانی خودان، هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت، (خوا) دەیخاتە ناو بەهەشتانێك کەڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی، وە ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی هاندان لەسەر وەسیەت**

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى الوَصِيَّةِ

٢١١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ مَا يُوصِي فِيهِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ئەگەر موسوڵمانێك شتێکی هەبێت بیەوێت راسپێریی بکات، هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێت وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لە لای خۆی دانێ).

**دەربارەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەسیەتی نەکردووە**

٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُوصِ

٢١١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قَطَنٍ عَمْرُو بْنُ الهَيْثَمِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ مِغْوَلٍ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ أَبِي

أَوْفَى: أَوْصَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: لاَ قُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَتِ الوَصِيَّةُ وَكَيْفَ أَمَرَ النَّاسَ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ.

واتە: لە (طلحة)ی كوڕی موصەریفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم بە ئیبنو ئەبی ئەوفا ڕەزای خوای لێ بێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەسیەتی كرد؟ فەرمووی: نەخێر، ئەی چۆن فەرمانی كردووە بە موسوڵمانان وەسیەت بكەن بەڵام خۆی وەسیەتی نەكردووە؟ فەرمووی: وەسیەتی كردووە بەوەی كە پەیڕەوی قورئان بكەن.

## دەربارەی وەسیەت نییە بۆ میراتگران

### ٥ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ

٢١٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُرَحْبِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ الخَوْلاَنِيُّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ عَامَ حَجَّةِ الوَدَاعِ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ أَعْطَى لِكُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ، الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ، وَمَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ التَّابِعَةُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، لاَ تُنْفِقُ امْرَأَةٌ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَلاَ الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذَلِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا ثُمَّ قَالَ: العَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ، وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ، وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ، وَأَنَسٍ وَهُوَ حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ، وَرِوَايَةُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ عَنْ أَهْلِ العِرَاقِ وَأَهْلِ الحِجَازِ لَيْسَ بِذَلِكَ فِيمَا تَفَرَّدَ بِهِ لأَنَّهُ رَوَى عَنْهُمْ مَنَاكِيرَ، وَرِوَايَتُهُ عَنْ أَهْلِ الشَّامِ أَصَحُّ، هَكَذَا قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ:

سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ يَقُولُ: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ أَصْلَحُ بَدَنًا مِنْ بَقِيَّةَ، وَلِبَقِيَّةَ أَحَادِيثُ مَنَاكِيرُ عَنِ الثِّقَاتِ وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: سَمِعْتُ زَكَرِيَّا بْنَ عَدِيٍّ، يَقُولُ: قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ الفَزَارِيُّ: خُذُوا عَنْ بَقِيَّةَ مَا حَدَّثَ عَنِ الثِّقَاتِ، وَلاَ تَأْخُذُوا عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ مَا حَدَّثَ عَنِ الثِّقَاتِ وَلاَ غَيْرِ الثِّقَاتِ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو لە وتاری حەجی ماڵئاوای دەیفەرموو: (خوای گەورەو پەروەردگار هەقی هەموو خاوەن هەقێکی داوە، ئیتر وەسیەت نیە بۆ میراتگران لەبەرئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا بەشی میراتگرانی دیاریکردوە، منداڵ هی خاوەن نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ شەرواڵ پیس دەمێنێتەوە، حسابیان لای خوایە واتە ئێمە حەدی شەرعیان بەسەردا جێبەجێ دەکەین خوای گەورەش ئەگەر بیەوێ لێیان خۆش دەبێ خۆ ئەگەر بیشیەوێ سزایان دەدات، هەرکەسێ داخوازی و بانگەشەی ئەوە بکات کە کوڕی یەکێکی ترە جگە لە باوکی، یان خۆی خستە پاڵ سەرپەرشتیارێك جگە لە گەورەکەی خۆی ئەوە بەردەوام نەفرینی خوای لەسەر بێ هەتا رۆژی قیامەت، بۆ هیچ ئافرەتێ دروست نیە شتێ لەماڵەکەی ببەخشێت بەبێ رەزامەندی مێردەکەی، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنیش؟ فەرمووی: (ئەوە باشرینی ماڵەکانمانە)، لەپاشدا فەرمووی: (خواستن دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی، بۆ نمونە کەسێ ئاژەڵێ دەبەخشێت بە کەسێکی تر سود لە شیرەکەی ببینێ یان درختێ دەدات بە کەسێ سود لە بەرەکەی ببینێ ئەوە پێی دەوترێت (منحة) پێویستە لەپاشدا ئەو ئاژەڵە یان ئەو درەختە بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی، قەرز دەبێ بژێردرێت و بدرێتەوە، کەفیلیش زامنە).

٢١٢١ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ عَلَى نَاقَتِهِ وَأَنَا تَحْتَ جِرَانِهَا وَهِيَ تَقْصَعُ بِجِرَّتِهَا، وَإِنَّ لُعَابَهَا يَسِيلُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، وَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ، وَالوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَمَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ رَغْبَةً عَنْهُمْ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ يَقُولُ: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لاَ أُبَالِي بِحَدِيثِ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ. وَسَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ فَوَثَّقَهُ وَقَالَ: إِنَّمَا يَتَكَلَّمُ فِيهِ ابْنُ عَوْنٍ، ثُمَّ رَوَى ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي زَيْنَبَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی خاریجەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەر وشترەکەیەوە وتاری دەدا، منیش لەژێر بەشی پێشەوەی ملی وشترەکەیدا بووم، ئەویش ئالفی دەجوی و لیکی بەناو شانمدا دەهاتەخوارەوە، بۆ خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (خوای گەورەو پەروەردگار هەقی هەموو خاوەن هەقێکی داوە، ئیتر وەسیەت نیە بۆ میراتگران لەبەرئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا بەشی میراتگرانی دیاریکردوە، منداڵ هی خاوەن نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ شەرواڵ پیس دەمێنێتەوە، هەرکەسێ داخوازی و بانگەشەی ئەوە بکات کە کوڕی یەکێکی ترە جگە لە باوکی، یان خۆی خستە پاڵ سەرپەرشتیارێك جگە لە گەورەکەی خۆی ئەوە بەردەوام نەفرینی خوای لەسەر بێ هەتا ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە فەرز و سوننەتی لێ وەرناگیرێ).

## دەربارەی لەپێش وەسیەت قەرز دەدرێتەوە

- بَابُ مَا جَاءَ يُبْدَأُ بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّةِ

٢١٢٢ - (حسن) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيِّ، عَنِ الحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّةِ، وَأَنْتُمْ تَقْرَءُونَ الوَصِيَّةَ قَبْلَ الدَّيْنِ. وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ يُبْدَأُ بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّةِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەرزی پێش وەسیەت دەخست، بەڵام ئێوە وەسیەت پێش قەرز دەخوێننەوە.

## ئەو کەسەی لەسەرەمەرگدا خێر دەکات و بەندە ئازاد دەکات

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَتَصَدَّقُ أَوْ يَعْتِقُ عِنْدَ الْمَوْتِ

٢١٢٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي حَبِيبَةَ الطَّائِيِّ قَالَ: أَوْصَى إِلَيَّ أَخِي بِطَائِفَةٍ مِنْ مَالِهِ، فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فَقُلْتُ: إِنَّ أَخِي أَوْصَى إِلَيَّ بِطَائِفَةٍ مِنْ مَالِهِ، فَأَيْنَ تَرَى لِي وَضْعَهُ، فِي الفُقَرَاءِ، أَوِ الْمَسَاكِينِ، أَوِ الْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ: أَمَّا أَنَا فَلَوْ كُنْتُ لَمْ أَعْدِلْ بِالمجَاهِدِينَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَثَلُ الَّذِي يَعْتِقُ عِنْدَ الْمَوْتِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي إِذَا شَبِعَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو حەبیبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: براکەم وەسیەتی بۆ کردم بە بەشێ لە ماڵ و سامانەکەی، گەیشتم بە ئەبو دەردا ڕەزای خوای لێ بێ وتم: براکەم وەسیەتی بۆ کردووم بە بەشێ لە ماڵ و سامانەکەی، جا

چۆن دابەشی بکەم و بیدەم بەکێ، بێ نەوایان یان هەژاران یان تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا؟ ئەبو دەردا فەرمووی: ئەگەر من وەسیەتم بکردایە وەسیەتم دەکرد بیدەن بە تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (وێنەی ئەو کەسەی لەکاتی سەرەمەرگدا بەندە ئازاد دەکات وەك ئەو کەسە وایە کاتێ کە خۆی تێر بوو ئەوکاتە لەخواردنەکەی دەبەخشێت).

٢١٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ تَسْتَعِينُ عَائِشَةَ فِي كِتَابَتِهَا وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا، فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَيَكُونَ لِي وَلاَؤُكِ فَعَلْتُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا فَأَبَوْا، وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ وَيَكُونَ لَنَا وَلاَؤُكِ فَلْتَفْعَلْ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ؟ مَنْ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنْ اشْتَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَائِشَةَ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ الوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ.

واتە: لە عورووەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ پێی ڕاگەیاندووە بەریرە هات بۆ لای بۆ ئەوەی لەسەر نامە نوسیەکەی یارمەتی بدات، هیچی لە نامە نوسیەکە نەدابو بە خاوەنەکەی، عائیشە پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ ناو گەورەکانت، ئەگەر پێیان خۆش بوو ئەوا من پارەی نامە نوسیەکەت بۆ دەدەم و ئازادت دەکەم بەمەرجێ وەلائەکەت بۆ من بێ و من ببم بە هەقدارت، بەریرە ئەوەی باس کرد بۆ گەورەکانی بەلاّم گەورەکانی ڕازی نەبوون

وتیان: ئەگەر دەیەوێت با نامە نوسیەکەت بۆ بدات بەمەرجێ وەلائەکەت بۆ ئێمە بێ، ئەو باسە گەیەنرایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عائیشەی فەرموو: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکە، چونکە بێگومان هەقی میراتی بەندەی ئازاد کراو بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکات). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەستایەوەو فەرمووی: (ئەوە بۆچی ئەو خەڵکانە مەرج دادەنێن لەکاتێکدا ئەو مەرجانە لە قورئانەکەی خوای پەروەردگاردا نیە، هەر کەسێ مەرجێ دابنێ ئەو مەرجە لە قورئاندا نەبێ پوچ و بەتاڵە، ئەگەر سەد مەرجیش بێت، چونکە مەرجی خوای پەروەردگار مەحکەم تر و هەق تر و شایەنترە).

# باسەکانی هەقی میراتی بەندەی ئازاد کراو و خەلات و بەخشین لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٢٩ – أَبْوَابُ الْوَلاَءِ وَالْهِبَةِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### هەقی میراتی بەندەی ئازاد کراو بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکات

١ – بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ

٢١٢٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطُوا الوَلاَءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْطَى الثَّمَنَ أَوْ لِمَنْ وَلِيَ النِّعْمَةَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚرنەوە، کە ویستی بەریرە بکریٚت، بە مەرجیٚ لەپاش مردنی میراتەکەی بۆ ئەوان بیٚ، پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیکرە بیٚگومان میراتەکەی بۆ ئەو کەسەیە کە نرخەکەی دەداو، خەلاتی ئازادی پیٚ دەبەخشیٚ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگری لە فرۆشتنی ولایە و خەلاَت

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ

٢١٢٦ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ بَيْعِ الوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ نَهَى عَنْ بَيْعِ الوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، وَيُرْوَى عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: لَوَدِدْتُ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ دِينَارٍ حِينَ حَدَّثَ بِهَذَا الحَدِيثِ أَذِنَ لِي حَتَّى كُنْتُ أَقُومُ إِلَيْهِ فَأُقَبِّلُ رَأْسَهُ وَرَوَى يَحْيَى بْنُ سُلَيْمٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ وَهْمٌ، وَهِمَ فِيهِ يَحْيَى بْنُ سُلَيْمٍ، وَالصَّحِيحُ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هَكَذَا رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ. وَتَفَرَّدَ عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ بِهَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی هەقی میراتی بەندەی ئازادکراو، وە لە بەخشینیشی.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەندەیە گەورەکەی ئازادی کردبێ کەچی حاشابکات لە گەورەکەی خۆی و یەکێکی تر بکات بە گەورەی خۆی یانبانگەشەی ئەوە بکات کە نەوەی کەسێکی ترە جگە لە باوکی خۆی

٣- بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ أَوْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ

٢١٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَطَبَنَا عَلِيٌّ فَقَالَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَؤُهُ إِلاَّ كِتَابَ اللهِ وَهَذِهِ الصَّحِيفَةَ، صَحِيفَةٌ فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَأَشْيَاءٌ مِنَ الجِرَاحَاتِ، فَقَدْ كَذَبَ، وَقَالَ فِيهَا: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً، وَمَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ، وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ. وَرَوَى بَعْضُهُمْ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ، نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عَلِيٍّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئیبراهیمە تەمیمیەوە، لە باوکیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتاری بۆ دەداین فەرمووی: هەرکەسێ گومانی وابێ ئێمەی کەسوکاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نامەو نوسراوێکی تایبەتیمان لەلا هەیە جگە لەم قورئانەو ئەم تۆمارە، تۆمارەکەش ئەمانەی تێدا نوسراون تەمەنی ئەو وشترانەی کە دەدرێن لەهەقی خوێنباییدا چەند شتێ تر دەربارەی خوێنی زام و برینەکان بێگومان ئەو کەسە درۆ دەکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تێیدا فەرموویەتی: (مەدینە

حەرامە لە کێوی عـەیرەوە هاتـا کێـوی (ثـوْر) - کێـوی عـەیر کەوتۆتـە خـوارووی مەدینەوە، کێوی (ثَوْر)یش کێوێکی بچوکە دەکەوێتـە سـەروی کێـوی ئوحـودەوە - جا هەرکەسێ کـارێکی داهێنراو (بیدعـە) یـان کـارێکی نـارەوای تێـدا بکـات، یـان کەسێکی ئەهلی بیدعـەی تێـدا پـەنا بـدات و سـەری بخـات ئـەوە نـەفرینی خـوداو مەلائیکەکان و ئەو خەڵکە هەر هەمووی لەسەربێ، لەرۆژی قیامەتدا خوای گـەورە نەفەرزو نەسوننەتی لێ قبـوڵ ناکـات، کەسـێ بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە نـەوەی کەسێکی ترە جگـە لـە بـاوکی خـۆی و بەندەیـە یـان کەنیزەیـە گەورەکـەی ئـازادی کردبێ کەچی حاشا بکات لە گەورەکەی خۆی و یەکێکی تر بکات بە گەورەی خۆی ئەوە نەفرینی خوداو مەلائیکەکان و ئەو خەڵکە هەر هـەمووی لەسـەربێ، لـەرۆژی قیامەتدا خـوای گـەورە نەفـەرز و نەسـوننەتی لـێ قبـوڵ ناکـات، موسـوڵمانان بـۆ پەیمانی ئامان دان بـە کـافران هـەموویان چـوون یـەکن، هـەرە خوارینەکـەیان مـافی ئامان دانی هەیە بەهەر کافرێ کە دەیەوێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێ نەفی منداڵەکەی خۆی بکات

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنْتَفِي مِنْ وَلَدِهِ

٢١٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ العَلاَءِ الْعَطَّارُ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: فَهَلْ فِيهَا أَوْرَقُ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا، قَالَ: أَنَّى أَتَاهَا ذَلِكَ؟ قَالَ: لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَهَا، قَالَ: فَهَذَا لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێکی هۆزی بەنی فەزارە - ژنەکەی منداڵێکی رەشی بوو بوو گومانی لێی هەبوو – بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ژنەکەم منداڵێکی رەشی بووە، فەرمووی: (ئایا تۆ وشترت هەیە؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (رەنگیان چۆنە؟). وتی: سورن، فەرمووی: (رەشتاڵەیان تێدایە؟). وتی: بەڵێ رەشتاڵەشیان تێدایە، فەرمووی: (ئەوە لەکوێوە هێناویەتی؟). وتی: رەنگە لە ئەسڵدا رەگەزیان لەو رەنگە بوبێت، فەرمووی: (ئەم منداڵەیش رەنگە بچێتەوە سەر ئەسڵێکی – دەی کورەکەی تۆیش هەروەها - ).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی شێوەناسی(قافە)

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَافَةِ

٢١٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا مَسْرُورًا تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ فَقَالَ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا نَظَرَ آنِفًا إِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فَقَالَ: هَذِهِ الأَقْدَامُ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَى ابْنُ عُيَيْنَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، وَزَادَ فِيهِ: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا مَرَّ عَلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ وَهَكَذَا حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ احْتَجَّ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ بِهَذَا الحَدِيثِ فِي إِقَامَةِ أَمْرِ القَافَةِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوەتەژورەوە بۆلای زۆر دڵخۆش بووە و لە خۆشیاندا روخساری درەوشاوەتەوە، فەرموویەتی: (ئەی عائیشە! دەزانیت موجەززیزی مودلەجی — کە شێوەناسێکی بەناوبانگ بوو هات بۆلام — لەوکاتەدا ئوسامەو باوکی لەژێر پارچەیەك قەدیفەدا بوون سەریان داپۆشرابو بەلاّم قاچیان بەدەرەوە بوو، موجەززیز لەسەر ئەو حاڵەتە چاوی پێیان کەوت وتی: ئەم قاچانە لەیەکترن واتە خاوەنی ئەم قاچانە باوك و کوڕن). - ئەبو داود دەڵێت: ئوسامە ڕەش بوو، بەلاّم زەید سپی بوو واتە باوکی -.

## پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەڵکی هانداوە دیاری بۆ یەکتر بەرن

٦ - بَابٌ فِي حَثِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى التَّهَادِي

٢١٣٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ مَرْوَانَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَوَاءٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَهَادَوْا فَإِنَّ الهَدِيَّةَ تُذْهِبُ وَحَرَ الصَّدْرِ، وَلاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ شِقَّ فِرْسِنِ شَاةٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو مَعْشَرٍ اسْمُهُ نَجِيحٌ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ وَقَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دیاری پێشکەش یەکتری بکەن، چونکە دیاری دڵ ساف دەکات، با ئافرەت بۆ ئافرەتی دراوسێی هیچ دیاریە بەکەم نەزانێ ئەگەر پێچکەی مەڕێ یان بزنێکیش بێ بۆی ببات بە دیاری).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گەڕاندنەوەی دیاری خراپە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الرُّجُوعِ فِي الهِبَةِ

٢١٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُكَتِّبُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَثَلُ الَّذِي يُعْطِي العَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَالكَلْبِ أَكَلَ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فَرَجَعَ فِي قَيْئِهِ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (وێنەی ئەو کەسەی کە شتێك ئەبەخشێ لەپاشدا پاشگەزدەبێتەوەو لێی وەرئەگرێتەوە، وەك سەگێك وایە کە خواردنێ بخوات هەتا تێر ئەخوات ئینجا ئەڕشێتەوە، لەپاشدا ڕشانەوەکەی خۆی ئەخواتەوە).

٢١٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي طَاوُوسٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، يَرْفَعَانِ الحَدِيثَ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا إِلاَّ الوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ، وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي العَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَمَثَلِ الكَلْبِ أَكَلَ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: لاَ يَحِلُّ لِمَنْ وَهَبَ هِبَةً أَنْ يَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الوَالِدَ فَلَهُ أَنْ يَرْجِعَ فِيمَا أَعْطَى وَلَدَهُ وَاحْتَجَّ بِهَذَا الحَدِيثِ.

واتە: لە ئیبنو عومەر و ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێك شتێك ببەخشێ یان بیکاتە دیاری بۆ کەسێك لەپاشدا پاشگەزبێتەوە و لێی

وەربگرێتەوە، بێجگە لە بەخشینی باوك لەوەی کە دەیبەخشێ بە کوڕ و نەوەکانی، وێنەی ئەو کەسەی کە شتێك ئەبەخشێ لەپاشدا پاشگەزدەبێتەوەو لێی وەرئەگرێتەوە، وەك سەگێك وایە کە خواردنێ بخوات هەتا تێر ئەخوات ئینجا ئەڕشێتەوە، لەپاشدا رشانەوەکەی خۆی بخواتەوە).

# باسەکانی قەدەر لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

# ٣٠ - أَبْوَابُ الْقَدَرِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## هەڕەشە لەوانەی دووبەرەکی دروست دەکەن لەسەر قەدەر

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي الخَوْضِ فِي القَدَرِ

٢١٣٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحٌ الْمُرِّيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي القَدَرِ فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، حَتَّى كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْنَتَيْهِ الرُّمَّانُ، فَقَالَ: أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ؟ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ صَالِحٍ الْمُرِّيِّ، وَصَالِحٌ الْمُرِّيُّ لَهُ غَرَائِبُ يَنْفَرِدُ بِهَا لاَ يُتَابَعُ عَلَيْهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە بۆ ناومان ئێمەش دووبەرەکی کەتبوە نێوانمانەوە لەسەر قەدەر، توڕە بوو چۆن توڕەبوونێ ڕوخساری سور هەڵگەڕا بوو ئەتوت دەنکە هەنارت تەقاندووە بەسەر کوڵمیدا، ئینکاری کردن و فەرمووی: (من بەوە فەرمانم پێ کردوون، یان من بۆ ئەوە ڕەوانە کراوم بۆسەر ئێوە، قەومەکانی پێش ئێوە بەهۆی ئەم دووبەرەکیەوە لەناوچوون، واجبی دەکەم لەسەرتان پابەند بن بەوەوە کە جارێکی تر لەسەر قەدەر دووبەرەکی نەکەوێتە

نێوانتانەوە و ناکۆك مەبن لەسەری).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڵگە هێنانەوە ئادەم و موسا

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حِجَاجِ آدَمَ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ

٢١٣٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، أَغْوَيْتَ النَّاسَ وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الجَنَّةِ، قَالَ: فَقَالَ آدَمُ: وَأَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلاَمِهِ أَتَلُومُنِي عَلَى عَمَلٍ عَمِلْتُهُ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، قَالَ: فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَجُنْدَبٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُ أَصْحَابِ الأَعْمَشِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێغەمبەران ئادەم و موسا سەلامی خوایان لەسەر بێ لەنێوانیاندا بوو بە راجیایی و بەڵگە هێنانەوە، موسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خوای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردی و گیانی بەبەردا کردی؟ — کەچی بە هۆی گوناهێکەوە — بێ هیواو نائومێدت کردین و لە بەهەشت دەرتپەڕاندین بۆ سەر زەوی، وتی: ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسایەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردی و

پەسەندی کردی و کردیتی بە پێغەمبەر و قسەی لەگەڵ کردی و لەچەند تەختەو لەوحێکدا تەوراتی بۆ ناردی، کەچی لەسەر کردنی کارێ سەرزەنشتم دەکەی کە خوای گەورە لەسەری نوسیوم پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات، وتی: بەو بەڵگە ئادەم موسای بۆڕداو بەزاندی).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی بەدبەختی و بەختەوەری

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّقَاءِ وَالسَّعَادَةِ

٢١٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ مَا نَعْمَلُ فِيهِ أَمْرٌ مُبْتَدَعٌ أَوْ مُبْتَدَأٌ أَوْ فِيمَا قَدْ فُرِغَ مِنْهُ؟ فَقَالَ: فِيمَا قَدْ فُرِغَ مِنْهُ يَا ابْنَ الخَطَّابِ وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَإِنَّهُ يَعْمَلُ لِلسَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَإِنَّهُ يَعْمَلُ لِلشَّقَاءِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! فەرمووی: ئەو کارەی کە ئێمە دەیکەین تەقدیری خوای لەسەرە و پێشتر نوسراوە یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی کوڕی خەتاب پێشتر نوسراوە بەدبەختە یان بەختەوەرە و هەموو کەسێ بۆچی دروستکراوە بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەچێت، ئەهلی بەهەشت ڕێگەی بەهەشت دەگرێ و ئەهلی دۆزەخیش ڕێگەی دۆزەخ).

٢١٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الحُلْوَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، وَوَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ إِذْ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ قَدْ عُلِمَ، وَقَالَ وَكِيعٌ: إِلاَّ قَدْ كُتِبَ، مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الجَنَّةِ، قَالُوا: أَفَلاَ نَتَّكِلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: لە مەدینە لەگۆڕستانی بەقیع لەگەڵ تەرمێکدابووین پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لەوێ ئامادەبوو، هات لەلامان دانیشت داردەستێکی بەدەستەوە بوو، بە بێ دەنگی کەم کەم داردەستەکەی دەخشاند لە زەوی — وەك ئەوەی بیر لەشتێکی گرنگ بکاتەوە -، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (یەك بە یەکتان، یەك بە یەکی روحە دروستکراوەکان، ئیللا خوای گەورە جێگەی ئەوی لە بەهشت دا یان لەدۆزەخ دا نوسیوە، ئیللا نوسراوە کە بەدبەختە یان بەختەوەرە). ئامادەبوان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! جا کەوایە بۆ پشت نەبەستین بەو نوسراوەمان و پاڵی لێ نەدەینەوەو واز لەکاروکردەوەی چاکە نەهێنین، ئەوەی بەختەوەر بێ ئەوە بەختەوەرەو، ئەوەشی بەدبەخت بێ ئەوە بەدبەختەو لە ئەزەلدا بۆیان نوسراوە؟ فەرمووی: (هەوڵ بدەن و با کردەوەتان هەبێت، هەموو کەسێ بۆچی دروستکراوە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت و بۆی ئاسان دەبێت، بەختیار رێگەی چاکەو بەختەوەری دەگرێ و، بەدبەختیش رێگەی خراپەو بەدبەختی دەگرێ).

## دەربارەی کاروکردەکان بەسراون بە کۆتاییەکانیانەوە

٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأَعْمَالَ بِالخَوَاتِيمِ

٢١٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ فِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ إِلَيْهِ الْمَلَكَ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعٍ، يَكْتُبُ رِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَعَمَلَهُ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ ثُمَّ يَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ فَيُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ ثُمَّ يَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ فَيُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسٍ وسَمِعْت أَحْمَدَ بْنَ الحَسَنِ قَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ بِعَيْنِي مِثْلَ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ القَطَّانِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ زَيْدٍ، نَحْوَهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە ڕاستگۆیەو بە ڕاست زانراوەو فەرمایشتی جێگەی باوەڕە فەرموویەتی: (هەریەکێ لەئێوە کە خوای گەورە دروستی دەکات چل ڕۆژ لەسکی دایکیدا بە (نوتفە)تۆمەیی کۆدەکرێتەوەو دەمێنێتەوە، لەپاشدا دەبێت بە پارچە خوێنێکی مەیو چل ڕۆژیش بەو شێوەیە

دەمێنێتــەوە، لەپاشــدا دەبێــت بــە پارچــە گۆشــتێ چــل ڕۆژیــش بــەو شــێوەیە دەمێنێتەوە، ئینجا خوای گەورە مەلائیکەیە دەنێرێ ڕوح دەکات بە بەریا، فەرمان دەکات بەو مەلائیکەیە کە ڕوح دەکات بە بەریا ئەم چوار وشەیە بنوسێت: ڕۆزی و کاروکردەوەیی و ئەجەل و ناکامی لەپاشدا بۆی دەنوسێت کامەران و بەختەوەرە یان بەدبەخت و بەدکارە، کەسی واتـان هەیـە کـردەوەی خـەڵکی بەهەشـت دەکـات تـا لەنێوانی ئەو و بەهەشتدا تەنها باڵێك دەمێنێ، جا نوسراوەکەی پێشی دەکـەوێت و کـردەوەی خـەڵکی ئـاگر دەکـات و دەچـێتە ئـاگرەوە، وە کەسـی وەهاشـتان هەیـە کردەوەی خەڵکی ئاگر دەکات تا لەنێوانی ئەو و ئاگردا تەنها باڵێـك دەمـێنێ، جـا نوسـراوەکەی پێشـی دەکـەوێت و کـردەوەی خـەڵکی بەهەشـت دەکـات و دەچـێتە بەهەشتەوە).

### هەموو منداڵێ لەسەر فیترەتی پاك لەدایك دەبێ

### ٥ - بَابُ مَا جَاءَ كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ

٢١٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى القُطَعِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ رَبِيعَةَ البُنَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْمِلَّةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُشَرِّكَانِهِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَنْ هَلَكَ قَبْلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ بِهِ. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، وَالحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، وَقَالَ: يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَغَيْرُهُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ. وَفِي البَاب عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو منداڵێ كە لەدایك دەبێ لەسەر فیترەتی پاك و بە موسوڵمانی لەدایك دەبێ، لەپاشدا باوك و دایكی دەیكەنە جولەكە یان گاور یا هاوبەش بۆ خوا دانەر). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! ئەی ئەوانەی كە پێش باڵغ بوون و بە منداڵی مردن؟ فەرمووی: (خوای گەورە بۆ خۆی باش دەیزانێ كاروكردەوەیان چی دەبوو).

## جگە لە پاڕانەوە هیچ شتێ قەدەر ناگێڕێتەوە

٦ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ يَرُدُّ القَدَرَ إِلاَّ الدُّعَاءُ

٢١٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، وَسَعِيدُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الضُّرَيْسِ، عَنْ أَبِي مَوْدُودٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَرُدُّ القَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلاَ يَزِيدُ فِي العُمْرِ إِلاَّ البِرُّ.

وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي أَسِيدٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ سَلْمَانَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ الضُّرَيْسِ، وَأَبُو مَوْدُودٍ اثْنَانِ، أَحَدُهُمَا: يُقَالُ لَهُ: فِضَّةُ، وَالآخَرُ: عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، أَحَدُهُمَا بَصْرِيٌّ وَالآخَرُ مَدَنِيٌّ، وَكَانَا فِي عَصْرٍ وَاحِدٍ، وَأَبُو مَوْدُودٍ الَّذِي رَوَى الحَدِيثَ اسْمُهُ فِضَّةُ بَصْرِيٌّ.

واتە: لە سەلمانەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جگە لە پاڕانەوە هیچ شتێ قەدەر ناگێڕێتەوە، جگە لە كردەوەی چاكەش هیچ شتێ تەمەن زیاد ناكات).

## دەربارەی هەڵگەڕانەوەی دڵی بەندەکان بە ویستی خوایە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ القُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيِ الرَّحْمَنِ

٢١٤٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: يَا مُقَلِّبَ القُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، آمَنَّا بِكَ وَبِمَا جِئْتَ بِهِ فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ القُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أَنَسٍ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَدِيثُ أَبِي سُفْيَانَ عَنْ أَنَسٍ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆربەی جار دەیفەرموو: (ئەی هەڵسوڕێنەری دڵان دڵم جێگیر و دامەزراو بکە لەسەر ئیمان و باوەڕ). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! باوەڕمان هێناوە بە تۆ و بەوەی هێناوتە ئایا دەترسی هەڵگەڕێنەوە و بێ باوەڕ بین؟ فەرمووی: (بەڵێ، بێگومان هەڵگەڕانەوەی دڵەکان بە ویستی خوایە هەڵیدەگێڕێتەوە چۆن ویستی لێ بێ).

## دەربارەی خوا ناوی ئەهلی بەهەشت و دۆزەخی تۆمارکردووە

٨ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا لأَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ

٢١٤١ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ أَبِي قَبِيلٍ، عَنْ شُفَيِّ بْنِ مَاتِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَفِي يَدِهِ كِتَابَانِ، فَقَالَ: أَتَدْرُونَ مَا هَذَانِ الكِتَابَانِ؟ فَقُلْنَا: لاَ يَا رَسُولَ اللهِ إِلاَّ

أَنْ تُخْبِرَنَا، فَقَالَ لِلَّذِي فِي يَدِهِ اليُمْنَى: هَذَا كِتَابٌ مِنْ رَبِّ العَالَمِينَ فِيهِ أَسْمَاءُ أَهْلِ الجَنَّةِ وَأَسْمَاءُ آبَائِهِمْ وَقَبَائِلِهِمْ، ثُمَّ أُجْمِلَ عَلَى آخِرِهِمْ فَلاَ يُزَادُ فِيهِمْ وَلاَ يُنْقَصُ مِنْهُمْ أَبَدًا، ثُمَّ قَالَ لِلَّذِي فِي شِمَالِهِ: هَذَا كِتَابٌ مِنْ رَبِّ العَالَمِينَ فِيهِ أَسْمَاءُ أَهْلِ النَّارِ وَأَسْمَاءُ آبَائِهِمْ وَقَبَائِلِهِمْ، ثُمَّ أُجْمِلَ عَلَى آخِرِهِمْ فَلاَ يُزَادُ فِيهِمْ وَلاَ يُنْقَصُ مِنْهُمْ أَبَدًا، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: فَفِيمَ العَمَلُ يَا رَسُولَ اللهِ إِنْ كَانَ أَمْرٌ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ؟ فَقَالَ: سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، فَإِنَّ صَاحِبَ الجَنَّةِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ، وَإِنَّ صَاحِبَ النَّارِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدَيْهِ فَنَبَذَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: فَرَغَ رَبُّكُمْ مِنَ العِبَادِ فَرِيقٌ فِي الجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ أَبِي قَبِيلٍ، نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَأَبُو قَبِيلٍ اسْمُهُ حُيَيُّ بْنُ هَانِئٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەماڵ هاتەدەرەوە بۆ ناومان دوو كتێبی بەدەستەوە بوو، فەرموویەتی: (ئایا دەزانن ئەم دوو كتێبە چییە؟). وتمان: نەخێر نازانین مەگەر تۆ پێمان رابگەیەنی، دەربارەی ئەوەی بەدەستی راستیەوە بوو فەرمووی: (ئەمە كتێبی پەروەردگاری جیهانیانە، ناوی خەڵكی بەهەشتی تێدایە ناوی خۆیان و باب و باپیریان و هۆز و تیرەكانیانی تێدایە هەتا كۆتایی بە تەواوی تۆماری كردوون هەرگیز نە لێی زیاد دەكات و نە لێی كەم دەكات). لەپاشدا دەربارەی ئەوەی بەدەستی چەپیەوە بوو فەرمووی: (ئەمە كتێبی پەروەردگاری جیهانیانە، ناوی خەڵكی ئاگری دۆزەخی تێدایە ناوی خۆیان و باب و باپیریان و هۆز و تیرەكانیانی تێدایە هەتا كۆتایی بە تەواوی تۆماری كردوون هەرگیز نە لێی زیاد دەكات و نە لێی كەم دەكات). هاوەڵانی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم! لە ئەزەلدا ئەمە تۆمار كراوە و

براوەتەوە ئیتر بۆچی کاربکەین؟ فەرمووی: (بەپێی توانا هەوڵ بدەن و کاربکەن بەردەوامبن لەسەری و کەمتەرخەمی و زێدەڕۆیی مەکەن، بێگومان ئەوەی کە بەهەشتییە سەرەنجام کردەوەی خەڵکی بەهەشت ئەنجامدەدات و لەسەر ئەو حاڵە دەمرێ و دەچێتە بەهەشتەوە، ئیتر پێشتر هەر کارێکی ئەهلی دۆزەخی کردبێ، هەروەها ئەوەی کە دۆزەخییە سەرەنجام کردەوەی خەڵکی دۆزەخ ئەنجامدەدات و لەسەر ئەو حاڵە دەمرێ و دەچێتە دۆزەخەوە، ئیتر پێشتر هەر کارێکی ئەهلی بەهەشتی کردبێ). لەپاشدا بە هەردوو دەستی ئاماژەی کردوو هەردوو کتێبەکەی وەلانا و فەرمووی: (پەروەردگارتان کاری خۆی تەواو کردووە بەرامبەر بە بەندەکانی، کۆمەڵێ لە بەهەشتدان، وە کۆمەڵێ لە ئاگری بڵێسەداردان).

٢١٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ فَقِيلَ: كَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ الْمَوْتِ.
هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر خوای گەورە ویستی خێری بە بەندەیەکی خۆی هەبوو بەکاری دەهێنێ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! چۆن بەکاری دەهێنێ؟ فەرمووی: (دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و کاری خێری بۆ ئاسان دەکات و سەرکەوتوی دەکات پێش مردن).

**دەربارەی نە (عدوی) هەیە، نە (هامە) نە صەفەر**

٩ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ عَدْوَى وَلاَ هَامَةَ وَلاَ صَفَرَ

٢١٤٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَاحِبٌ لَنَا، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لاَ يُعْدِي شَيْءٌ شَيْئًا، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ، البَعِيرُ أَجْرَبُ الْحَشَفَةِ نُدْبِنُهُ، فَتَجْرَبُ الْإِبِلُ كُلُّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَمَنْ أَجْرَبَ الأَوَّلَ؟ لاَ عَدْوَى وَلاَ صَفَرَ، خَلَقَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ وَكَتَبَ حَيَاتَهَا وَرِزْقَهَا وَمَصَائِبَهَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَنَسٍ وسَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ صَفْوَانَ الثَّقَفِيَّ البَصْرِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ الْمَدِينِيِّ، يَقُولُ: لَوْ حَلَفْتُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالمَقَامِ لَحَلَفْتُ أَنِّي لَمْ أَرَ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَهْدِيٍّ.

**واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا فەرمووی: (نەخۆشی تەنینەوەی نیە واتە لەکەسێکەوە ناگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر)، عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! جاری وا دەبێ وشترێکی گەڕ دەچێتە ناو پەچەی وشترەکانەوە و تێکەڵاوی وشترەکانی تر دەبێ هەموویان گەڕ دەکات؟ فەرمووی: (ئەی کێ یەکەم وشتری توش کرد، نە تەنینەوەی نەخۆشی هەیە واتە لەکەسێکەوە ناگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر، نە مانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی سەفەر، خوای گەورە هەموو نەفسێکی دروستکردووە و ژیان و رۆزی و بەڵاو موسیبەتەکانی بۆ دیاریکردووە).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی باوەڕ بە قەدەر بەخێر و شەڕیەوە

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِيمَانِ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ

٢١٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَيْمُونٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عُبَادَةَ، وَجَابِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَيْمُونٍ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مَيْمُونٍ مُنْكَرُ الحَدِيثِ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەندە ئیمانی نیە هەتا باوەڕی تەواو بە قەدەری خوای گەورە دێنێت بە خێر و شەڕیەوە، وە هەتا بە تەواوی دەزانێت کە ئەوەی توشی بووە و بەریکەوتوە بۆ ئەوە نەبووە توشی نەبێت، وە ئەوەشی توشی نەبووە بۆ ئەوە نەبووە کە توشی نەبێت).

٢١٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ: يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ بَعَثَنِي بِالحَقِّ، وَيُؤْمِنُ بِالمَوْتِ، وَبِالبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالقَدَرِ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، عَنْ شُعْبَةَ، نَحْوَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: رِبْعِيٌّ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ عَلِيٍّ. حَدِيثُ أَبِي دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ النَّضْرِ وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ عَلِيٍّ. حَدَّثَنَا الجَارُودُ، قَالَ: سَمِعْتُ وَكِيعًا، يَقُولُ: بَلَغَنَا أَنَّ رِبْعِيًّا لَمْ يَكْذِبْ فِي الإِسْلاَمِ كِذْبَةً.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەندە ئیمانی نیە هەتا باوەڕ نەهێنێ بەم چوارە: شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێ نییە بەهەق جگە لە خوای گەورە، وە منیش موحەممەد پێغەمبەری خوام، باوەڕی هەبێ بە مردن و زیندووبونەوە لەدوای مردن، وە باوەڕی تەواوی هەبێ بە قەدەری خوای گەورە).

## دەربارەی مرۆڤ لەو شوێنە دەمرێ کە بۆی نوسراوە

## ١١ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّفْسَ تَمُوتُ حَيْثُ مَا كُتِبَ لَهَا

٢١٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا حَاجَةً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي عَزَّةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَلاَ يُعْرَفُ لِمَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرُ هَذَا الحَدِيثِ. حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، وَأَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، نَحْوَهُ.

واتە: لە (مطر)ی کوڕی عوکامیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بڕیاریدا بۆ هەر بەندەیە لەکوێ بمرێت ئەوە بۆ پێویستیەك ڕێی دەخاتە ئەو شوێنە و لەوێ دەمرێت).

٢١٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ بْنِ أُسَامَةَ، عَنْ أَبِي عَزَّةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا

حَاجَةً، أَوْ قَالَ: بِهَا حَاجَةً. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو عَزَّةَ لَهُ صُحْبَةٌ وَاسْمُهُ يَسَارُ بْنُ عَبْدٍ، وَأَبُو الْمَلِيحِ اسْمُهُ عَامِرُ بْنُ أُسَامَةَ بْنِ عُمَيْرٍ الهُذَلِيُّ، وَيُقَالُ: زَيْدُ بْنُ أُسَامَةَ.

واتە: لە ئەبو عەززەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بڕیاریدا بۆ هەر بەندەیە لەهەر پارچە زەویەکدا بمرێت ئەوە بۆ پێویستیەك ڕێی دەخاتە ئەو شوێنە و لەوێ دەمرێت).

## دەربارەی دوعاو نوشتەو دەرمان هیچ لەقەدەری خوا ناگێڕنەوە

## ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَرُدُّ الرُّقَى وَلاَ الدَّوَاءُ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئًا

٢١٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ أَبِي خُزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رُقًى نَسْتَرْقِيهَا وَدَوَاءً نَتَدَاوَى بِهِ وَتُقَاةً نَتَّقِيهَا هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئًا؟ فَقَالَ: هِيَ مِنْ قَدَرِ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ، وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ هَذَا، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَهَذَا أَصَحُّ هَكَذَا قَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي خُزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو خوزامەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەو دوعاو نوشتەی کە دەیکەین یان ئەو دەرمانەی کە چارەسەری خۆمانی پێ دەکەین یا ئەو خۆپاراستنەی کە دەیکەین هیچ شتێ لەقەدەری خوا دەگێڕنەوە؟ فەرمووی: (ئەوەش لەقەدەری خواوەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەریەکان

١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَدَرِيَّةِ

٢١٤٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ حَبِيبٍ، وَعَلِيُّ بْنُ نِزَارٍ، عَنْ نِزَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَيْسَ لَهُمَا فِي الإِسْلَامِ نَصِيبٌ: الْمُرْجِئَةُ وَالقَدَرِيَّةُ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلَّامُ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ.

**واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوو جۆر لە ئوممەتی من لەئیسلامدا هیچ بەشێکیان بۆ نییە: مورجیئەو قەدەریەکان). — مورجیئە دەڵێن: کردەوەکان هەر هەموویان بە قەدەری خوان و بەندە هیچ ئیختیارێکی نیە، یان دەڵێن: باوەڕ وتەیە بەبێ کردار، کردەوە دوادەخەن. قەدەریەکان دەڵێن: کردەوەی بەندەکان دروستکراوە لەلایەن خۆیانەوە بە قودرەتی خۆیان نەك بە ئیرادەو قودرەتی خوای گەورە -.**

١٤ - بَابٌ

٢١٥٠ - **(حسن)** حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ مُحَمَّدُ بْنُ فِرَاسٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو العَوَّامِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مُثِّلَ ابْنُ آدَمَ وَإِلَى جَنْبِهِ تِسْعٌ

وَتِسْعُونَ مَنِيَّةً إِنْ أَخْطَأَتْهُ الْمَنَايَا وَقَعَ فِي الهَرَمِ حَتَّى يَمُوتَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَأَبُو العَوَّامِ هُوَ عِمْرَانُ، وَهُوَ ابْنُ دَاوَرَ القَطَّانُ.

واتە: لە (مطرف)ی كوڕی (عبد الله)ی كوڕی شیخیرەوە، لە باوكیەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەنی ئادەم دروستكراوە و نەوەد و نۆ بەڵاو كارەسات دەوریان لێداوە ئەگەر نەیگرنەوە و توشیان نەبیٚ ئەوا پیردەبیٚ هەتا دەمرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رازیبوون بە قەدەر

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرِّضَا بِالقَضَاءِ

٢١٥١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِنْ سَعَادَةِ ابْنِ آدَمَ رِضَاهُ بِمَا قَضَى اللَّهُ لَهُ، وَمِنْ شَقَاوَةِ ابْنِ آدَمَ تَرْكُهُ اسْتِخَارَةَ اللهِ، وَمِنْ شَقَاوَةِ ابْنِ آدَمَ سَخَطُهُ بِمَا قَضَى اللَّهُ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حُمَيْدٍ، وَيُقَالُ لَهُ أَيْضًا: حَمَّادُ بْنُ أَبِي حُمَيْدٍ وَهُوَ أَبُو إِبْرَاهِيمَ الْمَدِينِيُّ وَلَيْسَ هُوَ بِالقَوِيِّ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ.

واتە: لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە بەختەوەری ئادەمیزادە رازی بیٚ بە قەدەری خوا، لە نەگبەتی و بەدبەختی ئادەمیزادە وازبهێنیٚ لە دواكردنی خێر لەخوا، لە نەگبەتی و بەدبەختی ئادەمیزادە رازی نەبیٚ بە قەدەری خوا).

واتە: لە صەفیەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵك وازناهێنن لە غەزاو داگیرکردنی ئەم ماڵی خوا هەتا لەشکریّ دێت غەزای بکات لە بیابانێکی سارادا هەر لەسەرەتای لەشکرەکەوە هەتا کۆتایی لەشکرەکە رۆدەچن بەناخی زەویدا ئەوانەی ناوەڕاستیش رزگاریان نابیّ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەی ئەوانەی بەزۆر هێناونیان بۆ ئەو جەنگە و پێیان ناخۆشە حوکمی ئەوانە چۆنە؟ فەرمووی: (لەسەر نیەت و مەبەستی دڵی خۆیان زیندودەکرێنەوە).

٢١٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَيْفِيُّ بْنُ رِبْعِيٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الْخُبْثُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ تَكَلَّمَ فِيهِ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەکۆتایی ئەم ئوممەتەدا رۆچون و گۆڕینی روخسار و بۆ ناشیرینترین شکڵ و شێوە و بەردباران روو دەدەن). عائیشە رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا لەناو دەچین لەکاتێکدا کە پیاوچاکانمان لەناودایە؟ فەرمووی: بەڵیّ، کاتیّ کە تاوان و خراپەکاری بڵاوبوەوە وەك زیناکردن و فیسق و فجور).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆرهەڵاتن لە خۆرئاواوە

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا

٢١٨٦ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ، فَقَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ، أَتَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهَا تَذْهَبُ تَسْتَأْذِنُ فِي السُّجُودِ فَيُؤْذَنُ لَهَا وَكَأَنَّهَا قَدْ قِيلَ لَهَا اطْلُعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا، قَالَ: وَذَلِكَ قِرَاءَةُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ. وَفِي البَابِ عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي مُوسَى. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (أبو ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتی خۆر ئاوابوون بوو چوومە مزگەوتەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوو فەرمووی: (ئایا دەزانی ئەمە بۆ کوێ دەڕواو لەکوێ ئاوا دەبێت؟ واتە خۆر). وتم: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (بێگومان خۆر دەڕوات داوای مۆڵەتی سەجدەبردن دەکات، جا مۆڵەتی پێ دەدرێت سەجدە دەبات - وەك عادەتی خۆی هەموو ڕۆژێ لەخۆرهەڵاتەوە هەڵدێ — سەرەنجام وەك ئەوەی پێی بوترێت لەکوێوە هاتی هەر لەوێشەوە هەڵبێرەوە، ئەویش لە خۆرئاواوە هەڵدێ، فەرمووی: لەپاشدا ئەمەی خوێندەوە: **(وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا)** ئەمەش ئارامگای خۆیەتی). خوێندنەوەی (عبد الله)ی کوڕی مەسعودە ڕەزای خوای لێ بێ.

## دەربارەی دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوج

## ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ

٢١٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ نَافِعٍ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ حَبِيبَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ قَالَتْ: اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَوْمٍ مُحْمَرًّا وَجْهُهُ وَهُوَ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ _ يُرَدِّدُهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ _ وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدْ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ وَعَقَدَ عَشْرًا، قَالَتْ زَيْنَبُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخُبْثُ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ جَوَّدَ سُفْيَانُ هَذَا الْحَدِيثَ هَكَذَا رَوَى الْحُمَيْدِيُّ، وَعَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الْحُفَّاظِ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ نَحْوَ هَذَا وَقَالَ الْحُمَيْدِيُّ: قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: حَفِظْتُ مِنْ الزُّهْرِيِّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ أَرْبَعَ نِسْوَةٍ: زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ حَبِيبَةَ، وَهُمَا رَبِيبَتَا النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ زَوْجَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهَكَذَا رَوَى مَعْمَرٌ، وَغَيْرُهُ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ حَبِيبَةَ، وَقَدْ رَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ ابْنِ عُيَيْنَةَ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ.

واتە: لە زەینەبی کچی جەحشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەخەو راپەڕی و دەم و چاوی سور هەڵگەڕابوو دەفەرموو: (هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە (الله) — سێ جار دووپاتی کردەوە -، هاوار بۆ عەرەب لەبەڵاو کارەساتێکی زۆر گەورە نزیك بۆتەوە) بازنەیەکی بەدوو پەنجەی دروستکردو فەرمووی: (ئەمڕۆ بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج ئەوەندەی ئەمە کونی تێ بوو). منیش وتم: ئەی پێغەمبەری

خوا صلى الله عليه وسلم! ئایا لەناو دەچین لەکاتێکدا کە پیاوچاکانمان لەناودایە؟.
فەرمووی: (بەڵێ کاتێ تاوان و خراپەکاری زۆر بوو).

## دەربارەی سیفەتی خواریجەکان

## ٢٤ - بَابٌ فِي صِفَةِ الْمَارِقَةِ

٢١٨٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ، يَقْرَءُونَ القُرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ البَرِيَّةِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي ذَرٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ فِي غَيْرِ هَذَا الحَدِيثِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَيْثُ وَصَفَ هَؤُلاَءِ القَوْمَ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ القُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، إِنَّمَا هُمُ الخَوَارِجُ وَالحَرُورِيَّةُ وَغَيْرُهُمْ مِنَ الخَوَارِجِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەکۆتایی زەماندا کۆمەڵێ پەیدا دەبن هەرزەو نەفام و کەم ئەقڵن، قسەی چاك دەکەن قورئان و فەرموودە باس دەکەن بۆ خەڵك، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێ و لێی دەرپەڕێ ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن، ئیمان و باوەڕەکەیان لە گەرویان تێپەڕ ناکات). بێگومان ئەوانەش خوارج و حەروریەکانن و غەیری ئەوانن.

## دەربارەی خۆخۆیی و خۆپەرستی

٢٥ - بَابٌ فِي الأَثَرَةِ وَمَا جَاءَ فِيهِ

٢١٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اسْتَعْمَلْتَ فُلاَنًا وَلَمْ تَسْتَعْمِلْنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الحَوْضِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوسەیدی کوڕی (حُضَیْر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فلان کەست کردووە بە سەرکار بەڵام منت نەکردووە بەسەرکار، فەرمووی: (ئێوە لەدوای خۆم تووشی خۆپەرستی و خۆخۆیی دەبن و نازی ئەم و ئەو دەدەن بەسەرتاندا، جا لەکاتی وەهادا دان بەخۆتاندا بگرن هەتا لەسەر حەوزی کەوسەر پێم دەگەنەوە).

٢١٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ وَسَلُوا اللهَ الَّذِي لَكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە(عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە لەدوای خۆم تووشی خۆپەرستی دەبن هەیە زیاتری دەدرێتێ و، بەرەنگاری کاروباری نالەباری وا دەبنەوە ئێوە پێتان خۆش نیە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانمان بەچی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (مافی خۆیان بۆ بگێڕنەوە واتە بۆ کاربەدەستان، داوا لەخوای گەورە بکەن چاکیان بکات یان بیانگۆڕێ بۆتان بە کاربەدەستی چاك).

## هەرچی رویدابێ و هەرچی رودەدات لە کاروباری دین هەتا هەستانی رۆژی قیامەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رایگەیاند بە هاوەڵانی

### ٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ مَا أَخْبَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصْحَابَهُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ

٢١٩١ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مُوسَى القَزَّازُ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ القُرَشِيُّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا صَلاَةَ العَصْرِ بِنَهَارٍ ثُمَّ قَامَ خَطِيبًا فَلَمْ يَدَعْ شَيْئًا يَكُونُ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَخْبَرَنَا بِهِ، حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ، وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ، وَكَانَ فِيمَا قَالَ: إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا فَنَاظِرٌ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، أَلاَ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ وَكَانَ فِيمَا قَالَ: أَلاَ لاَ يَمْنَعَنَّ رَجُلاً هَيْبَةُ النَّاسِ أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ إِذَا عَلِمَهُ قَالَ: فَبَكَى أَبُو سَعِيدٍ وَقَالَ: قَدْ وَاللَّهِ رَأَيْنَا أَشْيَاءَ فَهِبْنَا، فَكَانَ فِيمَا قَالَ: أَلاَ إِنَّهُ يُنْصَبُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ القِيَامَةِ بِقَدْرِ غَدْرَتِهِ، وَلاَ غَدْرَةَ أَعْظَمُ مِنْ غَدْرَةِ إِمَامِ عَامَّةٍ يُرْكَزُ لِوَاؤُهُ عِنْدَ اسْتِهِ فَكَانَ فِيمَا حَفِظْنَا يَوْمَئِذٍ: أَلاَ إِنَّ بَنِي آدَمَ خُلِقُوا عَلَى طَبَقَاتٍ شَتَّى، فَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ مُؤْمِنًا وَيَحْيَا مُؤْمِنًا وَيَمُوتُ مُؤْمِنًا، وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ كَافِرًا وَيَحْيَا كَافِرًا وَيَمُوتُ كَافِرًا، وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ مُؤْمِنًا وَيَحْيَا مُؤْمِنًا وَيَمُوتُ كَافِرًا، وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ كَافِرًا وَيَحْيَا كَافِرًا وَيَمُوتُ مُؤْمِنًا، أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمُ البَطِيءَ الغَضَبِ سَرِيعَ الفَيْءِ، وَمِنْهُمْ سَرِيعُ الغَضَبِ سَرِيعُ الفَيْءِ، فَتِلْكَ بِتِلْكَ، أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمْ سَرِيعَ الغَضَبِ بَطِيءَ الفَيْءِ، أَلاَ وَخَيْرُهُمْ بَطِيءُ الغَضَبِ سَرِيعُ الفَيْءِ، أَلاَ وَشَرُّهُمْ سَرِيعُ الغَضَبِ بَطِيءُ الفَيْءِ، أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمْ حَسَنَ القَضَاءِ حَسَنَ الطَّلَبِ، وَمِنْهُمْ سَيِّئُ القَضَاءِ حَسَنُ الطَّلَبِ، وَمِنْهُمْ حَسَنُ القَضَاءِ سَيِّئُ الطَّلَبِ، فَتِلْكَ بِتِلْكَ، أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمُ السَّيِّئَ القَضَاءِ السَّيِّئَ الطَّلَبِ، أَلاَ وَخَيْرُهُمُ الحَسَنُ القَضَاءِ الحَسَنُ الطَّلَبِ، أَلاَ وَشَرُّهُمْ سَيِّئُ القَضَاءِ سَيِّئُ الطَّلَبِ، أَلاَ وَإِنَّ الغَضَبَ جَمْرَةٌ فِي قَلْبِ ابْنِ آدَمَ، أَمَا رَأَيْتُمْ إِلَى حُمْرَةِ

عَيْنَيْهِ وَانْتِفَاخِ أَوْدَاجِهِ، فَمَنْ أَحَسَّ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ فَلْيَلْصَقْ بِالأَرْضِ قَالَ: وَجَعَلْنَا نَلْتَفِتُ إِلَى الشَّمْسِ هَلْ بَقِيَ مِنْهَا شَيْءٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا فِيمَا مَضَى مِنْهَا إِلاَّ كَمَا بَقِيَ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا فِيمَا مَضَى مِنْهُ: وَفِي البَابِ عَنْ حُذَيْفَةَ، وَأَبِي مَرْيَمَ، وَأَبِي زَيْدِ بْنِ أَخْطَبَ، وَالمغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ وَذَكَرُوا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدَّثَهُمْ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ . وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زوو نوێژی عەسری بۆ کردین، جا هەستایەوە لەسەر مینبەر ئامۆژگاری کردین و وتارێکی بۆ خوێندینەوە، لەناو ئەو وتارەدا هەرچی رویدابێ و هەرچی رودەدات لە کاروباری دین هەتا هەستانی رۆژی قیامەت باسی هەر هەمووی کردو پێی راگەیاندین، ئەوی لەیادی مابێ لەیادی ماوەو ئەوەشی لەیادی چوبێتەوە لەیادی چۆتەوە، لە وتارەکەیدا فەرمووی: (دونیا خۆشەویست و بە تام و سەوزە، خوای گەورە چین لەدوای چین ئێوە دەکات بە جێگەداری پێشینان ئاوەدانی بکەنەوە، سەیر دەکات ریزانێ کردار و رەفتارتان چۆنە و چی دەکەن، هۆشیاربن خۆتان بپارێزن لە فێڵ و تەڵەکەی دونیا، ئاگاداربن نەکەونە داوی ئافرەتان و خۆتان بپارێزن لە فێڵ و تەڵەکەیان، چونکە یەکەم فیتنە و ئاژاوەیە کە بەنی ئیسرائیل تووشی بوون، ئەوە بوو کەوتنە داوی ئافرەتانەوە). لە وتارەکەیدا فەرمووی: (هۆشیاربن ترسی خەڵك واتان لێ نەکات هەق نەڵێن ئەگەر زانی)، راوی وتی: ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ گریاو فەرمووی: سوێند بە (الله) شتمان دیوە بەڵام ترسی خەڵك رێگری لێ کردووین قسەی لەسەر بکەین یان فەرمانی پێ بکەین، لە وتارەکەیدا فەرمووی: (هۆشیاربن لەرۆژی قیامەتدا بۆ هەموو غەدار و پەیمان شکێنێ لەلای سمتیەوە ئاڵایەکی بێ

پەیمانی بۆ هەڵدەکرێ، بە قەدەر زۆری و کەمی بێ پەیمانیەکەی بەرزدەکرێتەوە، ئاگاداربن هیچ ستەمکار و غەداری غەدر و ستەمکاریەکەی ناگات بە غەدر و ستەمکاری فەرمانڕەوای گشتی). ئەوەی لەوکاتەدا لەبەرمان کرد ئەمەبوو: (هۆشیاربن خوای گەورە ئادەمیزادی دروستکردووە بە ئیعتیباری جیاوازی حاڵەتی باوەڕ و بێ باوەڕیان، هەیانە بە باوەڕداری لەدایك دەبێ، بە باوەڕداری دەژی، بە باوەڕداری دەمرێ، هەیانە بە بێ باوەڕی لەدایك دەبێ، بە بێ باوەڕی دەژی، بە بێ باوەڕی دەمرێ، هەیانە بە باوەڕداری لەدایك دەبێ، بە باوەڕداری دەژی، بە بێ باوەڕی دەمرێ، هەیانە بە بێ باوەڕی لەدایك دەبێ، بە بێ باوەڕی دەژی، بە باوەڕداری دەمرێ، هۆشیاربن هەیانە بە کەمی تووڕە دەبێ و زوو هێور دەبێتەوە، هەیانە زوو تووڕە دەبێ و زوو هێور دەبێتەوە، ئیتر ئەم سیفەتەیان بەو سیفەتەیان و خاوەنەکەیان نە وەسف دەکرێت و نە سەرزەنشت دەکرێت، هۆشیاربن چاکترینیان ئەوەیانە بە کەمی تووڕە دەبێ و زوو هێور دەبێتەوە، هۆشیاربن خراپترینیان ئەوەیانە زوو تووڕە دەبێ و زوو هێور دەبێتەوە، هۆشیاربن هەیانە زۆر بەجوانی قەرزەکانی دەداتەوە و زۆر بە جوانی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، هەیانە زۆر بە خراپی قەرزەکانی دەداتەوە بەڵام زۆر بە جوانی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، هەیانە زۆر بە جوانی قەرزەکانی دەداتەوە بەڵام زۆر بە خراپی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، ئیتر ئەم سیفەتەیان بەو سیفەتەیان و خاوەنەکەیان نە وەسف دەکرێت و نە سەرزەنشت دەکرێت، هۆشیاربن هەیانە زۆر بە خراپی قەرزەکانی دەداتەوە زۆر بە خراپی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، هۆشیاربن چاکترینیان ئەوەیانە زۆر بەجوانی قەرزەکانی دەداتەوە و زۆر بە جوانی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، هۆشیاربن خراپترینیان ئەوەیانە زۆر بە خراپی داوای قەرزەکانی دەداتەوە و زۆر بە خراپی داوای قەرزەکانی دەکاتەوە، هۆشیاربن هەڵچوون و تووڕەبوون پشکۆیەکی ئاگرە لە

دڵی ئادەمیزاددا، نابینن چۆن چاوی سوور هەڵدەگەڕێ و دەماری لاملی هەڵەسێ، هەرکەس هەستی بە حاڵەتێکی لەوشێوەیە کرد با خۆی بنوسێنێ بە زەویەوە هەتا هێور دەبێتەوە). سەیری خۆرمان کرد هەتا بزانین هیچی ماوە ئاوابێت؟ - بێگومان کەمێکی مابوو خۆر ئاوابێت - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی دونیاش ئەوەندەی ماوە کۆتایی بێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خەڵکی شام

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّامِ

٢١٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا فَسَدَ أَهْلُ الشَّامِ فَلاَ خَيْرَ فِيكُمْ، لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ: هُمْ أَصْحَابُ الحَدِيثِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَوَالَةَ، وَابْنِ عُمَرَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَيْنَ تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: هَاهُنَا، وَنَحَا بِيَدِهِ نَحْوَ الشَّامِ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕڕەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کاتێ خەڵکی شام خراپ بوون ئیتر خێری تێدا نامێنێ تێیدا دانیشن یان ڕووی تێ بکەن، بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتی من سەردەکەون بەسەر دوژمنانی دینی خوادا، ئەوەی

دژیان بێ و بیەوێ سەریان نەوی بکات ناتوانێ و زیانیان پێ ناگەیەنێت هەتا رۆژی قیامەت).

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ

٢١٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ غَزْوَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَجَرِيرٍ وَابْنِ عُمَرَ، وَكُرْزِ بْنِ عَلْقَمَةَ، وَوَاثِلَةَ، وَالصُّنَابِحِيِّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەدوای مردنی من مەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی و هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان).

## ئاژاوەیە بەرپادەبێ ئەوکەسەی دانیشتوە چاکترە لەو کەسەی بە پێوەیە

٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ تَكُونُ فِتْنَةٌ القَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ القَائِمِ

٢١٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عَيَّاشِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ عِنْدَ فِتْنَةِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ القَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ القَائِمِ، وَالقَائِمُ خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالمَاشِي خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ دَخَلَ عَلَيَّ بَيْتِي وَبَسَطَ يَدَهُ إِلَيَّ لِيَقْتُلَنِي؟ قَالَ: كُنْ كَابْنِ آدَمَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَخَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي وَاقِدٍ، وَأَبِي

مُوسَى، وَخَرَشَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنِ اللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ وَزَادَ فِي الْإِسْنَادِ رَجُلاً. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ سَعْدٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خوای لێ بێ دەربارەی فیتنە و ئاژاوەکەی زەمانی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لە ڕاستیدا فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبێ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبێ، ئەوکەسەی کە دانیشتوە چاکترە لەو کەسەی کە بە پێوەیە، ئەوکەسەی کە ڕێ دەکات چاکترە لەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بۆ هەڵگیرسانی و دەستی تێی دایە)، سەعد ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: هەواڵم بدەرێ ئەگەر کەسێ هاتەماڵەکەم و دەستی درێژ کرد بۆم و ویستی بمکوژێت چی بکەم؟ فەرمووی: (تۆ وەك کوڕەکەی ئادەم بە). - بێگومان کوڕەکەی ئادەم بە براکەی فەرموو: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژکەی بۆ ئەوەی بمکوژی، من دەست درێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم، بەڕاستی من لەخوا ئەترسم -.

## ئاژاوەیە بەرپادەبێ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبێ

## ٣٠ - بَابُ مَا جَاءَ سَتَكُونُ فِتَنٌ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ

٢١٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (پێشبڕکیّ بکەن لە ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاکەدا، لە ڕاستیدا فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبیّ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبیّ، پیاو هەیـە بـەیانی موسـوڵمانەو ئێـوارە کـافرە، ئێـوارە موسـوڵمانەو بەیانی کافرە، یەکیّ لەوانە دینەکەی دەفرۆشیّ بە شتێکی کەم و بیّ نرخی دونیا).

٢١٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الحَارِثِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَيْقَظَ لَيْلَةً فَقَالَ: سُبْحَانَ اللهِ، مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الفِتْنَةِ، مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الخَزَائِنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الحُجُرَاتِ؟ يَا رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٌ فِي الآخِرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوممو سـەلەمەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: شەویّ پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم لەخـەو هەسـتا فـەرمووی: (پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە، ئەمشەو چ فیتنە و ئاژاوەیە باریوە، لە گەنجینەی خـواوە چی باریوە، کیّ ژنە ژوور نشینەکان ئاگادار دەکاتەوە، ئـای چـەند ئـافرەتی پۆشـتە هەیە لەدنیادا بەڵام لە دواڕۆژدا رووت و بیّ بەرگن).

٢١٩٧ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تَكُونُ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ فِتَنٌ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ أَقْوَامٌ دِينَهُمْ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَجُنْدَبٍ، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَأَبِي مُوسَى. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە رەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕاستیدا بەر لە هاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم فیتنەو ئاژاوەیە بەرپادەبێ وەك شەوەزەنگ دونیا تاریك دەبێ، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە، خەڵکانێ دەبن دینەکەیان دەفرۆشن بە شتێکی کەم و بێ نرخی دونیا).

٢١٩٨ - (صحيح الإسناد عن حسن البصري) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: كَانَ يَقُولُ فِي هَذَا الحَدِيثِ: يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا قَالَ: يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُحَرِّمًا لِدَمِ أَخِيهِ وَعِرْضِهِ وَمَالِهِ وَيُمْسِي مُسْتَحِلًّا لَهُ، وَيُمْسِي مُحَرِّمًا لِدَمِ أَخِيهِ وَعِرْضِهِ وَمَالِهِ وَيُصْبِحُ مُسْتَحِلًّا لَهُ.

واتە: حەسەنی بەصری لەربارەی ئەم فەرموودەوە: (پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە). دەفەرمووێت: واتە پیاو هەیە بەیانی خوێن و سەر و ماڵ و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بەلاوە حەرامە، بەڵام بۆ ئێوارەکەی بە پێچەوانەوە خوێن و سەر و ماڵ و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بەلاوە حەڵاڵە، وە ئێوارە خوێن و سەر و ماڵ و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بەلاوە حەرامە، بەڵام بۆ بەیانیەکەی بە پێچەوانەوە خوێن و سەر و ماڵ و ناموسی برا موسوڵمانەکەی بەلاوە حەڵاڵە.

٢١٩٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلَّالُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَجُلٌ سَأَلَهُ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَيْنَا أُمَرَاءُ يَمْنَعُونَا حَقَّنَا وَيَسْأَلُونَا حَقَّهُمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائیلی کوڕی حوجرەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ

بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، پیاوێ پرسیاری لێ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، گریمان کەسانێ بوون بە فەرمانڕەوا بەسەرمانەوە هەق و مافی خۆمانمان نەدەنێ، بەڵام داوای هەق و مافی خۆیانمان لێ بکەن لەو حاڵەتەدا فەرمانمان بەچی پێ دەکەی؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (گوێڕایەڵ بن و فەرمانبەرداری فەرمانڕەواکانتان بکەن ئەرکی سەرشانی ئەوان شتێکە و ئەرکی سەرشانی ئێوەش شتێکی ترە). - بێگومان ئەرکی سەرشانی فەرمانڕەواکان دادپەروەری و جێبەجێ کردنی هەق و مافی ژێردەستەکانیەتی، ئەرکی سەرشانی ژێردەستەکانیش گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری فەرمانڕەواکانە ئارامگرتنە لەسەری.-

## دەربارەی پەرستش لەکاتی کوشت و کوشتاردا

٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الهَرْجِ وَالعِبَادَةِ فِيهِ

٢٢٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامًا يُرْفَعُ فِيهَا العِلْمُ وَيَكْثُرُ فِيهَا الهَرْجُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الهَرْجُ؟ قَالَ: القَتْلُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَخَالِدِ بْنِ الوَلِيدِ، وَمَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان رۆژانێکتان لەبەردەمدایە زانستی شەرعی تێیدا هەڵدەگیرێ و کوشت و کوشتاری تێیدا زۆر دەبێ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، (هرج) یانی چی: فەرمووی: (کوشتن).

٢٢٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنِ الْمُعَلَّى بْنِ زِيَادٍ، رَدَّهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، رَدَّهُ إِلَى مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، رَدَّهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: العِبَادَةُ فِي الهَرْجِ كَالهِجْرَةِ إِلَيَّ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الْمُعَلَّى.

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەرستش لەکاتی فیتنە و ئاژاوە و کوشت و کوشتاردا وەك کۆچکردن وایە بۆلای من).

٣٢ - بَابٌ

٢٢٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا وُضِعَ السَّيْفُ فِي أُمَّتِي لَمْ يُرْفَعْ عَنْهَا إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ شمشێر نرایە سەر ملی ئوممەتی من و جەنگ و ئاژاوەی تێکەوت ئیتر هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت لێرەو لەوێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵگرتنی شمێری دارین لەکاتی ئاژاوەدا

## ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اتِّخَاذِ سَيْفٍ مِنْ خَشَبٍ فِي الفِتْنَةِ

٢٢٠٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ عُدَيْسَةَ بِنْتِ أُهْبَانَ بْنِ صَيْفِيٍّ الغِفَارِيِّ، قَالَتْ: جَاءَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ إِلَى أَبِي فَدَعَاهُ إِلَى الخُرُوجِ مَعَهُ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: إِنَّ خَلِيلِي وَابْنَ عَمِّكَ

عَهِدَ إِلَيَّ إِذَا اخْتَلَفَ النَّاسُ أَنْ أَتَّخِذَ سَيْفًا مِنْ خَشَبٍ فَقَدْ اتَّخَذْتُهُ، فَإِنْ شِئْتَ خَرَجْتُ بِهِ مَعَكَ قَالَتْ: فَتَرَكَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُبَيْدٍ.

واتە: لە عودەیسەی کچی ئوهبانی کوڕی صەیفی غیفاریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆلای باوکم داوای لێ کرد لەگەڵی دەرچێ بۆ جەنگ، باوکم پێی فەرموو: خۆشەویستم کوڕە ما مەکەت وەسیەتی بۆ کردووم کاتێ کە خەڵك جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە و جەنگ بەرپابوو شمێری دارین هەڵگرم ئەوەتا شمێری دارینم هەڵگرتووە، ئەگەر دەتەوێ بەو شمێری دارینەوە ئامادەم لەخزمەتتدا، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وازی لێ هێنا.

٢٢٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جُحَادَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَرْوَانَ، عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ فِي الفِتْنَةِ: كَسِّرُوا فِيهَا قَسِيَّكُمْ، وَقَطِّعُوا فِيهَا أَوْتَارَكُمْ، وَالزَمُوا فِيهَا أَجْوَافَ بُيُوتِكُمْ، وَكُونُوا كَابْنِ آدَمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ ثَرْوَانَ هُوَ أَبُو قَيْسٍ الأَوْدِيُّ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبارەی بەرپابوونی فیتنەو ئاژاوەوە فەرموویەتی: (تیر و کەوانەکانتان بشکێنن و ژێی کەوانەکانتان بپسێنن و بە بەرد بدەن لە شمشێرەکانتان هەتا کول دەبن یان بیان شکێنن و برۆنە کونجی ماڵەکانتانەوە، وەك کوڕەکەی ئادەم بن) — کە وتی بە براکەی: (سوێند بەخوا ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژکەی بۆ ئەوەی بمکوژی، من دەست درێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم، بەڕاستی من لەخوا ئەترسم) - .

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشانەكانی قیامەت

٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَشْرَاطِ السَّاعَةِ

٢٢٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ: أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَظْهَرَ الجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَتُشْرَبَ الخَمْرُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةٍ قَيِّمٌ وَاحِدٌ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي مُوسَى، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالیكــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویەتی: فەرمایشتێكم بیستوە لـە پێغەمبـەری خوا صـلى الله عليـە وسـلم، لەدوای من كەس بۆتان باس ناكات كە بیستویەتی لـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليە وسلم، ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: (بێگومان لە نیشانەكانی هاتنی قیامەت ئەوەیـە:زانیاری كـەم دەبـێ، نـەزانین زۆر دەبێت، زیناكردن زۆر دەبێ، شەراب خۆری زۆر دەبێ، پیاوان كەم دەبن، ژنـان زۆر دەبن، هەتا وای لێ دێت پەنجا ئافرەت یەك پیاو سەرپەرشتیان دەكات).

## باسێكی تر لەو بارەوە

٣٥ - بَابٌ مِنْهُ

٢٢٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَلْقَى مِنَ الحَجَّاجِ، فَقَالَ: مَا مِنْ عَامٍ إِلاَّ وَالَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ، سَمِعْتُ هَذَا

مِنْ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە زوبێری کوڕی عەدییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چوینە خزمەت ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ سکاڵای خۆمان لەلا کرد لەدەست حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کە گیرمان خواردووە بە دەستیەوە، ئەنەس فەرمووی: هیچ ساڵێ نیە ئیللا ساڵی دواتر خراپتر دەبێ هەتا دەگەنەوە بە پەروەردگاری خۆتان، ئەمەشم لە پێغەمبەرەکەتانەوە صلی الله علیه وسلم بیستووە.

٢٢٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: اللَّهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێ هەتادا بوترێت (الله)، (الله)).

**باسێکی تر لەو بارەوە**

٣٦ - بَابٌ مِنْهُ

٢٢٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَقِيءُ الأَرْضُ أَفْلاَذَ كَبِدِهَا أَمْثَالَ الأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، قَالَ: فَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ: فِي مِثْلِ هَذَا قُطِعَتْ يَدِي، وَيَجِيءُ القَاتِلُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَتَلْتُ،

وَيَجِيءُ القَاطِعُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي، ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلاَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (زەوی گەنجی ناخی خۆی هەڵدەڕێژێتە دەرەوە وێنەی پایە و کۆڵەکەی زێڕ و زیو)، فەرمووی: کەسی دز دێتە سەری و دەڵێ: من لەسەر ئەمە دەستم براوە، پیاوکوژ دێتە سەری و دەڵێ: من لەسەر ئەمە خەڵکم کوشتووە، ئەو کەسەی سیلەی ڕەحم دەپچڕێنێ و سەردانی کەسوکاری ناکات دێتە سەری و دەڵێ: من لەسەر ئەمە سەردانی کەسوکاری خۆم نەدەکرد و سیلەی ڕەحم دەپچڕاند، لەپاشدا بەجێی دەهێڵن و هیچی لێ نابەن).

## باسێکی تر لەو بارەوە

٣٧ - بَابٌ مِنْهُ

٢٢٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو (ح) وحَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللهِ وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَنْصَارِيُّ الأَشْهَلِيُّ، عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ أَسْعَدَ النَّاسِ بِالدُّنْيَا لُكَعُ ابْنُ لُكَعٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو.

واتە: لە (حذيفة)ی کوڕی یەمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێ هەتا کەسانێکی سووك و ڕیسواو بێ نرخ و کوڕی سووك و ڕیسواو بێ نرخ دڵ بە دونیا خۆش دەکەن و بەختەوەرین کەس دەبن بە دونیا).

## دەربارەی نیشانەکانی کاتی گۆڕینی روخسار و رۆچوون

## ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عَلاَمَةِ حُلُولِ الْمَسْخِ وَالخَسْفِ

٢٢١٠ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ التِّرْمِذِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ أَبُو فَضَالَةَ الشَّامِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا فَعَلَتْ أُمَّتِي خَمْسَ عَشْرَةَ خَصْلَةً حَلَّ بِهَا البَلاَءُ فَقِيلَ: وَمَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: إِذَا كَانَ الْمَغْنَمُ دُوَلاً، وَالأَمَانَةُ مَغْنَمًا، وَالزَّكَاةُ مَغْرَمًا، وَأَطَاعَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ، وَعَقَّ أُمَّهُ، وَبَرَّ صَدِيقَهُ، وَجَفَا أَبَاهُ، وَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَكَانَ زَعِيمُ القَوْمِ أَرْذَلَهُمْ، وَأُكْرِمَ الرَّجُلُ مَخَافَةَ شَرِّهِ، وَشُرِبَتِ الخُمُورُ، وَلُبِسَ الحَرِيرُ، وَاتُّخِذَتِ القَيْنَاتُ وَالمَعَازِفُ، وَلَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَوَّلَهَا، فَلْيَرْتَقِبُوا عِنْدَ ذَلِكَ رِيحًا حَمْرَاءَ أَوْ خَسْفًا وَمَسْخًا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا رَوَاهُ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ غَيْرَ الفَرَجِ بْنِ فَضَالَةَ وَالفَرَجُ بْنُ فَضَالَةَ قَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ بَعْضُ أَهْلِ الحَدِيثِ وَضَعَّفَهُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ، وَقَدْ رَوَاهُ عَنْهُ وَكِيعٌ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ ئوممەتەکەی من ئەم پانزە شتەیان ئەنجامدا فیتنە و بەڵاو دەبارێ بەسەریاندا و شایستەی ئەوە دەبن). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەو شتانە چین؟ فەرمووی: (هەرکاتێ غەنیمەت بۆ قەومێ هەبوو بۆ قەومێکی تر نەبوو،ماڵی سپاردە ئەمانەت وەك غەنیمەتی لێهات واتە ئەمانەتەکە نەدرایەوە بە خاوەنی و وەك غەنیمەت خورا، زەکات دەرکردن وەك غەرامەی لێهات ئەوەندە قورس بوو بەلای خەڵکەوە، پیاو گوێڕایەڵی ژنەکەی بوو ئازاری دایك و باوکی دا، لەگەڵ هاوڕێکەی چاك بێ و خۆشی بوێ بەڵام باوکی خۆش نەوێ و لێی دوورکەوێتەوە، ژاوەژاو لە

مزگەوتەکاندا دروست بوو دەنگی تێدا بەرزکرایەوە، گەورەی تیرە و هـۆز خـراپترین کەسی هۆزەکە بوو، ڕێزی پیاو بگیرێ لەترسی شەڕ و خراپەی، شـەراب بخورێتـەوە، ئاوریشم لەبەرکرێ، ئالەتەکانی مۆسیقا برەوی پێ بدرێت و ئافرەتان گۆرانی بڵێن و سەما بکەن، کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرەت بکەن لەسـەرەتای ئوممـەت تانـە و تەشـەر بدەن لە سەلەفی ئـەم ئوممەتـە، جـا کـە ئەمانـە ڕوویانـدا ئـیتر چـاوەڕێی هـەڵکردنی بایەکی سور بکەن یـان چـاوەڕێی و ڕۆچـوون و گـۆڕینـی شـکڵ و شـێوە و ڕوخسـار بکەن).

٢٢١١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الوَاسِطِيُّ، عَنِ الْمُسْتَلِمِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ رُمَيْحٍ الجُذَامِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً، وَالأَمَانَةُ مَغْنَمًا، وَالزَّكَاةُ مَغْرَمًا، وَتُعُلِّمَ لِغَيْرِ الدِّينِ، وَأَطَاعَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ، وَعَقَّ أُمَّهُ، وَأَدْنَى صَدِيقَهُ، وَأَقْصَى أَبَاهُ، وَظَهَرَتِ الأَصْوَاتُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَسَادَ القَبِيلَةَ فَاسِقُهُمْ، وَكَانَ زَعِيمُ القَوْمِ أَرْذَلَهُمْ، وَأُكْرِمَ الرَّجُلُ مَخَافَةَ شَرِّهِ، وَظَهَرَتِ القَيْنَاتُ وَالمَعَازِفُ، وَشُرِبَتِ الخُمُورُ، وَلَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَوَّلَهَا، فَلْيَرْتَقِبُوا عِنْدَ ذَلِكَ رِيحًا حَمْرَاءَ، وَزَلْزَلَةً وَخَسْفًا وَمَسْخًا وَقَذْفًا وَآيَاتٍ تَتَابَعُ كَنِظَامٍ بَالٍ قُطِعَ سِلْكُهُ فَتَتَابَعَ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ.
وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (هـەرکاتێ غەنیمـەت بـۆ قەومێ هەبوو بۆ قـەومێکی تـر نـەبوو، مـاڵی سپاردە ئەمانـەت وەك غەنیمـەتی لێهات واتـە ئەمانەتەکـە نەدرایـەوە بـە خـاوەنی و وەك غەنیمـەت خـورا، زەکـات دەرکردن وەك غەرامەی لێهات ئەوەندە قورس بوو بـەلای خەڵکـەوە، خـەڵك فێـری خوێندن ببن بۆ ماڵ و سامان و نـاو و شـۆرەت نـەك بـۆ دیـن و بڵاوبونـەوەی، پیـاو

گوێڕایەڵی ژنەکەی کرد و ئازاری دایك دا، لە هاوڕێکەی نزیکبوەوە و چاك بوو بوێ و لە باوکی دوورکەوتەوە، ژاوەژاو لەناو مزگەوتەکاندا دروست بوو دەنگی تێدا بەرزکرایەوە، گەورەی تیرە و هۆز فاسق و خراپترین کەسی هۆزەکە بوو، ڕێزی لە پیاو بگیرێ لەترسی شەڕ و خراپەی، ئالەتەکانی مۆسیقا برەوی پێ بدرێت و ئافرەتان گۆرانی بڵێن و سەما بکەن، شەراب بخورێتەوە، کۆتایی ئەم ئوممەتە نەفرەت بکەن لەسەرەتای ئوممەت واتە تانە و تەشەر بدەن لە سەلەفی ئەم ئوممەتە، جا کە ئەمانە رویاندا ئیتر چاوەڕێی هەڵکردنی بایەکی سور بکەن یان چاوەڕێی بومەلەرزە و رۆچوون و گۆڕینی شکڵ و شێوە و روخسار و بەردباران بکەن، جا نیشانەکان بەدوای یەکدا دێن وەك چۆن بەنی تەسبیحێ دەپچڕێ مورووەکانی بەدوای یەکدا دەکەونەخوارەوە).

٢٢١٢ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ يَعْقُوبَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ القُدُّوسِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَتَى ذَاكَ؟ قَالَ: إِذَا ظَهَرَتِ القَيْنَاتُ وَالمعَازِفُ وَشُرِبَتِ الخُمُورُ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَابِطٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەکۆتایی ئەم ئوممەتەدا رۆچون و گۆڕینی روخسار و بۆ ناشیرینترین شکڵ و شێوە و بەردباران روو دەدەن). پیاوێ لە موسوڵمانان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەمانە کەی روودەدەن: فەرمووی: (هەرکاتێ ئالەتەکانی مۆسیقا برەوی پێ بدرێت و ئافرەتان گۆرانی بڵێن و سەما بکەن و، شەراب بخورێتەوە).

(من لەهەمان کاتی هاتنی قیامەتدا رەوانەکرام بەلاّم من کەمێ پێشی کەوتم وەك ئەم دووانە ئاماژەی کرد بۆ پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی).

**من و قیامەت وەك ئەم دووانە واین، ئاماژەی کرد بۆ پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی.**

٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ يَعْنِي السَّبَّابَةَ وَالوُسْطَى

٢٢١٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ هَيَّاجٍ الأَسَدِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَرْحَبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدَةُ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ الفِهْرِيِّ، رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بُعِثْتُ فِي نَفَسِ السَّاعَةِ فَسَبَقْتُهَا كَمَا سَبَقَتْ هَذِهِ هَذِهِ لأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالوُسْطَى. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من لەهەمان کاتی هاتنی قیامەتدا رەوانەکرام بەلاّم من کەمێ پێشی کەوتم وەك ئەم دووانە ئاماژەی کرد بۆ پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی کە کەمێ درێژترە).

٢٢١٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ أَبُو دَاوُدَ بِالسَّبَّابَةِ وَالوُسْطَى فَمَا فَضَّلَ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى؟.هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رەوانەکردنی

مـن و بـەرپابوونی قیامـەت وەك ئـەم دووانـە وان). ئـەبو داود ئامـاژەی کـرد بـۆ پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی فەزڵی هیچیانی نەدا بەسەر ئەوی تریاندا.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی جەنگ لەگەڵ تورك

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قِتَالِ التُّرْكِ

٢٢١٥ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، وَعَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ العَلاَءِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَبُرَيْدَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعَمْرِو بْنِ تَغْلِبَ، وَمُعَاوِيَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (قیامەت بەرپا نابێت هەتا موسوڵمانان جـەنگ لەگـەڵ قـەومێك دەکـەن مـوو لـەپێ دەکـەن، وە قیامــەت بـەرپا نابێـت هـەتا موسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێك دەکەن دەم و چاویان وەکو قەڵغانەو بەسیرمەی زۆر دەورە گیراوە).

٤١ - بَابُ مَا جَاءَ إِذَا ذَهَبَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ

٢٢١٦ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا

هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە کیسرا تیاچوو ئیتر لەدوای ئەو کیسرای تر حوکمی فارس ناکات، وە کاتێ کە قەیسەر تیاچوو ئیتر لەدوای ئەو قەیسەری تر حوکمی رۆم ناکات، سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە گەنجینەکانیان دەبەخشرێنەوە لەرێی خوا).

## قیامەت هەڵناسێت هەتا ئاگرێك لەرووی حیجازەوە پەیدا دەبێت

٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ قِبَلِ الحِجَازِ

٢٢١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَتَخْرُجُ نَارٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ أَوْ مِنْ نَحْوِ بَحْرِ حَضْرَمَوْتَ قَبْلَ يَوْمِ القِيَامَةِ تَحْشُرُ النَّاسَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ. وَفِي البَابِ عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە سالیمی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە، لە باوکیەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەپێش بەرپابوونی رۆژی قیامەت ئاگرێك لە (حَضْرَمَوْتَ) پەیدا دەبێت خەڵك بەرەو شوێنی کۆبونەوەیان راپێچ دەکات)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆ ئەو کاتە فەرمانمان بەچی پێ دەکەیت ؟ فەرمووی: (رێگەی شام بگرنەبەر سەلامەتە).

### قیامەت هەڵناسێت هەتا چەند درۆزنێ پەیدا دەبن

### ٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ كَذَّابُونَ

٢٢١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْبَعِثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلاَثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێت هەتا نزیکەی سی درۆزن پەیدا دەبن هەریەکەیان پێی وایە پێغەمبەری خوایە).

٢٢١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالمُشْرِكِينَ، وَحَتَّى يَعْبُدُوا الأَوْثَانَ، وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ كَذَّابُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێت هەتا چەند هۆز و تیرەیە لەئوممەتی من پەیوەندی دەکەن بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە، وە هات بت دەپەرسترێت، بێگومان لەئوممەتی من سی درۆزن پەیدا دەبن هەریەکەیان پێی وایە پێغەمبەرە، بەڵام من دواهەمینی پێغەمبەرانم و لەپاش من پێغەمبەری تر نییە).

٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيرٌ

٢٢٢٠ - (صحيح الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُصْمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيرٌ: يُقَالُ: الكَذَّابُ الْمُخْتَارُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، وَالمبِيرُ: الحَجَّاجُ بْنُ يُوسُفَ حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ سُلَيْمَانُ بْنُ سَلْمٍ البَلْخِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ قَالَ: أَحْصَوْا مَا قَتَلَ الحَجَّاجُ صَبْرًا فَبَلَغَ مِائَةَ أَلْفٍ وَعِشْرِينَ أَلْفَ قَتِيلٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ. حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ وَاقِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، نَحْوَهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ وَشَرِيكٌ يَقُولُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُصْمٍ، وَإِسْرَائِيلُ يَقُولُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عِصْمَةَ.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (لە (ثقیف) درۆزنێك و خەڵك لەناوبەرێ پەیدا دەبن). دەوترێت: درۆزنەکە موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفییە، خەڵك لەناوبەرەکەش حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفییە.**

**ئەوەی هاتووە دەربارەی سێ سەدە زێڕینەکە**

٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي القَرْنِ الثَّالِثِ

٢٢٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفُضَيْلِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُدْرِكٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِهِمْ قَوْمٌ يَتَسَمَّنُونَ وَيُحِبُّونَ السِّمَنَ يُعْطُونَ الشَّهَادَةَ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلُوهَا. هَكَذَا رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ

مُدْرِكٍ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ وَرَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الحُفَّاظِ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَلِيَّ بْنَ مُدْرِكٍ وحَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ يَسَافٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ وَهَذَا أَصَحُّ عِنْدِي مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (چاكترین خەڵكانی ئومەتی من ئەوانەن لەم سەدەیەدان كە منی تێدا ڕەوانەكراوم بۆیان، پاشان چینی دوای ئەوان، پاشان چینی دوای ئەوان، لەپاشدا خەڵكانێ پەیدا دەبن خۆیان بە گەورە دەزانن، حەزیان لە خواردن و خواردنەوەی خۆشە ئەمەش هۆكارە بۆ قەڵەوی، كەس داوای شایەتیدانیان لێ ناكات كەچی لەخۆیانەوە دەبن بە شایەت و شایەتی دەدەن).

٢٢٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خَيْرُ أُمَّتِي القَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، قَالَ: وَلاَ أَعْلَمُ ذَكَرَ الثَّالِثَ أَمْ لاَ، ثُمَّ يَنْشَأُ أَقْوَامٌ يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَفْشُو فِيهِمُ السِّمَنُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چاكترین خەڵكانی ئومەتی من ئەوانەن لەم سەدەیەدان كە منی تێدا ڕەوانەكراوم بۆیان، پاشان چینی دوای ئەوان). عیمران وتی: خوای گەورە خۆی باش دەیزانێ باسی

چینی سێیەمی کرد یان نا: (لەپاشدا خەڵکانێ پەیدا دەبن کەس داوای شایەتیدانیان لێ ناکات کەچی لەخۆیانەوە دەبن بە شایەت و شایەتی دەدەن، ناپاکی و خیانەت دەکەن و جێگەی متمانەو باوەڕ پێ کردن نین، قەڵەویش لەناویاندا بەربڵاوە).

**ئەوەی هاتووە دەربارەی خەلیفەکان**

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْخُلَفَاءِ

٢٢٢٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عُبَيْدٍ الطَّنَافِسِيُّ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَكُونُ مِنْ بَعْدِي اثْنَا عَشَرَ أَمِيرًا، قَالَ: ثُمَّ تَكَلَّمَ بِشَيْءٍ لَمْ أَفْهَمْهُ فَسَأَلْتُ الَّذِي يَلِينِي، فَقَالَ: قَالَ: كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَ هَذَا الحَدِيثِ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: لە جابیری کوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەردەوام ئەم دینە پایەدار و سەرکەوتو دەبێت هەتا دوانزە کەس دەبن بە خەلیفەتان سەرجەم ئومەت کۆکن لەسەر هەر هەموویان و بەڵێن و پەیمانیان پێ دەدەن و فەرمانبەردارییان دەکەن). قسەیەکم بیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵام لێی تێ نەگەیشتم، پرسیارم کرد لەوەی تەنیشتم - یان بە باوکم -؟ وتی: فەرمووی: (هەموو خەلیفەکان لە قورەیشن).

٤٧ - بَابٌ

٢٢٢٤ - (حسن) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مِهْرَانَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ زِيَادِ بْنِ كُسَيْبٍ العَدَوِيِّ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي بَكْرَةَ تَحْتَ مِنْبَرِ ابْنِ عَامِرٍ وَهُوَ يَخْطُبُ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَقَالَ أَبُو بِلاَلٍ: انْظُرُوا إِلَى أَمِيرِنَا يَلْبَسُ ثِيَابَ الفُسَّاقِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: اسْكُتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ أَهَانَ سُلْطَانَ اللهِ فِي الأَرْضِ أَهَانَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە زیادی کوڕی کوسەیبی عەدەویەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ ئەبو بەکرە لەژێر مینبەرەکەی ئیبنو عامردا بووم پۆشاکێکی تەنکی لەبەردا بوو، ئەبو بیلال وتی: سەیری ئەمیرەکەمان بکە پۆشاکی فاسقەکانی لەبەردایە، ئەبو بەکرە وتی: بێدەنگ بە بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێ سوکایەتی بکات بە کەسێ خوای گەورە دەسەڵاتی پێ بەخشیبێ لەسەر زەویدا، خوای گەورە سوکایەتی پێ دەکات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی جێنشینی

٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الخِلاَفَةِ

٢٢٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قِيلَ لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: لَوْ اسْتَخْلَفْتَ، قَالَ: إِنْ أَسْتَخْلِفْ فَقَدْ اسْتَخْلَفَ أَبُو بَكْرٍ، وَإِنْ لَمْ أَسْتَخْلِفْ لَمْ يَسْتَخْلِفْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە سالیمی کوڕی (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وترا: خۆزگە جێنشینت بۆ پاش خۆت دادەنا، فەرمووی: ئەگەر جێنشین بۆ خۆم دانێم ئەوە جێگەی خۆیەتی چونکە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ جێنشینێ بۆ خۆی دانا لەمنیش باشتر بوو، خۆ ئەگەر جێنشین بۆ خۆم دانەنێم ئەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جێنشینێ بۆ خۆی دانەنا.

٢٢٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَشْرَجُ بْنُ نُبَاتَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُمْهَانَ، قَالَ: حَدَّثَنِي سَفِينَةُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الخِلاَفَةُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ سَنَةً، ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ ثُمَّ قَالَ لِي سَفِينَةُ: أَمْسِكْ خِلاَفَةَ أَبِي بَكْرٍ، وَخِلاَفَةَ عُمَرَ، وَخِلاَفَةَ عُثْمَانَ، ثُمَّ قَالَ لِي: أَمْسِكْ خِلاَفَةَ عَلِيٍّ قَالَ: فَوَجَدْنَاهَا ثَلاَثِينَ سَنَةً، قَالَ سَعِيدٌ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ بَنِي أُمَيَّةَ يَزْعُمُونَ أَنَّ الخِلاَفَةَ فِيهِمْ؟ قَالَ: كَذَبُوا بَنُو الزَّرْقَاءِ بَلْ هُمْ مُلُوكٌ مِنْ شَرِّ الْمُلُوكِ. وَفِي البَابِ عَنْ عُمَرَ، وَعَلِيٍّ قَالاَ: لَمْ يَعْهَدِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الخِلاَفَةِ شَيْئًا. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ قَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُمْهَانَ وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ.

واتە: لە سەفینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جێنشینی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی لەئوممەتی مندا سی ساڵە، لەپاشدا دەبێ بە سیستەمی پاشایەتی). لەپاشدا سەفینە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لە سەردەمی پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ و پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، و پێشەوا عوسمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ حسابمان کرد هەتا دەگاتە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ سی ساڵ بوو، سەعید وتی: پێم وت: بەنی ئومەییە پێیان وایە

جێنشینی لەوانە، فەرمووی: بەنی زەرقا درۆدەکەن بەڵکو ئەوان پاشان و لە خراپترینی پاشاکانن.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی جێنشین لە قورەیشە هەتا رۆژی قیامەت

### ٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْخُلَفَاءَ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ

٢٢٢٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي الْهُذَيْلِ، يَقُولُ: كَانَ نَاسٌ مِنْ رَبِيعَةَ عِنْدَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَكْرِ بْنِ وَائِلٍ: لَتَنْتَهِيَنَّ قُرَيْشٌ أَوْ لَيَجْعَلَنَّ اللَّهُ هَذَا الأَمْرَ فِي جُمْهُورٍ مِنَ الْعَرَبِ غَيْرِهِمْ، فَقَالَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ: كَذَبْتَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قُرَيْشٌ وُلاَةُ النَّاسِ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە حەبیبی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبی هوزەیل بوو، دەیفەرموو: (خەڵکی رەبیعە لای عەمری کوڕی عاص، پیاوێ لە هۆزی بەکری کوڕی وائیل وتی: یا ئەوەتا قورەیش وازدەهێنن لە گوناهو تاوان یان خوای گەورە ئەم دەسەڵاتەیان لێ وەردەگرێتەوە بۆ جەماوەری عەرەب و غەیری ئەوان، عەمری کوڕی عاص رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: درۆدەکەیت، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (قورەیش لەچاکە و لەخراپەدا لەسەردەمی نەفامی و لەسەردەمی ئیسلامدا پێشەواو رابەری خەڵکن هەتا رۆژی قیامەت).

٥٠ - بَابٌ

٢٢٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ العَبْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الحَنَفِيُّ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الحَكَمِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْمَوَالِي يُقَالُ لَهُ: جَهْجَاهُ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە عومەری كوڕی حەكەمەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ بوو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (شەو و ڕۆژ كۆتاییان نایە واتە ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت هەتا پیاوی لە لایەنگرانی عەرەب بەناوی (جَهْجَاه)وە بە زۆر دەبێتە گەورە و دەسەلاتدار).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوا گومڕاكارەكان

٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الأَئِمَّةِ الْمُضِلِّينَ

٢٢٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الحَقِّ ظَاهِرِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ يَخْذُلُهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، سَمِعْت مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ الْمَدِينِيِّ يَقُولُ: _ وَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ _ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ فَقَالَ عَلِيٌّ: هُمْ أَهْلُ الحَدِيثِ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕاستی دا مەترسی هەرە گەورەم لە پێشەواو سەرۆکە سەرکەش و گومڕاو ملهوڕەکانە کە خەڵك بانگ دەکەن بۆ تاوان و خراپەکاری و بیدعەو گومڕایان دەکەن)، ڕاوی وتی: هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەردەوام کۆمەڵێ لە ئومەتەکەم لەسەر هەقن، ئاشکرا و دیارن، ئەوەی دژیان بێت زیانیان پێ ناگەیەنێ هەتا فەرمانی خوای گەورە دێت واتە تا نزیکی قیامەت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی مەهدی

### ٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَهْدِيِّ

٢٢٣٠ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ أَسْبَاطِ بْنِ مُحَمَّدٍ الْقُرَشِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمْلِكَ العَرَبَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دونیا کۆتایی نایەت هەتا پیاوێك لە بنەماڵەی من دەکرێتە دەسەڵاتدار بەسەر عەرەبدا، ناوی ڕێك وەك ناوی من وایە).

٢٢٣١ - (**حسن صحيح**) حَدَّثَنَا عَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الجَبَّارِ العَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَلِي رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي قَالَ عَاصِمٌ: وَأَخْبَرَنَا أَبُو صَالِحٍ،

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَلِيَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاوێك لە بنەماڵەی من دەکرێتە دەسەڵاتدار بەسەر عەرەبدا، ناوی وەك ناوی من وایە). واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر دونیا ڕۆژێکی مابێت خوای گەورە ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە هەتا پیاوێك لە بنەماڵەی من دەکرێتە دەسەڵاتدار بەسەر عەرەبدا، ناوی ڕێك وەك ناوی من وایە.

## ٥٣ - بَابٌ

٢٢٣٢ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدًا الْعَمِّيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الصِّدِّيقِ النَّاجِيَّ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: خَشِينَا أَنْ يَكُونَ بَعْدَ نَبِيِّنَا حَدَثٌ فَسَأَلْنَا نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ فِي أُمَّتِي الْمَهْدِيَّ يَخْرُجُ يَعِيشُ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا أَوْ تِسْعًا، زَيْدٌ الشَّاكُّ، قَالَ: قُلْنَا: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: سِنِينَ قَالَ: فَيَجِيءُ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَيَقُولُ: يَا مَهْدِيُّ أَعْطِنِي أَعْطِنِي قَالَ: فَيَحْثِي لَهُ فِي ثَوْبِهِ مَا اسْتَطَاعَ أَنْ يَحْمِلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو الصِّدِّيقِ النَّاجِيُّ اسْمُهُ بَكْرُ بْنُ عَمْرٍو، وَيُقَالُ: بَكْرُ بْنُ قَيْسٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەترساین لەپاش وەفاتی پێغەمبەرەکەمان صلی الله علیه وسلم شتێکی تازە ڕووبدات ناسراو نەبێ لەسوننەتدا، بۆیە لەوبارەوە لە پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ئەویش فەرمووی: (لەئومەتی مندا پیاوێ بە ناوی مەهدی پەیدا دەبێ پێنج یان حەوت یا نۆ ساڵ دەژی، زەید ڕاوی فەرموودەکە

گومانی هەبوو، وتی: وتمان: لەچی، فەرمووی: لە ساڵەکان، فەرمووی: (پیاوێ دێ بۆلای دەڵێ: ئەی مەهدی پێم ببەخشە، پێم ببەخشە)، فەرمووی: (ئەوەندەی کە بتوانێ هەڵی بگرێ پێی دەبەخشێ). - چونکە لەو کاتەدا ئەوەندە ماڵ و سامان و غەنیمەت و رزگارکردنی ناوچەکان زۆر دەبێت -.

## دەربارەی دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم سڵاوی خوای لەسەر بێ

٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نُزُولِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ

٢٢٣٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضُ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم دابەزێت بۆ ناوتان و حوکم بە شەریعەتی ئیسلام دەکات و لەسەر زەویداو دادگەری و عەدالەت بڵاودەکاتەوە، خاچ دەشکێنێ، بەراز دەکوژێ، جزیە و سەرانە هەڵدەگرێ، ماڵ و سامان ئەوەندە زۆردەبێ کەس وەری ناگرێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دەجال

٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّجَّالِ

٢٢٣٤ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سُرَاقَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ بَعْدَ نُوحٍ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَ الدَّجَّالَ قَوْمَهُ وَإِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ فَوَصَفَهُ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لَعَلَّهُ سَيُدْرِكُهُ بَعْضُ مَنْ رَآنِي أَوْ سَمِعَ كَلاَمِي قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ قُلُوبُنَا يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: مِثْلُهَا، يَعْنِي اليَوْمَ، أَوْ خَيْرٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ خَالِدٍ الحَذَّاءِ.

**واتە: لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەدوای نوح سەرجەم پێغەمبەران گەلەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەجال، منیش ئێوەی لێ ئاگادار دەکەمەوەو دەتانترسێنم). جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەسفی دەجالی بۆ کردین و فەرمووی: (لەوانەیە هەندێ لەو کەسانەی من دەبینن یان قسەکانی من دەبیستن لەئایندەدا بگەن بە دەجال)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوکاتەدا دڵەکانمان چۆن دەبێ؟ وەك ئەمڕۆ دامەزراو دەبێ؟ فەرمووی: (ئومێد دەکەم لە ئێستا گەلێ باشتر بێ).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشانەكانی دەجال

٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عَلاَمَةِ الدَّجَّالِ

٢٢٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ قَوْمَهُ وَلَقَدْ أَنْذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ وَلَكِنِّي سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَإِنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَأَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَئِذٍ لِلنَّاسِ وَهُوَ يُحَذِّرُهُمْ فِتْنَتَهُ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ لَنْ يَرَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رَبَّهُ حَتَّى يَمُوتَ وَإِنَّهُ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ: كَافِرٌ، يَقْرَأُهُ مَنْ كَرِهَ عَمَلَهُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە وتارێكی بۆ خەڵكەكە خوێندەوە، سوپاسێ كە شایستەی خودا بێ كردی، لەپاشدا باسی دەجالی كردو فەرمووی: (من هۆشیارتان دەكەمەوە، سەرجەم پێغەمبەران گەلەكانیان ئاگادار كردۆتەوە لە مەترسی دەجال، نوح گەلەكەی خۆی ئاگادار كردۆتەوە لە مەترسی دەجال، بەڵام من قسەیەكتان لەبارەیەوە بۆ دەكەم هیچ پێغەمبەرێ ئەم قسەیەی بۆ گەلەكەی خۆی نەكردوە، ئەوەیە كە دەجال چاوێكی كوێرە، بێگومان خوای گەورە بەو شێوەیە نیە).

ئەو رۆژەی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هۆشیاریدا بە خەڵك دەربارەی فیتنەی دەجال، فەرمووی: (وەك خۆتان دەزانن هیچ كەسێ لەئێوە لەدونیادا پەروەردگاری خۆی نابینێ هەتا دەمرێت - بەڵێ بەراستی كوێرە، ئەمەش یەكێكە لە درۆ زەقەكانی چونكە بێگومان پەروەردگارتان كوێر نییە -،

لەنێوان هەردوو چاوەکانیدا نوسراوە کافر، هەموو موسڵمانێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار کردەوەکانی ئەوی پێ باش نەبێ دەیخوێنێتەوە).

٢٢٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: تُقَاتِلُكُمُ اليَهُودُ فَتُسَلَّطُونَ عَلَيْهِمْ حَتَّى يَقُولَ الحَجَرُ: يَا مُسْلِمُ، هَذَا الْيَهُودِيُّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جولەکە جەنگتان لەگەڵ دەکەن بەڵام ئێوەی موسوڵمان سەردەکەون بەسەریاندا بە شێوەیە تەنانەت بەرد دەڵێ: ئەی موسوڵمان ئەمە جولەکەیەکە لەپەنای مندا خۆی حەشارداوە وەرە بیکوژە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دەجال لەکوێ دەردەکەوێت

## ٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ مِنْ أَيْنَ يَخْرُجُ الدَّجَّالُ

٢٢٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالاَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ سُبَيْعٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الدَّجَّالُ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالمَشْرِقِ يُقَالُ لَهَا: خُرَاسَانُ، يَتْبَعُهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ.

وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَائِشَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَوْذَبٍ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي التَّيَّاحِ.

واتە: لە پێشەوا ئەبو بەکرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی دەجالی بۆ کردین فەرمووی: (دەجال لە رۆژهەڵات لەخاکێکەوە دەردەچێت پێی دەوترێت خوراسان، خەڵکانێ شوێنی دەکەون دەم و چاویان وەکو قەڵغانەو بەسیرمەی زۆر دەورە گیراوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشانەکانی دەرکەتنی دەجال

٥٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عَلاَمَاتِ خُرُوجِ الدَّجَّالِ

٢٢٣٨ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الحَكَمُ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنِ الوَلِيدِ بْنِ سُفْيَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ قُطَيْبٍ السَّكُونِيِّ، عَنْ أَبِي بَحْرِيَّةَ صَاحِبِ مُعَاذٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمَلْحَمَةُ العُظْمَى، وَفَتْحُ القُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَخُرُوجُ الدَّجَّالِ فِي سَبْعَةِ أَشْهُرٍ.

وَفِي البَابِ عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جەنگە هەرەگەورەکە و رزگارکردنی قوستەنتینیەو دەرکەوتنی دەجال لەماوەی حەوت مانگدا روودەدەن).

٢٢٣٩ - **(صحيح الإسناد موقوف)** حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: فَتْحُ القُسْطَنْطِينِيَّةِ مَعَ قِيَامِ السَّاعَةِ، قَالَ مَحْمُودٌ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَالقُسْطَنْطِينِيَّةُ هِيَ مَدِينَةُ الرُّومِ تُفْتَحُ عِنْدَ

خُرُوجِ الدَّجَّالِ، وَالقُسْطَنْطِينِيَّةُ قَدْ فُتِحَتْ فِي زَمَانِ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ نزیکبونەوەی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەتدا قوستەنتینیە رزگار دەکرێت. قوستەنتینیە شاری ڕۆمایە کاتی دەرکەوتنی دەجال رزگار دەکرێت.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فیتنە و ئاژاوەی دەجال

٥٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فِتْنَةِ الدَّجَّالِ

٢٢٤٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، دَخَلَ حَدِيثُ أَحَدِهِمَا فِي حَدِيثِ الآخَرِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ جَابِرٍ الطَّائِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الكِلَابِيِّ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، قَالَ: فَانْصَرَفْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ رَجَعْنَا إِلَيْهِ فَعَرَفَ ذَلِكَ فِينَا فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ الغَدَاةَ فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ قَالَ: غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُ لِي عَلَيْكُمْ، إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ وَاللَّهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ عَيْنُهُ طَافِئَةٌ شَبِيهٌ بِعَبْدِ العُزَّى بْنِ قَطَنٍ، فَمَنْ رَآهُ مِنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ فَوَاتِحَ سُورَةِ أَصْحَابِ الكَهْفِ قَالَ: يَخْرُجُ مَا بَيْنَ الشَّامِ وَالعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَشِمَالاً، يَا عِبَادَ اللهِ اثْبُتُوا، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا لَبْثُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ اليَوْمَ الَّذِي كَالسَّنَةِ أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلَاةُ يَوْمٍ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ

اقْدُرُوا لَهُ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا سُرْعَتُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: كَالغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ فَيَأْتِي القَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيُكَذِّبُونَهُ وَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَتَتْبَعُهُ أَمْوَالُهُمْ وَيُصْبِحُونَ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ، ثُمَّ يَأْتِي القَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ وَيُصَدِّقُونَهُ فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطِرَ فَتُمْطِرَ، وَيَأْمُرُ الأَرْضَ أَنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتَ، فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ كَأَطْوَلِ مَا كَانَتْ ذُرًا وَأَمَدِّهِ خَوَاصِرَ وَأَدَرِّهِ ضُرُوعًا،قَالَ: ثُمَّ يَأْتِي الخَرِبَةَ فَيَقُولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ فَيَنْصَرِفُ مِنْهَا فَيَتْبَعُهُ كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ، ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً شَابًّا مُمْتَلِئًا شَبَابًا فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جِزْلَتَيْنِ ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ يَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ يَضْحَكُ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ هَبَطَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ بِشَرْقِيِّ دِمَشْقَ عِنْدَ الْمَنَارَةِ البَيْضَاءِ بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ وَاضِعًا يَدَيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَّانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، قَالَ: وَلاَ يَجِدُ رِيحَ نَفْسِهِ، يَعْنِي أَحَدًا، إِلاَّ مَاتَ وَرِيحُ نَفْسِهِ مُنْتَهَى بَصَرِهِ، قَالَ: فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ فَيَقْتُلَهُ، قَالَ: فَيَلْبَثُ كَذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَ: ثُمَّ يُوحِي اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ حَوِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ فَإِنِّي قَدْ أَنْزَلْتُ عِبَادًا لِي لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، قَالَ: وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَهُمْ كَمَا قَالَ اللَّهُ: (وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ) قَالَ: فَيَمُرُّ أَوَّلُهُمْ بِبُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ فَيَشْرَبُ مَا فِيهَا ثُمَّ يَمُرُّ بِهَا آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ، ثُمَّ يَسِيرُونَ حَتَّى يَنْتَهُوا إِلَى جَبَلِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ قَتَلْنَا مَنْ فِي الأَرْضِ، فَهَلُمَّ فَلْنَقْتُلْ مَنْ فِي السَّمَاءِ، فَيَرْمُونَ بِنُشَّابِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرُدُّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ نُشَّابَهُمْ مُحْمَرًّا دَمًا، وَيُحَاصَرُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ يَوْمَئِذٍ خَيْرًا لأَحَدِهِمْ مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ اليَوْمَ، فَيَرْغَبُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ إِلَى اللهِ وَأَصْحَابُهُ، فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى مَوْتَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، وَيَهْبِطُ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَلاَ يَجِدُ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ وَقَدْ مَلأَتْهُ زَهَمَتُهُمْ وَنَتَنُهُمْ وَدِمَاؤُهُمْ، فَيَرْغَبُ عِيسَى إِلَى اللهِ وَأَصْحَابُهُ، فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ البُخْتِ، فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ بِالمَهْبِلِ وَيَسْتَوْقِدُ الْمُسْلِمُونَ مِنْ قِسِيِّهِمْ وَنُشَّابِهِمْ وَجِعَابِهِمْ سَبْعَ

سِنِينَ، وَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَطَرًا لاَ يُكَنُّ مِنْهُ بَيْتُ وَبَرٍ وَلاَ مَدَرٍ، فَيَغْسِلُ الأَرْضَ فَيَتْرُكُهَا كَالزَّلَفَةِ قَالَ: ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ أَخْرِجِي ثَمَرَتَكِ وَرُدِّي بَرَكَتَكِ فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ العِصَابَةُ الرُّمَّانَةَ، وَيَسْتَظِلُّونَ بِقَحْفِهَا وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى إِنَّ الفِئَامَ مِنَ النَّاسِ لَيَكْتَفُونَ بِاللِّقْحَةِ مِنَ الإِبِلِ، وَإِنَّ القَبِيلَةَ لَيَكْتَفُونَ بِاللِّقْحَةِ مِنَ البَقَرِ، وَإِنَّ الفَخِذَ لَيَكْتَفُونَ بِاللِّقْحَةِ مِنَ الغَنَمِ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا فَقَبَضَتْ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَيَبْقَى سَائِرُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ كَمَا تَتَهَارَجُ الحُمُرُ فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ.

واتە: لە نەواسی كوڕی سەمعانی كیلابیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: سەر لە بەیانیەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەدوور و درێژی باسی فیتنە و ئاژاوەی دەجالی بۆ كردین، دەنگی نزم دەكردەوە و دەنگی بەرزدەكردەوە بەشێوەیە وامان دەزانی ئەوەتا لەناو دارخورماكانی مەدینەدا، فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم هەستاین و بڵاوەمان لێ كرد، لەپاشدا گەڕاینەوە بۆ خزمەتی، شوێنەواری ترسان لە دەجالی بەروخسارمانەوە دی، فەرمووی: (چیتانە؟) وتی: وتمان: دوێنێ بەشێوەیە باسی دەجالت بۆ كردین، دەنگت نزم دەكردەوە و دەنگت بەرزدەكردەوە وامان دەزانی لەناو دارخورماكانی مەدینەدایە، فەرمووی: (من لەشتێ تر دەترسم غەیری دەجال كە زیانی هەبێ بۆتان، ئەگەر بێتو من لەناوتاندا بم خۆم بە بەڵگەوە بەرەنگاری دەبمەوە لە جیاتی ئێوە، ئەگەر منیش لەناوتاندا نەبووم ئەوە هەركەسە بۆ خۆی دەبێ بە بەڵگەوە رووبەرووی بێتەوەو گفتوگۆی لەگەڵ بكات و سەركەوێ، خوای گەورە دۆست و پارێزەری هەموو موسوڵمانێكە، گەنجێكی موو كرژی سەر ئاڵۆسكاویە، چاوێكی تروسكە ناكات، شێوەی لە (عبد العزى)ی كوڕی (قطن)

دەچێ، هەرکەس لەئێوە بینی و گەیشت بە دەجال با سەرەتای سورەتی (کهف) بخوێنێ ئەوە دەبێتە هۆی سەلامەتی و دەپارێزێ لە فیتنەی دەجال).

فەرمووی: (لەنێوان شام و عێراق دەردەکەوێت، بەڕاست بە چەپدا خراپەکاری و ئاژاوە و فیتنە بەرپا دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆڕاگربن)، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، چەنێ دەمێنێتەوە لەسەر زەویدا؟ فەرمووی: (چل رۆژ، رۆژێك وەك ساڵێك و، رۆژێك وەك مانگێك و، رۆژێك وەك هەفتەیەك، رۆژەکانی تریشی ئاسایی وەك رۆژەکانی ئێوە). وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەو رۆژەی وەك ساڵێکە ئایا نوێژی یەك رۆژی تێدا بەسە؟ فەرمووی: (نەخێر بە مەزەندە بۆی دیاری بکەن، هەموو بیست و چوار سەعاتێ پێنج نوێژی تێدا بکەن). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خێرایی رۆشتنی چۆنە لەسەر زەویدا؟ فەرمووی: (زۆر خێرایە وەك بارانی دەم با وایە، دەجال دەچێتە سەر هەندێ قەوم و تیرە بانگیان دەکات و دەڵێ من خوام ئەوانیش بڕوای پێ ناهێنن و بەرپەرچی دەدەنەوە و بەگوێی ناکەن، ئەویش بەجێیان دەهێڵێ، لەپاش ئەو دەکەونە قات و قڕی و گرانیەکی واوە رۆژیان لێ دەبێتەوە هیچیان بەدەستەوە نامێنێ، فەرمان دەکات بە ئاسمان باران دەبارێنێ، فەرمان دەکات بە زەوی شینایی دەڕوێنێ، جا وشتر و ماڵاتیان ئەوەندە تێر و تەسەل و قەڵەو دەبن و شیریان زۆر دەبێت لەبەر زۆری لەوەڕ). دەجال دەچێتە سەر هەندێ قەوم و تیرە بانگیان دەکات و دەڵێ من خوام ئەوانیش بڕوای پێ دەهێنن و بەگوێی دەکەن، فەرمان دەکات بە ئاسمان باران دەبارێنێ، فەرمان دەکات بە زەوی شینایی دەڕوێنێ، جا وشتر و ماڵاتیان ئەوەندە تێر و تەسەل و قەڵەو دەبن و شیریان زۆر دەبێت لەبەر زۆری لەوەڕ).

فەرمووی: (دەجال دەدات بەلای وێرانەیەکدا رادەبووری، پێی دەڵێ: ئەی

کەلاوە کۆن گەنجینەکەت دەرکە دەرەوە ئەویش بە گوێی دەکات، ئیتر هەرچی غەزنەی ناو ئەو کەلاوەیە وەك پورەی هەنگ چۆن شوێنی شاکەیان دەکەون ئەوانیش ئاوەها شوێنی دەجال دەکەون، لەپاشدا کوڕێکی گەنج کە لە هەرەتی لاویدایە دەجال بانگی دەکات و داوای لێ دەکات باوەڕی پێ بهێنێ بەلاّم ئەو بەدرۆی دەخاتەوە و باوەڕی پێ ناهێنێ، بە شمشێر لێی دەدات و دەیکات بە دووکەرتەوە، جا بانگی دەکاتەوە لاوەکە زیندوو دەبێتەوە و بە روویەکی گەش و دەم بە زەردەخەنەوە دێتەوە بۆ لای، جا دەجال خەریکی کاری خۆیەتی عیسای کوڕی مەریەم لە رۆژهەلاّتی دیمەشق لەلای منارە سپیەکە دادەبەزێت دوو دەست جلی لەبەردایە بە وەرس و بە زەعفەران رەنگ کراون، هەردوو لەپی خۆی لەسەر باڵی دوو مەلائیکە داناوە، ئەوەندە پاك و خاوێنە ئەڵێی تازە لە گەرماو خۆی شتوە و هاتۆتەدەرەوە کە سەر دادەنەوێنێ ئاوی لێ دەتکێ، کاتێ کە سەری بەرزدەکاتەوە وەك گۆی مرواری ئارەق لەڕووی هەڵدەنیشێ).

فەرمووی: (هەر کافرێ بۆنی هەناسەی عیسا بکات خێرا دەمرێت، لەکاتێکدا کە بۆنی هەتا چاو بڕ بکات دەڕوات). فەرمووی: عیسا دوای دەجال دەکەوێت هەتا لە (بَابِ لُدّ) پێی دەگات و دەیکوژێت). فەرمووی: (ئەوەندەی خوا بیەوێ دەمێنێتەوە)، فەرمووی: (لەپاشدا خوای گەورە نیگای بۆ دەنێرێ بەندەکانم دەرکەو بیانگەیەنە کێوی (طور)، چونکە بێگومان هەندێ لە بەندەکانم بەرەلاّکردوە کەس دەرەقەتیان نایە). فەرمووی: (ئینجا خوای گەورە یەئجوج و مەئجوج بەرەلاّ دەکات، ئیتر لە هەموو بەرزاییەکەوە بە تەکان دێن و جمەیان دێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ**). فەرمووی: (کە سەرەتایان دەگاتە دەریای تەبەریە هەموو ئاوەکەی دەخۆنەوە و چۆڕی لێ دەبڕن، ئەوانەی دواوە کە دێن دەڵێن: جارێ لە جاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە، لەپاشدا دەڕۆن

هەتا دەگەنە (بیت المقدس) دەڵێن: ئەوەی لەسەر زەویدا بوو کوشتمان، وەرن با بڕۆین ئەوانەش بکوژین کە لە ئاسمانن، سەری تیرەکانیان هەڵدەدەن بۆ ئاسمان، خوای گەورە سەری رمەکانیان بە خوێن سور دەکات و بۆیان دەگەڕێنێتەوە، گەمارۆی عیسا و هاوەڵانی دەدەن بە شێوەیە سەرەگایە لەوڕۆژەدا بۆ یەکێ لەوان چاکترە لەسەد دینار بۆ یەکێ لەئێوە لە ئەمڕۆدا). فەرمووی: (عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵانی بەکوڵ لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە لەناویان بەرێ و رزگاریان بکات لەدەستیان).

فەرمووی: (جا خوای گەورە کرمێکیان بۆ دەنێرێ دەداتە ملیان بەیەکجار هەرهەموویان لەناودەچن وەك چۆن یەك کەس لەناو دەچێت). فەرمووی: (جا عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵانی لە کێوی (طور) دێنەخوارەوە ئەوەندەی بستێ خاك نەماوە پیس نەبووبێ بە خوێن و گۆشتی ئەوان دەبینن بۆگەنی پیسی جەستەی ئەوان سەرزەوی گرتۆتەوە). فەرمووی: (عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵانی بەکوڵ لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە رزگاریان بکات لەو بۆگەنە). فەرمووی: (جا خوای گەورە باڵندەیەکی گەورەیان بۆ دەنێرێ وەك گەردنی وشتری مل درێژ کەلاکەکانیان هەڵدەگرن و لەدوور فڕێیان دەدەنە شوێنێکی زۆر قوڵی زەوی، موسوڵمانان حەوت ساڵ بە تیر و کەوان و کەرەستە جەنگیەکانی ئەوان ئاگر دەکەنەوە و دەیانسوتێنن).

فەرمووی: (جا خوای گەورە بارانێکی رەحمەت دەبارێنێ و هەموو خانوبەرەو رەشماڵەکان دەگرێتەوە و سەرزەوی وەك ئاوێنەی ساف پاك پاك دەکاتەوە). فەرمووی: (لەپاشدا بە زەوی دەوترێت: بێرەوە بەر و دەستبکەرەوە بە پیت و فەڕ خستنەوە و بەروبووم پێشکەشی مرۆڤەکان بکە، وای لێ دێ کۆمەڵێ لەیەك هەنار تێردەخۆن و لەسێبەری قاوغەکەیا دادەنیشن و دەحەسێنەوە، ئاژەڵە شیردەرەکان

وەها پیت و بەرەکەتیان تێ دەکەوێ شیری وشترێکی تازە زاو بەشی کۆمەڵێ خەڵکی زۆر دەکات، ژەکی مانگایەکی تازە زاو بەشی هۆزێ دەکات، فرۆی ژەمی مەڕێ یان بزنێکی دۆشەنی بەشی تیرەیە دەکات، ئیتر بەو شێوەیە لەو خێر و خۆشیەدا دەمێننەوەو لەکاتێکدا لەسەر ئەو حاڵەتەن، خوای گەورە بایەکی خۆش هەڵدەکات رۆحی هەرچی باوەڕدارە دەکێشێ، خەڵکە خراپ و گەندەڵەکان دەمێننەوە وەك کەرکەل و دێڵە بە باو سواری یەکتر دەبن و لەیەکتر دەپەڕن، ئیتر بەسەر ئەواندا قیامەت هەڵئەسێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتی دەجال

٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الدَّجَّالِ

٢٢٤١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الدَّجَّالِ، فَقَالَ: أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ أَلاَ وَإِنَّهُ أَعْوَرُ عَيْنُهُ الْيُمْنَى كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ. وَفِي البَاب عَنْ سَعْدٍ، وَحُذَيْفَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَسْمَاءَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَعَائِشَةَ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَالفَلَتَانِ بْنِ عَاصِمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی سیفەتی دەجال لە پێغەمبەریان صلى الله عليه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (هۆشیاربن پەروەردگارتان کوێر نییە، ئاگاداربن دەجال چاوێکی کوێرە چاوی راستی وەك دەنکە ترێ دەرپۆقیوە رووناکی تێدا نەماوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ناچێتە شاری مەدینەوە

٦١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّجَّالِ لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ

٢٢٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الخُزَاعِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَأْتِي الدَّجَّالُ الْمَدِينَةَ فَيَجِدُ الْمَلاَئِكَةَ يَحْرُسُونَهَا فَلاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَفَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَسَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، وَمِحْجَنٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (دەجال دێ دەیەوێت بچێتە ناو شاری مەدینەوە بەڵام مەلائیکە پاسەوانی دەکەن ئیتر ناتوانێ بچێتە ناویەوە، بە ویستی خوای گەورە دەجال و نەخۆشی تاعون ناچنە شاری مەدینە).

٢٢٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالكُفْرُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، وَالسَّكِينَةُ لأَهْلِ الغَنَمِ، وَالفَخْرُ وَالرِّيَاءُ فِي الفَدَّادِينَ أَهْلِ الخَيْلِ وَأَهْلِ الوَبَرِ، يَأْتِي الْمَسِيحُ إِذَا جَاءَ دُبُرَ أُحُدٍ صَرَفَتِ الْمَلاَئِكَةُ وَجْهَهُ قِبَلَ الشَّامِ وَهُنَالِكَ يَهْلَكُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (یەمەن سەرچاوەی ئیمان و باوەڕە، سەرچاوەی کوفر و بێ باوەڕی لەلای ڕۆژهەڵاتەوەیە، هێمنی و ئارامی پیشەی خاوەن مەڕ و ماڵاتە، شانازیکردن و ڕووپامایی پیشەی دەنگ زلەکانە

ئەوانەی هات و هاوار دەکەن خاوەن ئەسپ و گەلە وشتر و خاوەن رەشماڵەکانن، دەجال دێتە پشت چیای ئوحود مەلائیکە رووی وەردەچەرخێنن بەرەو شام، لەوێ سەری تیادەچێت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی کوشتنی دەجال لەلایەن عیساوە

٦٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ الدَّجَّالَ

٢٢٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ الأَنْصَارِيَّ يُحَدِّثُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ الأَنْصَارِيِّ، مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَمِّي مُجَمِّعَ ابْنَ جَارِيَةَ الأَنْصَارِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: يَقْتُلُ ابْنُ مَرْيَمَ الدَّجَّالَ بِبَابِ لُدٍّ. وَفِي البَاب عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَنَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأَبِي بَرْزَةَ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَكَيْسَانَ، وَعُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ، وَجَابِرٍ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَسَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، وَالنَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ، وَعَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموویت: (عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لەسەر بێ دوای دەجال دەکەوێت هەتا لە (بَابِ لُدّ) پێی دەگات و دەیکوژێت).

٢٢٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأَعْوَرَ الكَذَّابَ، أَلاَ إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ: كَافِرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (من هۆشیارتان

دەکەمەوە، سەرجەم پێغەمبەران گەلەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە مەترسی دەجالی کوێری درۆزن، ئاگاداربن دەجال کوێرە، بێگومان خوای گەورە بەو شێوەیە نیە، لەنێوان هەردوو چاوەکانیدا نوسراوە: کافر).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیبنو صەییاد

### ٦٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ذِكْرِ ابْنِ صَيَّادٍ

٢٢٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: صَحِبَنِي ابْنُ صَائِدٍ إِمَّا حُجَّاجًا وَإِمَّا مُعْتَمِرِينَ فَانْطَلَقَ النَّاسُ وَتُرِكْتُ أَنَا وَهُوَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ بِهِ اقْشَعْرَرْتُ مِنْهُ وَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ فِيهِ، فَلَمَّا نَزَلْتُ قُلْتُ لَهُ: ضَعْ مَتَاعَكَ حَيْثُ تِلْكَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَأَبْصَرَ غَنَمًا فَأَخَذَ القَدَحَ فَانْطَلَقَ فَاسْتَحْلَبَ، ثُمَّ أَتَانِي بِلَبَنٍ فَقَالَ لِي: يَا أَبَا سَعِيدٍ، اشْرَبْ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَشْرَبَ مِنْ يَدِهِ شَيْئًا لِمَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهِ، فَقُلْتُ لَهُ: هَذَا اليَوْمُ يَوْمٌ صَائِفٌ وَإِنِّي أَكْرَهُ فِيهِ اللَّبَنَ، قَالَ لِي: يَا أَبَا سَعِيدٍ، هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلاً فَأُوثِقَهُ إِلَى شَجَرَةٍ ثُمَّ أَخْتَنِقَ لِمَا يَقُولُ النَّاسُ لِي وَفِيَّ، أَرَأَيْتَ مَنْ خَفِيَ عَلَيْهِ حَدِيثِي فَلَنْ يَخْفَى عَلَيْكُمْ؟ أَلَسْتُمْ أَعْلَمَ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ؟ أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ كَافِرٌ وَأَنَا مُسْلِمٌ؟ أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ عَقِيمٌ لاَ يُولَدُ لَهُ وَقَدْ خَلَّفْتُ وَلَدِي بِالمَدِينَةِ؟ أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَحِلُّ لَهُ مَكَّةُ وَالمَدِينَةُ؟ أَلَسْتُ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ ذَا أَنْطَلِقُ مَعَكَ إِلَى مَكَّةَ، فَوَاللَّهِ مَا زَالَ يَجِيءُ بِهَذَا حَتَّى قُلْتُ فَلَعَلَّهُ مَكْذُوبٌ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، وَاللَّهِ لَأُخْبِرَنَّكَ خَبَرًا حَقًّا، وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْرِفُهُ وَأَعْرِفُ وَالِدَهُ وَأَعْرِفُ أَيْنَ هُوَ السَّاعَةَ مِنَ الأَرْضِ، فَقُلْتُ: تَبًّا لَكَ سَائِرَ اليَوْمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لەمەدینەوە دەرچوین بۆ مەککە بۆ حەج یان بۆ عومرە ئیبنو صائیدمان لەگەڵ

بوو، لە قۆناغێ لاماندا خەڵکەکە هەریەکە چوون بەلایەکدا من و ئیبنو صائید پێکەوەماینەوە، کاتێ کە خۆم بە تەنیا لەگەڵی بووم ترس و سامێکی زۆرم لێ نیشت، بەهۆی ئەوەوە کە خەڵك لەبارەیەوە دەدوان، کاتێ کە دابەزی پێم وت: ئەوە بۆ کەلوپەلەکەتەختەدا دانانێیت، ئەویش لەوێ داینا، فەرمووی: رانە مەڕێکی دی چوو جامێ شیری بۆ هێنام، پێی وتم: ئەی ئەبا سەعید بخۆرەوە، منیش پێم خۆش نەبوو شتی دەستی ئەو بخۆمەوە بەهۆی ئەوەوە کە خەڵك لەبارەیەوە دەدوان، بۆیە وتم: ئەمڕۆ رۆژێکی زۆر گەرمە، شیریش گەرمە ناخۆمەوە، پێی وتم: ئەی ئەبو سەعید خەریکە لەداخی قسەو قسەڵۆکی خەڵك پەتێ هەڵخەم لەو دارەو خۆمی پێ بخکێنم، ئەی ئەبو سەعید هەموو کەسێ فەرمایشتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم لێ ون بێ، ئێوە لێتان ون نابێ؟ ئێوە زاناترین کەس نین بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەی کۆمەڵی ئەنصار، ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیفەرموو: (دەجال کافرە)، خۆ من موسوڵمانم، مەگەر نەیفەرموو: (دەجال نەزۆکە و منداڵی نابێ)، خۆ من منداڵم هەیە و لەمەدینە بەجێم هێشتوون، مەگەر نەیفەرموو: (دەجال بۆی نیە بچێتە مەککە و مەدینەوە و ناچێتە ناویانەوە)، مەگەر من خەڵکی مەدینە نیم ئەوەتا لەمەدینەوە هاتووم لەگەڵ تۆ بچم بۆ مەککە؟ سوێند بە (الله)، ئەوەندە سکاڵای خۆی کرد هەتا وتم: لەوانەیە لەبارەیەوە درۆبکەن، لەپاشدا وتی: ئەی ئەبو سەعید، سوێند بە (الله)، هەواڵێکی راستت پێ رادەگەیەنم، سوێند بە (الله)، من دەیناسم، باوکیشی دەناسم و دەزانم ئێستا لەکوێیە، وتم: دەی هەموو رۆژەکە و لەمڕۆ بەدواوە لەناوچیت و ببی بە پەندی زەمانە — تۆ چۆن بانگەشەی عیلمی غەیب دەکەیت -.

٢٢٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: لَقِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْنَ صَائِدٍ فِي

بَعْضِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ فَاحْتَبَسَهُ وَهُوَ غُلَامٌ يَهُودِيٌّ وَلَهُ ذُؤَابَةٌ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَقَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْتَ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: آمَنْتُ بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَرَى؟ قَالَ: أَرَى عَرْشًا فَوْقَ الْمَاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَرَى عَرْشَ إِبْلِيسَ فَوْقَ الْبَحْرِ، قَالَ: فَمَا تَرَى؟ قَالَ: أَرَى صَادِقًا وَكَاذِبِينَ أَوْ صَادِقِينَ وَكَاذِبًا، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لُبِسَ عَلَيْهِ فَدَعَاهُ. وَفِي الْبَاب عَنْ عُمَرَ، وَحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَجَابِرٍ، وَحَفْصَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەری لەگەڵ بوو لەسەر رێی مەدینە ئیبنو صائیدی دی، رایگرت غولامێکی جولەکە بوو پێشی سەری مووی لولی زۆری پێوە بوو، فەرمووی: (شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم؟) ئەویش وتی: ئەی تۆ شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (باوەڕم هەیە بە خوا و بە مەلائیکەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە رۆژی دوایی). پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چی دەبینی؟) وتی: دەبینم عەرش لەسەر ئاوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەبینی عەرشی شەیتان لەسەر دەریایە؟) فەرمووی: (چی دەبینی؟) وتی: هەواڵێکی راست و دوو هەواڵی درۆم بۆ دێ یان وتی: دوو هەواڵی راست و هەواڵێکی درۆم بۆ دێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لێی تێك چووە). ئیتر وازی لێ هێنا.

٢٢٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الْجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَمْكُثُ أَبُو الدَّجَّالِ وَأُمُّهُ ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَهُمَا وَلَدٌ ثُمَّ يُولَدُ لَهُمَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً، تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ، ثُمَّ نَعَتَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَوَيْهِ، فَقَالَ: أَبُوهُ طِوَالٌ ضَرْبُ اللَّحْمِ كَأَنَّ أَنْفَهُ مِنْقَارٌ، وَأُمُّهُ فِرْضَاخِيَّةٌ طَوِيلَةُ الثَّدْيَيْنِ فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: فَسَمِعْنَا بِمَوْلُودٍ فِي الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ فَذَهَبْتُ أَنَا وَالزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبَوَيْهِ، فَإِذَا نَعْتُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِمَا، فَقُلْنَا: هَلْ لَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالاَ: مَكَثْنَا ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَنَا وَلَدٌ، ثُمَّ وُلِدَ لَنَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً، تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ، قَالَ: فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمَا فَإِذَا هُوَ مُنْجَدِلٌ فِي الشَّمْسِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ وَلَهُ هَمْهَمَةٌ، فَتَكَشَّفَ عَنْ رَأْسِهِ فَقَالَ: مَا قُلْتُمَا؟ قُلْنَا: وَهَلْ سَمِعْتَ مَا قُلْنَا؟ قَالَ: نَعَمْ، تَنَامُ عَيْنَايَ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی ئەبو بەکرەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (باوك و دایکی دەجال سی ساڵ دەمێننەوە منداڵیان نابێ، لەپاشدا کوڕێکیان دەبێ کوێرە، زیان بەخشترین شتە و سوودی زۆر کەم دەبێ، چاوەکانی دەخەون بەڵام دڵی ناخەوێ). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەسفی باوك و دایکی دەجالی بۆ کردین و فەرمووی: (باوکی باڵای زۆر بەرز و گۆشتی کەمە لوتی وەك دەنوکی باڵدارەو درێژە، دایکی ئافرەتێکە مەمکەکانی زۆر درێژ و گەورەن). ئەبو بەکرە فەرمووی: بیستمان جولەکەیە لە مەدینە لەدایك بووە من و زوبێری کوڕی عەوام ڕۆشتین هەتا گەیشتینە لای دایك و باوکی، سەیردەکەین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن وەسفی کردبوون ڕێك بەو شێوەیەن، وتمان: کوڕتان هەیە؟ وتیان: سی ساڵە منداڵمان نەبووە، ئێستا کوڕێکمان بووە، کوێرە، زیان بەخشترین شتە و سوودی زۆر کەمە، چاوەکانی دەخەون بەڵام دڵی ناخەوێ، ئەبو

بەکرە فەرمووی: لەوێ لەلای ئەوان دەرچووین، غولامەکەمان بینی پۆشاکێکی قەیفەی لەبەردا بوو لەبەر هەتاو راکشابوو پرخەی دەهات، سەری دەرخست و وتی: چیتان وت؟ وتمان: گوێت لێ بوو وتمان چی؟ وتی: بەڵێ، چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ.

٢٢٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِابْنِ صَيَّادٍ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الغِلْمَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ وَهُوَ غُلاَمٌ، فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ظَهْرَهُ بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ، ثُمَّ قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَشْهَدُ أَنْتَ أَنِّي رَسُولُ اللهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: آمَنْتُ بِاللهِ وَبِرُسُلِهِ ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا يَأْتِيكَ؟ قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا وَخَبَأَ لَهُ (يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ) فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ائْذَنْ لِي فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ يَكُ حَقًّا فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لاَ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: يَعْنِي الدَّجَّالَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)یان لەناودا بوو دایان بەلای ئیبنو صەیاددا لەگەڵ دەستەیە لە منداڵان یاری دەکرد لە قەڵای هۆزی مەغالە - کە هۆزێ بوون لە جولەکەکان - ،

ئیبنو صەییاد نزیکی باڵغ بوونی بوو، بە خۆی نەزانی هەتا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەپشتەوە دەستی کێشا بەپشتی دا، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم؟) ئیبنو صەییاد سەیری کردو وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێنەوارەکانی، لەپاشدا ئیبنو صەییاد بە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم وت: ئایا تۆ شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (باوەڕم هەیە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی). پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (لە هەواڵی غەیب چیت بۆ دێ؟) وتی: هەواڵی راست و هەواڵی درۆشم بۆ دێ. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (سەریان لێشێواندویت). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (من شتێکم بۆ تۆ گرتۆتە دڵم بزانم تۆ دەیزانیت؟). کە ئەم ئایەتە بوو: (**يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ**). سورة الدخان : ١٠. واتە: رۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ.

ئیبنو صائید وتی: ئەوە دوخخە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (چغە! رادەت ناکەوێ پلەو پایەی خۆت - کە کاهینیە — سەرکەویت). پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رێگەم بدە با بدەم لە ملی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر دەججال بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژیت، ئەگەر ئەویش نەبێت خێر لە کوشتنی دا نیە).

٦٤ - بَابٌ

٢٢٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا عَلَى الأَرْضِ نَفْسٌ

مَنْفُوسَةٌ ـ يَعْنِي الْيَوْمَ ـ تَأْتِي عَلَيْهَا مِائَةُ سَنَةٍ. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَبُرَيْدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ نەفسێ نییـە ئـەمڕۆ لەسـەر زەوی‌دا بێ لەپاش سەد ساڵی تر بمێنێ).

٢٢٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلاَةَ العِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَهِلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِلْكَ فِيمَا يَتَحَدَّثُونَهُ مِنْ هَذِهِ الأَحَادِيثِ عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ، وَإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ اليَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ، يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَنْخَرِمَ ذَلِكَ القَرْنُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: شەوێکیان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لـە کۆتـایی ژیانیـدا بەرنوێژی نوێژی عیشای بە کۆمەڵ بۆ کردین کاتێ کە سەلامی دایـەوە هەسـتایەوە فەرمووی: (خۆ ئەم شەوەتان دەبینن! هەر یەکێ لەئێوە کە ئەم شەو لەم مزگەوتەدا ئامادەیە سەد ساڵی تر کەستان نامێنێ بەسـەر ئـەم زەویـەوە هـەمووتان دەمـرن). ئیبنو عومەر وتی: خەڵکەکە بە هەڵە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم تێگەیشتن وا حـاڵی بـوو بـوون کـە فەرموویـەتی سـەد سـاڵی تـر قیامەت بەرپادەبێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسـلم مەبەسـتی ئـەوە بـوو تـەمـەن کورتە، هیچ کـەس لەوانـەی کـە ئـەم رۆژە لەسـەر زەویـن لـەدوای سـەد سـاڵی تـر کەسیان نامێنێ.

## دەربارەی نەهی کردن لە جنێودان بە با

## ٦٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ سَبِّ الرِّيَاحِ

٢٢٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ ذَرٍّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَسُبُّوا الرِّيحَ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مَا تَكْرَهُونَ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ الرِّيحِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَخَيْرِ مَا أُمِرَتْ بِهِ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الرِّيحِ وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُمِرَتْ بِهِ.

وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَعُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جنێو بە با مەدەن، ئەگەر لە با شتێکتان دی بەدڵتان نەبوو بڵێن: خودایە! دوای خێری ئەم بایەت لێ دەکەین، وە خێری ئەوەی لەناویدایە، وە خێری ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە و بۆی ئامادەکراوە، خودایە! پەنات پێ دەگرین لە خراپەی ئەم بایە، وە لە خراپەی ئەوەی لەناویدایە، وە لە خراپەی ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە و بۆی ئامادەکراوە).

## ٦٦- بَابٌ

٢٢٥٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَضَحِكَ فَقَالَ: إِنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ حَدَّثَنِي بِحَدِيثٍ فَفَرِحْتُ بِهِ فَأَحْبَبْتُ أَنْ

أُحَدِّثَكُمْ، حَدَّثَنِي أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ فِلَسْطِينَ رَكِبُوا سَفِينَةً فِي البَحْرِ فَجَالَتْ بِهِمْ حَتَّى قَذَفَتْهُمْ فِي جَزِيرَةٍ مِنْ جَزَائِرِ البَحْرِ، فَإِذَا هُمْ بِدَابَّةٍ لَبَّاسَةٍ نَاشِرَةٍ شَعْرَهَا، فَقَالُوا: مَا أَنْتِ؟ قَالَتْ: أَنَا الجَسَّاسَةُ، قَالُوا: فَأَخْبِرِينَا، قَالَتْ: لاَ أُخْبِرُكُمْ وَلاَ أَسْتَخْبِرُكُمْ، وَلَكِنِ ائْتُوا أَقْصَى القَرْيَةِ فَإِنَّ ثَمَّ مَنْ يُخْبِرُكُمْ وَيَسْتَخْبِرُكُمْ، فَأَتَيْنَا أَقْصَى القَرْيَةِ فَإِذَا رَجُلٌ مُوثَقٌ بِسِلْسِلَةٍ، فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ؟ قُلْنَا: مَلأَى تَدْفُقُ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنِ البُحَيْرَةِ؟ قُلْنَا: مَلأَى تَدْفُقُ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ الَّذِي بَيْنَ الأُرْدُنِّ وَفِلَسْطِينَ هَلْ أَطْعَمَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنِ النَّبِيِّ هَلْ بُعِثَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَخْبِرُونِي كَيْفَ النَّاسُ إِلَيْهِ؟ قُلْنَا سِرَاعٌ، قَالَ: فَنَزَّى نَزْوَةً حَتَّى كَادَ، قُلْنَا: فَمَا أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا الدَّجَّالُ، وَإِنَّهُ يَدْخُلُ الأَمْصَارَ كُلَّهَا إِلاَّ طَيْبَةَ، وَطَيْبَةُ الْمَدِينَةُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ.

واتە: لە (فَاطِمَة)ی کچی قەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە سەر مینبەر پێدەکەنی فەرمووی: (بێگومان تەمیمی داری فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە دڵم زۆر پێی خۆش بووە، بۆیە حەز دەکەم بۆتانی باس بکەم: تەمیم بۆی باس کردم کە جارێ چەند کەسێ لە خەڵکی فەلەستین سواری پاپۆڕێکی گەورە دەبن لەدەریادا، شەپۆلی دەریا دەیانبات و دەیانهێنێ هەتا سەرەنجام لە دوورگەیەکدا پاپۆڕەکە لەنگەر دەگرێت، دەعبایەکی کوڵکنی توکنیان توش دەبێت مووەکانی پەرش و بڵاوبوون، دەڵێن: تۆ کێیت؟ وتی: من جەساسەم، وتیان: هەواڵمان پێ رابگەیەنە، وتی: نە هەواڵتان دەدەمێ و نە لێتان دەپرسم، بەڵام برۆن بۆ لای ئەو پیاوە کە لەناو ئەو دێرەدایە، چونکە بەڕاستی ئەو زۆر تامەزرۆی هەواڵی ئێوەیە، ئەوانیش خێرا رۆشتین هەتا چونە ناو دێرەکەوە، لەوێ زەلامێکی زەبەلاحیان بینی هەرگیز مرۆڤی ئەوەندە زلیان نەدیبوو، زۆر بە توندی کەلەپچە کرابوو، هەردوو دەستی کەلەپچە

کرابوون بە ملیەوە، جا پرسیاری لیّ کردن دەربارەی باخە خورماکانی بەیسان کە لەنێوان ئەردەن و فەلەستین دایە و، (عین زغر) کە شوێنێکە لە شام روەکی کەمە، هەروەها دەربارەی دەریای تەبەری و دەربارەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لیّ کردن، کە ئایا رەوانە کراوە یان نا، خەڵك بەرەو رووی دەچن؟ ئەوانیش وەڵامیان دایەوە بەڵێ ئاوەکەی هەڵدەقوڵێ و زۆرە بە ئاوەکەی خەڵکەکە کشتوکاڵی زۆری تێدا دەکەن و داردرەختی زۆریان لیّ رواندووە، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم روانەکراوە و خەڵکیش خێرا بەرەڕووی دەچن و موسەڵمان دەبن، قەڵەمبازێکی دا، وتمان، تۆ کێی؟ وتی: بێگومان دەجال بوو، دەچێتە هەموو شوێنێکەوە جگە لە مەدینە.

٦٧ - بَابٌ

٢٢٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ جُنْدَبٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ قَالُوا: وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قَالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ البَلاَءِ لِمَا لاَ يُطِيقُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (حذیفة)وە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ موسوڵمانێ رەوا نییە خۆی زەلیل بکات، وتیان: چۆن خۆی زەلیل دەکات؟ فەرمووی: (خۆی دەخاتە ناو داوی بەڵایەکەوە و بەرەگەی ناگرێت).

٦٨ - بَابٌ

٢٢٥٥ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: انْصُرْ أَخَاكَ

ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، نَصَرْتُهُ مَظْلُومًا فَكَيْفَ أَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: تَكُفُّهُ عَنِ الظُّلْمِ، فَذَاكَ نَصْرُكَ إِيَّاهُ. وَفِي البَاب عَنْ عَائِشَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (براکەت سەرخە نیتر ستەمکاربێ یان ستەم لێ کراو). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! سەرخستنی ستەم لێ کراو شتێکی ئاشکرایە، ئەی سەرخستنی ستەمکار چۆنە؟ فەرمووی: (دەستی بگرن با ستەم نەکات، ئەوە سەرخستنیەتی).

٦٩ - بَابٌ

٢٢٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنْ وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ سَكَنَ البَادِيَةَ جَفَا، وَمَنْ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ، وَمَنْ أَتَى أَبْوَابَ السُّلْطَانِ افْتَتَنَ وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الثَّوْرِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی لە دەشتودەر و چۆڵەوانییدا بژی نەزان و دڵڕەق دەبێ، ئەوەی شوێن ڕاوکردن بکەوێت غافڵ و بێ ئاگا دەبێ لە پەرستشەکان، ئەوە پەنا بباتە بەر ماڵی فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران تووشی بەڵاو فیتنە دەبێ).

٧٠ - بَابٌ

٢٢٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ يُحَدِّثُ،

عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّكُمْ مَنْصُورُونَ وَمُصِيبُونَ وَمَفْتُوحٌ لَكُمْ، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلْيَتَّقِ اللَّهَ وَلْيَأْمُرْ بِالمَعْرُوفِ وَلْيَنْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (بێگومان ئێوە سەردەکەون و غەنیمەتی زۆرتان بەردەکەوێت و وڵات و شوێنی زۆر ڕزگاردەکەن، هەرکەس لەئێوە گەیشتە ئەو کاتە با لەخوا بترسێت و فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە، هەرکەس بەناوی منەوە درۆ بکات با جێگەیە لەناو ئاگردا بۆ خۆی دابنێ).

٧١ - بَابٌ

٢٢٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَحَمَّادٍ، وَعَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، سَمِعُوا أَبَا وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ مَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الفِتْنَةِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَنَا، قَالَ حُذَيْفَةُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ بِالمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ فَقَالَ عُمَرُ: لَسْتُ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ، وَلَكِنْ عَنِ الفِتْنَةِ الَّتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ البَحْرِ؟ قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا، قَالَ عُمَرُ: أَيُفْتَحُ أَمْ يُكْسَرُ؟ قَالَ: بَلْ يُكْسَرُ، قَالَ: إِذًا لَا يُغْلَقُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ قَالَ أَبُو وَائِلٍ فِي حَدِيثِ حَمَّادٍ: فَقُلْتُ لِمَسْرُوقٍ: سَلْ حُذَيْفَةَ عَنِ البَابِ، فَسَأَلَهُ فَقَالَ: عُمَرُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (حذيفة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کێ لە ئێوە ئەوەی لەبەرکردووە کە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی فیتنە و ئاژاوە فەرموویەتی؟ (حذیفة) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: فیتنەی پیاو بەرامبەر بە خانەوادە و کەسوکار و منداڵەکانی و دراوسێکانی نوێژ و ڕۆژوو چاکە و خێرکردن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەبنە کەفارەتیان و دەیانسڕنەوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەوبارەوە پرسیارت لێ ناکەم، بەڵکو دەربارەی ئەو فیتنە و ئاژاوە پرسیارت لێ دەکەم وەك هەڵچون و شەپۆلی زۆر بەهێزی دەریاکان شەپۆل دەدات، (حذیفة) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران نێوان و تۆ ئەو فیتنە و ئاژاوە دەرگایەکی داخراوە تا تۆ ماویت هیچی لێ نایەتەدەرەوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: تێك دەشکێنرێ، (حذیفة) فەرمووی: بەڵێ دەشکێنرێ، فەرمووی: کەواتە تا ڕۆژی قیامەت ئەو دەرگایە داناخرێتەوە.

## ٧٢ - بَابٌ

٢٢٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، عَنْ مِسْعَرٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَاصِمٍ العَدَوِيِّ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ تِسْعَةٌ خَمْسَةٌ وَأَرْبَعَةٌ أَحَدُ العَدَدَيْنِ مِنَ العَرَبِ وَالآخَرُ مِنَ العَجَمِ فَقَالَ: اسْمَعُوا، هَلْ سَمِعْتُمْ أَنَّهُ سَيَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ؟ فَمَنْ دَخَلَ عَلَيْهِمْ فَصَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الحَوْضَ، وَمَنْ لَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهِمْ وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ وَلَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ وَهُوَ وَارِدٌ عَلَيَّ الحَوْضَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ مِسْعَرٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ قَالَ هَارُونُ: فَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَاصِمٍ العَدَوِيِّ، عَنْ

كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، قَالَ هَارُونُ: وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَلَيْسَ بِالنَّخَعِيِّ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ مِسْعَرٍ. وَفِي البَابِ عَنْ حُذَيْفَةَ.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان ئێمە نۆ کەس بووین پێنج عەرەب و چوار عەجەم بووین، یان بە پێچەوانەوە چوار عەرەب و پێنج عەجەم بووین، فەرمووی: (گوێ بگرن، ئایا گوێتان لێیە لەدوای من فەرمانڕەوا و کاربەدەستانێ پەیدا دەبن، هەرکەسێ بچێ بۆ لایان درۆیان بە ڕاست بزانێ، یارمەتیان بدات لەسەر ستەمکردن، ئەوە لەسەر سوننەت و ڕێبازی من نیە، منیش لەسەر ڕێبازی ئەو نیم، لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر حەوزی کەوسەر پێشوازی لێ ناکەم، وە هەرکەسێ نەچێ بۆ لایان درۆیان بە ڕاست نەزانێ، یارمەتیان نەدات لەسەر ستەمکردن، ئەوە لەسەر سوننەت و ڕێبازی منە، منیش لەسەر ڕێبازی ئەوم، لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر حەوزی کەوسەر پێشوازی لێ دەکەم).

٧٣ - بَابٌ

٢٢٦٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى الفَزَارِيُّ ابْنُ بِنْتِ السُّدِّيِّ الكُوفِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ شَاكِرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَعُمَرُ بْنُ شَاكِرٍ شَيْخٌ بَصْرِيٌّ قَدْ رَوَى عَنْهُ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (زەمانێ دێتە پێشەوە ئەو كەسەی لەو سەردەمەدا ئارام بگرێت لەسەر دینەكەی و دینەكەی بپارێزێ وەك ئەو كەسە وایە پشكۆی ئاگر بەدەستەوە بگرێ).

٧٤ - بَابٌ

٢٢٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكِنْدِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا مَشَتْ أُمَّتِي بِالمُطَيْطِيَاءِ وَخَدَمَهَا أَبْنَاءُ الْمُلُوكِ أَبْنَاءُ فَارِسَ وَالرُّومِ سُلِّطَ شِرَارُهَا عَلَى خِيَارِهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَاهُ أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ. حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ وَلاَ يُعْرَفُ لِحَدِيثِ أَبِي مُعَاوِيَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَصْلٌ، إِنَّمَا الْمَعْرُوفُ حَدِيثُ مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ، وَقَدْ رَوَى مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ هَذَا الحَدِيثَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ ئومەتەكەم بە خۆبادانەوە رێگەیان كردوو لەكاتی رۆشتندا دەستیان درێژ كردوو رایان وەشاند، وە نەوەی پاشاكان و نەوەی رۆم و فارس بوونە خزمەتكاریان ئەوكاتە پیاو خراپەكانیان زاڵ دەبن بەسەر پیاو چاكەكانیاندا).

٧٥ - بَابٌ

٢٢٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: عَصَمَنِي اللَّهُ بِشَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا هَلَكَ كِسْرَى، قَالَ: مَنْ اسْتَخْلَفُوا؟ قَالُوا: ابْنَتَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَتْ عَائِشَةُ يَعْنِي البَصْرَةَ ذَكَرْتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَصَمَنِي اللَّهُ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو بەکرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خوای گەورە پاراستمی - لەوەی پەیوەندی بکەم بە خاوەنی وشترەکەوە واتە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ بۆ جەنگی جەمەل- بەهۆی فەرمایشتێکەوە بوو کە بیستبووم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کاتێ کیسرا سەری تیاچوو، فەرمووی: (کێ بوو بە جێنشینی واتە کێ بوو بە پاشای فارس؟). وتیان: کچەکەی، فەرمووی: (هەر قەومێ ئافرەت بێ بە کاربەدەست و فەرمانڕەوایان سەرکەوتوو نابن)، ئەبو بەکرە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: کاتێ عائیشە رەزای خوای لێ بێ گەیشتە شاری بەسرە فەرمایشتیەکەی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بۆ گێڕایەوە، خوای گەورە بەهۆی ئەو فەرمایشتەوە پاراستمی لەو جەنگە. ▯ کاتێ کە شیرویەی کوڕی کیسرا باوکی خۆی کوشت هەموو براکانی خۆشی کوشت بۆ ئەوەی کەس مونافسی نەبێت و خۆی لەجێی باوکی حوکم بکات، شیرویەش دەرمان خواردکراو لەپاش شەش مانگ مرد، ئیتر بورانی کچی بوو بە پاشای فارس - .

٧٦ - بَابٌ

٢٢٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَفَ عَلَى نَاسٍ جُلُوسٍ، فَقَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِكُمْ مِنْ شَرِّكُمْ؟ قَالَ: فَسَكَتُوا، فَقَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنَا بِخَيْرِنَا مِنْ شَرِّنَا، قَالَ: خَيْرُكُمْ مَنْ يُرْجَى خَيْرُهُ وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ، وَشَرُّكُمْ مَنْ لاَ يُرْجَى خَيْرُهُ وَلاَ يُؤْمَنُ شَرُّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: خەڵکانێ دانیشتبوون پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەریان راوەستا بوو فەرمووی: (ئایا جیاوازی نێوان چاکترینتان و خراپترینتان پێ رانەگەیەنم؟)، وتی: خەڵکەکە بێدەنگ بوون، سێ جار فەرمایشتەکەی دووپات کردەوە، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێمان رابگەیەنە کێ چاکترینمانە و کێش خراپترینمانە؟ فەرمووی: (چاکترینتان ئەو کەسەیە ئومێدی خێری لێ بکرێت واتە چاك بێ لەگەڵ خەڵك و خەڵکیش لە شەڕ و خراپەی پارێزراو بن، خراپترینتان ئەو کەسەیە ئومێدی خێری لێ نەکرێت و خەڵك لە شەڕ و خراپەی پارێزراو نەبن).

٧٧ - بَابٌ

٢٢٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حُمَيْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخِيَارِ أُمَرَائِكُمْ وَشِرَارِهِمْ؟ خِيَارُهُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتَدْعُونَ لَهُمْ وَيَدْعُونَ لَكُمْ، وَشِرَارُ أُمَرَائِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حُمَيْدٍ، وَمُحَمَّدٌ يُضَعَّفُ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا جیاوازی نێوان چاکترینی فەرمانڕەواکانتان و خراپترینی فەرمانڕەواکانتان پێ رانەگەیەنم؟ چاکترینیان ئەوانەن کە ئێوە خۆشتان دەوێن و ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێت، بۆیان دەپاڕێنەوە و بۆتان دەپاڕێنەوە، خراپترینیشیان ئەوانەن کە ئێوە رقتان لێیانەو ئەوانیش رقیان لێتانە، نەفرەتیان لێ دەکەن و ئەویش نەفرەتتان لێ دەکات).

٧٨ - بَابٌ

٢٢٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ ضَبَّةَ بْنِ مِحْصَنٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّهُ سَيَكُونُ عَلَيْكُمْ أَئِمَّةٌ تَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ فَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ بَرِئَ وَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَفَلاَ نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: لاَ، مَا صَلَّوْا.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ژنی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەدوای من هەندێ کاربەدەست و پێشەوا پەیدا دەبن کاری چاك دەکەن و کاری خراپیش دەکەن، ئەوەی بەرهەڵستی کارە خراپەکانیان بکات ئەوە بەرییە لەتاوانەکانیان، ئەو کەسەی بە دڵ پێی ناخۆش بێ و بەشداریان نەکات ئەوە سەلامەتە، ئەو کەسەی رازی بێ و شوێنیان بکەوێ ئەوە تاوانبارەو شەریکی ئەوانە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جەنگیان لەدژ نەکەین؟ فەرمووی: نا مادەم نوێژ دەکەن نەجەنگن لەگەڵیان).

٢٢٦٦ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الأَشْقَرُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَهَاشِمُ بْنُ القَاسِمِ، قَالاَ: حَدَّثَنَا صَالِحٌ الْمُرِّيُّ، عَنْ سَعِيدٍ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ خِيَارَكُمْ، وَأَغْنِيَاؤُكُمْ سُمَحَاءَكُمْ، وَأُمُورُكُمْ شُورَى بَيْنَكُمْ فَظَهْرُ الأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ بَطْنِهَا، وَإِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ شِرَارَكُمْ وَأَغْنِيَاؤُكُمْ بُخَلاَءَكُمْ، وَأُمُورُكُمْ إِلَى نِسَائِكُمْ فَبَطْنُ الأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ ظَهْرِهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ صَالِحٍ الْمُرِّيِّ، وَصَالِحٌ الْمُرِّيُّ فِي حَدِيثِهِ غَرَائِبُ يَنْفَرِدُ بِهَا لاَ يُتَابَعُ عَلَيْهَا، وَهُوَ رَجُلٌ صَالِحٌ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر فەرمانڕەواکانتان لە خواترس و چاکترین کەستان بوون، دەوڵەمەندەکانتان سەخی و بەخشندەبوون، کاروباری نێوانتان بە پرس و ڕا و بوو ئەوە سەر زەوی باشترە بۆتان لەژێر زەوی واتە ژیانتان باشترە لە مردنتان، خۆ ئەگەر فەرمانڕەواکانتان خراپترین کەستان بوون، دەوڵەمەندەکانتان چروك و سەخی و بەخشندە نەبوون، کاروباری نێوانتان بە پرس و ڕای ژنەکانتان بوو ئەوە ژێر زەوی باشترە بۆتان لەسەر زەوی واتە مردنتان باشترە).**

٧٩ - بَابٌ

٢٢٦٧ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ الجُوزَجَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا نُعَيْمُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ مَنْ تَرَكَ مِنْكُمْ عُشْرَ مَا أُمِرَ بِهِ هَلَكَ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ مَنْ عَمِلَ مِنْهُمْ بِعُشْرِ مَا أُمِرَ بِهِ نَجَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ نُعَيْمِ بْنِ حَمَّادٍ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَأَبِي سَعِيدٍ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە - ئەی هەواڵان - لەسەردەمێکدا دەژین**

هەریەکێ لەئێوە دە یەکی ئەوەی فەرمانی پێ کراوە تەرکی بکات لەناودەچێ، لەپاشدا سەردەمێ دێتە پێشەوە هەریەکێ لەوان دە یەکی ئەوەی فەرمانی پێ کراوە جێبەجێی بکات رزگاری دەبێ).

٢٢٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: هَاهُنَا أَرْضُ الْفِتَنِ، وَأَشَارَ إِلَى الْمَشْرِقِ، يَعْنِي حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ، أَوْ قَالَ: قَرْنُ الشَّمْسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا لەسەر مینبەر وتاریدا ئاماژەی کرد بۆ رۆژهەلات و فەرمووی: (ئالێرەوەیە زەوی فیتنە و ئاژاوە).

٢٢٦٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ الزُّهْرِيِّ، عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَخْرُجُ مِنْ خُرَاسَانَ رَايَاتٌ سُودٌ لاَ يَرُدُّهَا شَيْءٌ حَتَّى تُنْصَبَ بِإِيلِيَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوپای ئالاّ رەشەکان لە خۆراسانەوە دەردەچن هیچ شتێ رێگریان لێ ناکات و ناتوانێ بیانگێڕێتەوە هەتا دەگەنە (ئیلیاء) واتە (بيت المقدس) لەوێ ئالاّ رەشەکانیان جێگیر دەکەن).

# باسەکانی خەوبینین لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

# ٣٢ - أَبْوَابُ الرُّؤْيَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## خەونی موسوڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی

### ١ - بَابُ أَنَّ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ

٢٢٧٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُهُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَالرُّؤْيَا ثَلاَثٌ: فَالرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ بُشْرَى مِنَ اللهِ، وَالرُّؤْيَا مِنْ تَحْزِينِ الشَّيْطَانِ، وَالرُّؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ بِهَا الرَّجُلُ نَفْسَهُ فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ وَلْيَتْفُلْ وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ قَالَ: وَأُحِبُّ القَيْدَ فِي النَّوْمِ وَأَكْرَهُ الغُلَّ الْقَيْدُ: ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ زەمانە نزیك بێتەوە - واتە کاتێ قیامەت نزیك بوویەوە یان شەو و ڕۆژ بەرابەر بوون - ، زۆر نزیکە خەوی موسوڵمان ڕاست دەرچێ کەم جار درۆ دەردەچێت، ئەو کەسەشتان خەونی ڕاستە کە خۆی ڕاستگۆیە، خەونی موسوڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی خەون سێ جۆرە: خەوی ڕاست و چاك مژدەدانە بە بەندە لەلایەن خواوە، هەندێ خەویش خەم و خەفەتەو لە شەیتانەوەیە، هەندێ خەوی تریش دالغەو خەیاڵی دەروونە - کەسێ خەیاڵی

لەلای شتێ بێ خەوی پێوە دەبینێ - ، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو با هەستێ سێ جار تف رۆبکات بەلای چەپیدا لای کەس باسی نەکات). فەرمووی: (پێوەندم لە خەودا پێ خۆشە، چونکە نیشانەی دامەزراویە لەسەر دین، بەلام زنجیری ملم لە خەودا پێ ناخۆشە).

٢٢٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي رَزِينٍ العُقَيْلِيِّ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَعَوْفِ بْنِ مَالِكٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ وَحَدِيثُ عُبَادَةَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خەونی موسوڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

## دەربارەی پێغەمبەرایەتی نامێنێ بەڵام موژدەدەرەکان مێنێ

## ٢ - بَابُ ذَهَبَتِ النُّبُوَّةُ وَبَقِيَتِ الْمُبَشِّرَاتُ

٢٢٧٢ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُخْتَارُ بْنُ فُلْفُلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الرِّسَالَةَ وَالنُّبُوَّةَ قَدْ انْقَطَعَتْ فَلاَ رَسُولَ بَعْدِي وَلاَ نَبِيَّ، قَالَ: فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: لَكِنِ الْمُبَشِّرَاتُ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: رُؤْيَا الْمُسْلِمِ، وَهِيَ جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ النُّبُوَّةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَحُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأُمِّ كُرْزٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ الْمُخْتَارِ بْنِ فُلْفُلٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان نامەی ئاسمانی و پێغەمبەرایەتی نامێنێ لەدوای من پێغەمبەری تر رەوانە ناکرێت)، وتی: ئەمە زۆر قورس بوو بەلای خەڵکەوە، بۆیە فەرمووی: (بەڵام موژدەدەرەکان هەردەمێنن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، موژدەدەرەکان چین؟ فەرمووی: (خەوی موسوڵمانە، کە بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

## دەربارەی موژدەکان لە ژیانی دونیادا.

### ٣ - بَابُ قَوْلِهِ لَهُمُ البُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا

٢٢٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى (لَهُمُ البُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا) فَقَالَ: مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرُكَ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ مُنْذُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرُكَ مُنْذُ أُنْزِلَتْ، هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ. وَفِي البَاب عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

پیاوێکی میسری وتی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە ئەبو دەردائم رەزای خوای لێ بێ پرسی: (لَهُمُ البُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا). واتە: دۆستانی خوا مزگێنی گەورەیان پێ دراوە کە سەربەرز و سەرفرازی هەردوو جیهانن. فەرمووی: لەو کاتەوە ئەم پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کردووە، جگە لەتۆ هیچ کەسێ ئەم پرسیارەی لێ نەکردووم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (لەوکاتەوە ئەم ئایەتە دابەزیوە جگە لەتۆ هیچ کەسێ ئەم پرسیارەی لێ نەکردووم، ئەوە خەوی باشە موسوڵمان دەیبینێ، یان خەوی باشی پێوە دەبینن).

٢٢٧٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَصْدَقُ الرُّؤْيَا بِالأَسْحَارِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕاسترین خەوبینین لە کاتی پارشێو و لەو کاتەدایە کە بەیان دەدات).

٢٢٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَرْبُ بْنُ شَدَّادٍ، وَعِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: نُبِّئْتُ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِهِ (لَهُمُ البُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا)؟ قَالَ: هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُؤْمِنُ أَوْ تُرَى لَهُ. قَالَ حَرْبٌ، فِي حَدِيثِهِ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئەم ئایەتە لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم پرسی: (لَهُمُ البُشْرَى فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا). پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەوە خەوی باشە موسوڵمان دەیبینێ، یان خەوی باشی پێوە دەبینن).

## ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي

٢٢٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي قَتَادَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەخەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی دەمبینێ، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بباتە سەر شکڵ و شێوەی من).

## دەربارەی کەسێ خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو چی بکات

٥ - بَابُ إِذَا رَأَى فِي الْمَنَامِ مَا يَكْرَهُ مَا يَصْنَعُ

٢٢٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ وَالحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ. وَفِي البَاب عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ.
وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەوبینی باش لە خواوەیە، خەوی ناخۆش و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو با لەلای چەپیەوە سێ جار تف ڕۆبکات، لەپاشدا پەنا بگرێ بە خوا لە شەڕ و خراپەی ئەو خەوە و — لە شەیتان و لەلای کەس باسی نەکات — ئیتر زیانی نابێ بۆی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لێكدانەوەی خەون

٦ - بَاب: مَا جَاءَ فِي تَعْبِيرِ الرُّؤْيَا

٢٢٧٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْلَى بْنُ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ وَكِيعَ بْنَ عُدُسٍ، عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ أَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَهِيَ عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ يَتَحَدَّثْ بِهَا، فَإِذَا تَحَدَّثَ بِهَا سَقَطَتْ. قَالَ: وَأَحْسَبُهُ قَالَ: وَلاَ يُحَدِّثُ بِهَا إِلاَّ لَبِيبًا أَوْ حَبِيبًا.

واتە: لە ئەبو رەزینی عوقەیلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خەونی موسوڵمان بەشێكە لە چل بەشی پێغەمبەرایەتی، خەون قەرار ناگرێ ئەگەر پیاو لێكدانەوەی بۆ نەكات و باسی نەكات نایەتەدی، بەڵام ئەگەر باسی بكات و لێكدانەوەی بۆ بكات دێتەدی).

٢٢٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ وَكِيعِ بْنِ عُدُسٍ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي رَزِينٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ وَهِيَ عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ يُحَدِّثْ بِهَا فَإِذَا حَدَّثَ بِهَا وَقَعَتْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَبُو رَزِينٍ العُقَيْلِيُّ اسْمُهُ: لَقِيطُ بْنُ عَامِرٍ وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، فَقَالَ: عَنْ وَكِيعِ بْنِ حُدُسٍ، وَقَالَ شُعْبَةُ، وَأَبُو عَوَانَةَ، وَهُشَيْمٌ: عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، عَنْ وَكِيعِ بْنِ عُدُسٍ، وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو رەزینەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خەونی موسوڵمان بەشێكە لە چل و شەش بەشی

پێغەمبەرایەتی، خەون قەرار ناگرێ ئەگەر پیاو لێکدانەوەی بۆ نەکات و باسی نەکات نایەتەدی، بەڵام ئەگەر باسی بکات و لێکدانەوەی بۆ بکات دێتەدی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لێکدانەوەی خەونی چاك و خراپ

## ٧ - بَابٌ فِي تَأْوِيلِ الرُّؤْيَا مَا يُسْتَحَبُّ مِنْهَا وَمَا يُكْرَهُ

٢٢٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدِ اللهِ السَّلِيمِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الرُّؤْيَا ثَلاَثٌ، فَرُؤْيَا حَقٌّ، وَرُؤْيَا يُحَدِّثُ بِهَا الرَّجُلُ نَفْسَهُ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ فَمَنْ رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ وَكَانَ يَقُولُ: يُعْجِبُنِي الْقَيْدُ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ الْقَيْدُ: ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ. وَكَانَ يَقُولُ: مَنْ رَآنِي فَإِنِّي أَنَا هُوَ فَإِنَّهُ لَيْسَ لِلشَّيْطَانِ أَنْ يَتَمَثَّلَ بِي. وَكَانَ يَقُولُ: لاَ تُقَصُّ الرُّؤْيَا إِلاَّ عَلَى عَالِمٍ أَوْ نَاصِحٍ. وَفِي البَاب عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَأُمِّ العَلاَءِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، وَأَبِي مُوسَى، وَجَابِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەون سێ جۆرە: خەوی ڕاست و چاك موژدەدانە بە بەندە لەلایەن خواوە، هەندێ خەوی تریش دالغەو خەیاڵی دەروونە - کەسێ خەیاڵی لەلای شتێ بێ خەوی پێوە دەبینێ - ، هەندێ خەویش خەم و خەفەتەو لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو با هەستێ نوێژ بکات و لای کەس باسی نەکات). هەروەها دەیفەرموو: (پێوەندم لە خەودا پێ خۆشە، چونکە نیشانەی دامەزراویە لەسەر دین، بەڵام زنجیری ملم لە خەودا پێ ناخۆشە)، هەروەها دەیفەرموو: (هەرکەس لەخەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی دەمبینێ، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بباتە سەر

شکڵ و شێوەی مـن)، هـەروەها دەیفـەرموو: (خـەو مەگێڕنـەوە بـۆ کەسـی زانـاو شارەزاو دڵسۆز نەبێ).

## دەربارەی درۆبکات بڵێ خەوێکی ئاوا و ئاوام دیوە

### ٨ - بَابٌ فِي الَّذِي يَكْذِبُ فِي حُلْمِهِ

٢٢٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: أُرَاهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَذَبَ فِي حُلْمِهِ كُلِّفَ يَوْمَ القِيَامَةِ عَقْدَ شَعِيرَةٍ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بڵێ: خەوێکی ئـاوا و ئاوام دیوە و درۆبکات ئەوە لەرۆژی قیامەتدا تەکلیفی لێ دەکرێت دوو دەنك جـۆ پێکەوە گرێ بدات). - بێگومان هەرگیز بۆی گرێ نادرێن -.

٢٢٨٢ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. ناقصوَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي شُرَيْحٍ، وَوَاثِلَةَ. وَهَذَا أَصَحُّ مِنَ الحَدِيثِ الأَوَّلِ.

٢٢٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: مَنْ تَحَلَّمَ كَاذِبًا كُلِّفَ يَوْمَ القِيَامَةِ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَنْ يَعْقِدَ بَيْنَهُمَا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبـەری خـوا

صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بڵێ: خەوێکی ئاوا و ئاوام دیوە و درۆبکات ئەوە لەرۆژی قیامەتدا تەکلیفی لێ دەکرێت نێوانی دوو دەنك جۆ پێکەوە گرێ بدات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خەوبینین بە شیر و بە کراسەوە

٩ - بَابٌ فِي رُؤْيَا النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّبَنَ وَالقُمُصَ

٢٢٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: العِلْمَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي بَكْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ، وَخُزَيْمَةَ، وَالطُّفَيْلِ بْنِ سَخْبَرَةَ، وَسَمُرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ، وَجَابِرٍ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (جارێ خەوتبوم شیریان بۆ هێنام لێم خواردەوە، لەپاشدا ئەوەی مایەوە دام بە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە چی لێکی دەدەیتەوە؟ فەرمووی: (بە زانست).

٢٢٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الجَرِيرِيُّ البَلْخِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ أَسْفَلَ

مِنْ ذَلِكَ، فَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ. قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الدِّينَ.

واتە: لە هەندێ لەهاوەڵانەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جارێ خەوتبوم لەخەوما ئەو خەڵکەم پێ نیشاندرا هەموویان کراسیان لەبەردا بوو هەیان بوو کراسەکەی زۆر کورت بوو دەگەیشتە سەر مەکی هەشیان بوو خوارتری ئەوە، بەڵام پێشەوا عومەریان ڕەزای خوای لێ بێ پێ نیشاندام کراسەکەی لەبەر پێی دەخشا ئەوەندە درێژ بوو). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بە چی لێکی دەدەیتەوە؟ فەرمووی: (بە دین).

٢٢٨٦ - حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وَهَذَا أَصَحُّ.

## ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رُؤْيَا النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمِيزَانَ وَالدَّلْوَ

٢٢٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَشْعَثُ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ رُؤْيَا؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا رَأَيْتُ كَأَنَّ مِيزَانًا نَزَلَ مِنَ السَّمَاءِ فَوُزِنْتَ أَنْتَ وَأَبُو بَكْرٍ فَرَجَحْتَ أَنْتَ بِأَبِي بَكْرٍ، وَوُزِنَ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ فَرَجَحَ أَبُو بَكْرٍ، وَوُزِنَ عُمَرُ وَعُثْمَانُ فَرَجَحَ عُمَرُ، ثُمَّ رُفِعَ الْمِيزَانُ، فَرَأَيْنَا الكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو بەکرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ڕۆژێ پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ لەئێوە خەوی دیوە؟) پیاوێ وتی: من خەوێکم دیوە، ترازویە لە ئاسمانەوە دابەزی تۆ و پێشەوا ئەبوبەکری کێشانە کرد تۆ لەو چاکتربووی، جا پێشەوایان ئەبوبەکر و عومەری کێشانە کرد ئەبو بەکر چاکتر بوو لە عومەر، هەروەها پێشەوایان عومەر و (عثمان)ی کێشانە کرد عومەر چاکتر بوو لە (عثمان)، لەپاشدا ترازوەکە هەڵکێشرایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە روخساریدا بۆمان دەرکەوت پێی ناخۆش بوو.

٢٢٨٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُثْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ وَرَقَةَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: إِنَّهُ كَانَ صَدَّقَكَ وَلَكِنَّهُ مَاتَ قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُرِيتُهُ فِي الْمَنَامِ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ بَيَاضٌ، وَلَوْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَكَانَ عَلَيْهِ لِبَاسٌ غَيْرُ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَعُثْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَيْسَ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ بِالقَوِيِّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل، خەدیجە پێی فەرموو: وەرەقە باوەڕی بە تۆ هەبوو بەڵام پێش ئەوەی تۆ بانگی ئیسلام ئاشکرا بکەیت مرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەخەودا وەرەقەم دی پۆشاکی سپی لەبەردا بوو، ئەگەر ئەهلی ئاگر بوایە پۆشاکی تری لەبەردا دەبوو).

٢٢٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ رُؤْيَا النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ قَالَ: رَأَيْتُ النَّاسَ اجْتَمَعُوا فَنَزَعَ أَبُو بَكْرٍ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ فِيهِ ضَعْفٌ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ، ثُمَّ قَامَ عُمَرُ فَنَزَعَ فَاسْتَحَالَتْ

غَرْبًا فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا يَفْرِي فَرْيَهُ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەخەوما بینیم خەڵك لەسەر بیرێ کۆبووبوونەوە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بە کزیەکەوە دۆڵچەیە یان دوو دۆڵچە ئاوی هەڵکێشا، خوای گەورە لێی خۆش بێت، لەپاشدا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هەستا دۆڵچەکەی لەدەست گرت دۆڵچەکە زۆر گەورە بوو کەسم نەدیوە هێندەی پێشەوا عومەر بلیمەت بێ و بە هەڵمەت بێ، جا پێشەوا عومەر ئەوەندە ئاوی زۆر کرد خەڵکەکە لەدەوری بیرەکە پەچەیان دروستکرد بۆ ئاژەڵەکانیان).

٢٢٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ رُؤْيَا النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رَأَيْتُ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ وَهِيَ الجُحْفَةُ وَأَوَّلْتُهَا وَبَاءَ الْمَدِينَةِ يُنْقَلُ إِلَى الجُحْفَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەخەوما ئافرەتێکی ڕەشتاڵەم دی قژی پرش و بڵاو بووبووەوە، لەمەدینە دەرچوو هەتا گەیشتە جوحفە، لێکدانەوەم بۆ خەوەکە ئەمەیە پەتاکەی مەدینە دەگوێزێتەوە بۆ جوحفە).

٢٢٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ قَالَ: فِي آخِرِ الزَّمَانِ لاَ تَكَادُ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ وَأَصْدَقُهُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا، وَالرُّؤْيَا ثَلاَثٌ، الحَسَنَةُ بُشْرَى مِنَ اللهِ، وَالرُّؤْيَا يُحَدِّثُ الرَّجُلُ بِهَا نَفْسَهُ، وَالرُّؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يَكْرَهُهَا فَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا وَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: يُعْجِبُنِي القَيْدُ وَأَكْرَهُ الغُلَّ. القَيْدُ: ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ. قَالَ: وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَقَدْ رَوَى عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَيُّوبَ، مَرْفُوعًا وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، وَوَقَفَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ قیامەت نزیك بوویەوە زۆر نزیکە خەوبینینی موسوڵمان راست دەرچێ کەم جار درۆ دەردەچێت، ئەو کەسەشتان خەونی راستە کە خۆی راستگۆیە، خەون سێ جۆرە: خەوی راست و چاك موژدەدانە بە بەندە لەلایەن خواوە، هەندێ خەوی تریش دالغەو خەیاڵی دەروونە - کەسێ خەیاڵی لەلای شتێ بێ خەوی پێوە دەبینێ - ، هەندێ خەویش خەم و خەفەتەو لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان خەوێکی دی پێی ناخۆش بوو با هەستێ نوێژ بکات و لای کەس باسی نەکات). ئەبو هورەیرە فەرمووی: (پێوەندم لە خەودا پێ خۆشە، چونکە نیشانەی دامەزراویە لەسەر دین، بەلام زنجیری ملم لە خەودا پێ ناخۆشە). فەرمووی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەونی موسوڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

٢٢٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، عَنْ شُعَيْبٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي حُسَيْنٍ وَهُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ فَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا

فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنْ أَنْفُخَهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا فَأَوَّلْتُهُمَا كَاذِبَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي يُقَالُ لأَحَدِهِمَا: مَسْلَمَةُ صَاحِبُ الْيَمَامَةِ وَالْعَنْسِيُّ صَاحِبُ صَنْعَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (جـارێ لەخـەوما دوو بـازنی زێڕم دی لەدەستمدا بوون زۆر دڵگرانی کردم — لەبەر ئەوەی زێڕ بۆ پیـاوان حەرامـە - ، وەحیم بۆ کرا کە فوویان لێ بکەم، منیش فووم لـێ کـردن هـەردووکیان فـڕین، ئـەو دوو بازنـەم بـە دوو درۆزن لێکدایـەوە لـەدوای مـن پەیـدا دەبـن یـەکێکیان موسەیلەمە لە یەمامە بوو، ئەوی تریان ئەسوەدی عەنەسی لە صەنعا بوو).

٢٢٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ، يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ ظُلَّةً يَنْطِفُ مِنْهَا السَّمْنُ وَالعَسَلُ وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَسْتَقُونَ بِأَيْدِيهِمْ فَالمسْتَكْثِرُ وَالمسْتَقِلُّ وَرَأَيْتُ سَبَبًا وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ وَأَرَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ بَعْدَكَ فَعَلاَ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ بَعْدَهُ فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ فَقُطِعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ لَهُ فَعَلاَ بِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَيْ رَسُولَ اللهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي وَاللهِ لَتَدَعَنِّي أَعْبُرُهَا فَقَالَ: اعْبُرْهَا، فَقَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّةُ الإِسْلاَمِ، وَأَمَّا مَا يَنْطِفُ مِنَ السَّمْنِ وَالعَسَلِ فَهُوَ القُرْآنُ لِينُهُ وَحَلاَوَتُهُ، وَأَمَّا الْمُسْتَكْثِرُ وَالمسْتَقِلُّ فَهُوَ الْمُسْتَكْثِرُ مِنَ القُرْآنِ وَالمسْتَقِلُّ مِنْهُ، وَأَمَّا السَّبَبُ الوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَهُوَ الحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ فَأَخَذْتَ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللهُ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بَعْدَهُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو، أَيْ رَسُولَ اللهِ لَتُحَدِّثَنِّي أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا، قَالَ: أَقْسَمْتُ بِأَبِي

أَنْتَ وَأُمِّي لَتُخْبِرَنِّي مَا الَّذِي أَخْطَأْتُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُقْسِمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ گێڕایەوە کە پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەمشەو لە خەوما هەورێکم دی هەنگوین و رۆنی لێ دەباری، خەڵکم دەبینی مشتیان بۆ گرتبو هەیان بوو زۆری بەردەکەوت، هەشیان بوو کەمی بەردەکەوت، پەتێکیشم بینی لە ئاسمانەوە شۆڕکرابوەوە بۆ زەوی، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تۆم دی دەستت پێوە گرت و سەرکەوتی، لەدوای تۆش کەسێکی تر دەستی پێوە گرت و سەرکەوت، لەپاشدا کەسێکی تریش دەستی پێوە گرت و سەرکەوت، ئینجا کەسێکی تریش دەستی پێوە گرت ویستی سەرکەوێ پەتەکە پچڕا، پاشان دەستی پێوە گرتەوەو سەرکەوت، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: باوك و دایکم بە فیدات بن وازم لێ بێنە با تەعبیری ئەو خەوە بکەم واتە لێکی بدەمەوە، فەرمووی: (تەعبیری بکە)، وتی: هەورەکە: ئیسلامە، هەنگوین و رۆنەکە هێمنی و نەرمی و شیرینی قورئانە، هەندێکی زۆری بەردەکەوێت و هەندێکی کەم، پەتەکەش: ئەو ڕێگا راست و هەقەیە کە تۆ لەسەریتی، دەستت پێوە گرتودو خوای گەورە سەرت دەخات، لەدوای تۆش کەسێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، لەپاشدا کەسێکی تریش دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، ئینجا کەسێکی تریش دەستی پێوە دەگرێت و دەپچڕێت، پاشان دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێم بفەرموو پێکام یان نا؟ فەرمووی: (هەندێکت پێکاو هەندێکت نەپێکا)، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوێندت دەدەم چیم هەڵەبوو، فەرمووی: (سوێند مەخۆ پێت نالێم).

٢٢٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى بِنَا الصُّبْحَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ وَقَالَ: هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَوْفٍ، وَجَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قِصَّةٍ طَوِيلَةٍ، وَهَكَذَا رَوَى لَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ وَهْبِ بْنِ جَرِيرٍ، مُخْتَصَرًا.

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژی بەیانی دەبووەوە دەیفەرموو: (ئایا هیچ کەسێ لەنێوە ئەم شەو خەوێکی دیوە؟).

# باسەكانی شایەتیدان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٣٣ - أَبْوَابُ الشَّهَادَاتِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی شاهیدەكان كامیان چاكترن

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّهَدَاءِ أَيُّهُمْ خَيْرٌ

٢٢٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي عَمْرَةَ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِي يَأْتِي بِالشَّهَادَةِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا.

واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا پێتان بڵێم چاكترین شایەت كامەیە: ئەو كەسەیە كە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای شایەتی لێ بكرێت).

- ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا مالیك وتی: ئەو كەسەی كە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای لێ بكرێت نازانێ بۆ كێ شایەتی دەدات واتە شایەتی هەقی خۆی دەدات - .

٢٢٩٦ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الحَسَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، نَحْوَهُ وَقَالَ ابْنُ أَبِي عَمْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَأَكْثَرُ النَّاسِ يَقُولُونَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ. وَاخْتَلَفُوا عَلَى مَالِكٍ فِي رِوَايَةِ هَذَا الحَدِيثِ، فَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْ أَبِي عَمْرَةَ، وَرَوَى

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دڵی پیر و بەساڵاچوو گەنج و لاوە لە خۆشەویستی دوو شتدا: زۆر ژیان واتە تەمەن درێژی، وە زۆری ماڵ و سامان).

٢٣٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَيَشُبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ: الحِرْصُ عَلَى العُمُرِ وَالحِرْصُ عَلَى الْمَالِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئادەمیزاد دوو شت پیری دەکات و پەکی دەخات: هیواو ئومێدی تەمەن درێژی و تەماعی ماڵ و سامان).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دونیا بەکەمگرتن

## ٢٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الزَّهَادَةِ فِي الدُّنْيَا

٢٣٤٠ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ وَاقِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ حَلْبَسٍ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الزَّهَادَةُ فِي الدُّنْيَا لَيْسَتْ بِتَحْرِيمِ الحَلاَلِ وَلاَ إِضَاعَةِ الْمَالِ وَلَكِنَّ الزَّهَادَةَ فِي الدُّنْيَا أَنْ لاَ تَكُونَ بِمَا فِي يَدَيْكَ أَوْثَقَ مِمَّا فِي يَدِ اللهِ وَأَنْ تَكُونَ فِي ثَوَابِ الْمُصِيبَةِ إِذَا أَنْتَ أُصِبْتَ بِهَا أَرْغَبَ فِيهَا لَوْ أَنَّهَا أُبْقِيَتْ لَكَ.

هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو إِدْرِيسَ الخَوْلاَنِيُّ اسْمُهُ: عَائِذُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَعَمْرُو بْنُ وَاقِدٍ مُنْكَرُ الحَدِيثِ.

واتـە: لـە ئـەبو (ذر)ەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرمووبـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دونیا بە کەمگرتن بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان نییە، بەڵکو بە کەمگرتن لەدونیادا بریتیە لەوەی زیاتر دڵنیـابی بـەو ماڵ و سامانەی کە خوای گەورە بۆی بڕیـارداوی و لای خۆیـەتی هـەتا ئـەو مـاڵ و سامانەی لەدەستی خۆتدایە، وە حەز بکەی توشی بەڵا بیت بۆ ئەوەی ئارام بگریـت و پاداشتت دەستکەوێ نەك حەز نەکەی تووشی بەڵا بیت).

## باسێکی تر لەو بارەوە

۳۰ - بَابٌ مِنْهُ

۲۳٤۱ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُرَيْثُ بْنُ السَّائِبِ، قَالَ: سَمِعْتُ الحَسَنَ، يَقُولُ: حَدَّثَنِي حُمْرَانُ بْنُ أَبَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ لِابْنِ آدَمَ حَقٌّ فِي سِوَى هَذِهِ الخِصَالِ، بَيْتٌ يَسْكُنُهُ وَثَوْبٌ يُوَارِي عَوْرَتَهُ وَجِلْفُ الخُبْزِ وَالماءِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَهُوَ حَدِيثُ الحُرَيْثِ بْنِ السَّائِبِ وَسَمِعْتُ أَبَا دَاوُدَ سُلَيْمَانَ بْنَ سَلْمٍ البَلْخِيَّ، يَقُولُ: قَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: جِلْفُ الخُبْزِ يَعْنِي لَيْسَ مَعَهُ إِدَامٌ.

واتە: لە پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هـیچ شـتێ لەمانـە پێویـستتر نییە بۆ ئادەمیزاد: خانویەك ژیانی تێدا بەسـەر بـەرێت، پۆشـاکێ شـەرمگەی پـێ داپۆشێت، پارچە نانێکی ڕەق وە ئاویش).

## باسێکی تر لەو بارەوە

### ٣١ - بَابٌ مِنْهُ

٢٣٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقُولُ: (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ) قَالَ: يَقُولُ ابْنُ آدَمَ: مَالِي مَالِي، وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلاَّ مَا تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ، أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (مطرف)ەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە گەیشت بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (**أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ**) واتە: فەرمووی: (ئادەمیزاد دەڵێ: ماڵ و سامانەکەم، ماڵ و سامانەکەم، ئایا ماڵ و سامانت هەیە سوودت پێ بگەیەنێ جگە لەوەی بەخشیت و لە قیامەت پاداشتەکەی وەردەگریت، یان خواردت و لەناوچوو، یا پۆشیت و کۆنت کردوو ڕزی).

## باسێکی تر لەو بارەوە

### ٣٢ - بَابٌ مِنْهُ

٢٣٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ يُونُسَ هُوَ الْيَمَامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَدَّادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ إِنْ تَبْذُلِ الْفَضْلَ خَيْرٌ لَكَ وَإِنْ تُمْسِكْهُ شَرٌّ لَكَ، وَلاَ تُلاَمُ عَلَى كَفَافٍ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَشَدَّادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ يُكْنَى أَبَا عَمَّارٍ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەی ئادەمیزاد ئەوەی لەخۆت زیادە بیبەخشیت چاكترە بۆت لە دونیاو دوارۆژدا، ئەگەر بیگریتەوە خراپە بۆت، لەسەر ماڵی كەم و بە قەناعەت سەرزەنشت ناكرێی، بەخشینەكە لەوەوە دەست پێ بكە خەرجی لەسەر تۆیە، ئەو دەستەی دەبەخشێت چاكترە لەو دەستەی نابەخشێت و داوای سواڵی پێ دەكات).

## دەربارەی پشت بەخوا بەستن

## ٣٣ - بَابٌ فِي التَّوَكُّلِ عَلَى اللَّهِ

٢٣٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ هُبَيْرَةَ، عَنْ أَبِي تَمِيمٍ الجَيْشَانِيِّ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو تَمِيمٍ الجَيْشَانِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ مَالِكٍ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بەڕاستی پشت بەخوا بەستن خوا رۆزیتان دەدات وەك چۆن رۆزی باڵندە دەدات بەیانیان بە برسێتی دەردەچێ لە هێلانەكەی و ئێواران بە تێری دەگەڕێتەوە).

٢٣٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ أَخَوَانِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ أَحَدُهُمَا يَأْتِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالآخَرُ يَحْتَرِفُ، فَشَكَا الْمُحْتَرِفُ أَخَاهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لَعَلَّكَ تُرْزَقُ بِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دوو برا هەبوون یەکێکیان ڕۆژانە دەهاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەوی تریشیان پیشەوەر بوو کاسبی دەکرد، جا ئەوەی کاسبی دەکرد لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سکاڵای براکەی کرد وتی کار ناکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەوانەیە خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕۆزی تۆیش بدات واتە پشت بە کارەکەت مەبەستە).

٣٤ - بَابٌ

٢٣٤٦ - (حسن) حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مَالِكٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ خِدَاشٍ الْبَغْدَادِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي شُمَيْلَةَ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مِحْصَنٍ الْخَطْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مَرْوَانَ بْنِ مُعَاوِيَةَ. وَحِيزَتْ: جُمِعَتْ حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، نَحْوَهُ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی (عبيد الله)ی کوڕی میحصەنەوە، لە باوکیەوە ڕەزای

خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەئێوە رۆژی لێ بوویەوە ئەمین بوو ترسی دوژمنی نەبوو بۆ سەر خۆی و خانەوادەو دەوروبەری، جەستەی بەتەواوی ساغ و سەلامەت بوو لەنەخۆشی، رۆزی ئەو رۆژەی هەبوو بەشی بکات، وەك ئەوە وایە هەموو دونیا بەخۆشیەکانیەوە هی ئەو بێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئارامگرتن لەسەر کەمی رۆزی

٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَفَافِ وَالصَّبْرِ عَلَيْهِ

٢٣٤٧ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ زَحْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ القَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ أَغْبَطَ أَوْلِيَائِي عِنْدِي لَمُؤْمِنٌ خَفِيفُ الحَاذِ ذُو حَظٍّ مِنَ الصَّلاَةِ، أَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَأَطَاعَهُ فِي السِّرِّ، وَكَانَ غَامِضًا فِي النَّاسِ لاَ يُشَارُ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ، وَكَانَ رِزْقُهُ كَفَافًا فَصَبَرَ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ نَقَرَ بِإِصْبَعَيْهِ فَقَالَ: عُجِّلَتْ مَنِيَّتُهُ قَلَّتْ بَوَاكِيهِ قَلَّ تُرَاثُهُ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان بەختەوەرترین دۆست و ئەولیا بێ لای من باوەڕدارێکە باری سوك بێ و کەم ئەرك بێ و بەشی زۆری هەبێ لەنوێژ و چێژ لەنوێژەکانی وەرگرێ و چاکترین پەرستش ئەنجام بدات و لە نهێندا گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوا بکات، لەناو خەڵکا نادیاربێ و بەناوبانگ نەبێ و خەڵك زۆر نەیناسن و بەپەنجەکانی دەست ئاماژەی بۆ نەکەن، رۆزی کەم بێ مەمرە و مەژی قەناعەتی پێ بکات و ئارام بگرێ لەسەری، لەپاشدا هەردوودەستی دا لەیەك و

فەرمووی: (زوو رۆحی دەرچێ، كەم بۆی بگرین و، میراتی كەم بێ).

٢٣٤٧ (م) - (ضعيف) وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: عَرَضَ عَلَيَّ رَبِّي لِيَجْعَلَ لِي بَطْحَاءَ مَكَّةَ ذَهَبًا، قُلْتُ: لاَ يَا رَبِّ وَلَكِنْ أَشْبَعُ يَوْمًا وَأَجُوعُ يَوْمًا، أَوْ قَالَ ثَلاَثًا أَوْ نَحْوَ هَذَا، فَإِذَا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إِلَيْكَ وَذَكَرْتُكَ، وَإِذَا شَبِعْتُ شَكَرْتُكَ وَحَمِدْتُكَ، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ وَالقَاسِمُ هُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَيُكْنَى أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَيُقَالُ أَيْضًا: يُكْنَى أَبَا عَبْدِ الْمَلِكِ وَهُوَ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ وَهُوَ شَامِيٌّ ثِقَةٌ، وَعَلِيُّ بْنُ يَزِيدَ يُضَعَّفُ فِي الْحَدِيثِ وَيُكْنَى أَبَا عَبْدِ الْمَلِكِ.

واتە: لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: (پەروەردگارم پێشنیاری بۆ كردم زەوی و خاك و خۆڵی مەككەم بۆ بكات بە زێڕ، وتم: ئەی پەروەردگارم نامەوێ بەڵكو ئەوەم دەوێ ڕۆژێ تێر بم هەتا سوپاسگوزاری و سوپاس و سەنای تۆ بكەم و ڕۆژێ برسی بم ئارام بگرم لەسەری و لێت بپاڕێمەوە و یادت بكەم).

٢٣٤٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ شُرَحْبِيلَ بْنِ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا وَقَنَّعَهُ اللَّهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسە سەرفراز و ڕزگاری بووە موسوڵمان بێ، ئەوەندە ڕۆزی حەڵاڵی هەبێ پێی بژی، بە بەشی خوای گەورە قایل بێ).

٢٣٤٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو هَانِئٍ الخَوْلَانِيُّ، أَنَّ أَبَا عَلِيٍّ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ الجَنْبِيَّ، أَخْبَرَهُ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: طُوبَى لِمَنْ هُدِيَ إِلَى الإِسْلَامِ، وَكَانَ عَيْشُهُ كَفَافًا وَقَنَعَ وَأَبُو هَانِئٍ اسْمُهُ: حُمَيْدُ بْنُ هَانِئٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە دەیفەرموو: (خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەیە کە ڕێنوێنی کراوە بۆ ئیسلام و، ئەوەندە ڕۆزی حەلاڵی هەیە کە پێی بژی، قایلە بە بەشی خوا).

## دەربارەی فەزڵ و گەورەیی هەژاری

### ٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الفَقْرِ

٢٣٥٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ نَبْهَانَ بْنِ صَفْوَانَ الثَّقَفِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ أَسْلَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَدَّادٌ أَبُو طَلْحَةَ الرَّاسِبِيُّ، عَنْ أَبِي الوَازِعِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَاللهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ. فَقَالَ لَهُ: انْظُرْ مَاذَا تَقُولُ، قَالَ: وَاللهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ تُحِبُّنِي فَأَعِدَّ لِلْفَقْرِ تِجْفَافًا، فَإِنَّ الفَقْرَ أَسْرَعُ إِلَى مَنْ يُحِبُّنِي مِنَ السَّيْلِ إِلَى مُنْتَهَاهُ. حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ شَدَّادٍ أَبِي طَلْحَةَ، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو الوَازِعِ الرَّاسِبِيُّ اسْمُهُ: جَابِرُ بْنُ عَمْرٍو وَهُوَ بَصْرِيٌّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی موغەفەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ بە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم وت: ئەی پێغەمبەری خوا

صلی الله علیـه وسـلم، سـوێند بـە (الله) مـن تـۆم خۆشـدەوێت، پێـی فـەرموو: (سـەیربکە بزانە دەڵێی چی). سیٚ جار، فەرمووی: (ئەگەر منـت خۆشـدەوێت خـۆت ئامادە بکە بۆ چەرمەسەری هەژاری، چـونکە هـەژاری بـۆ لای ئـەو کەسـەی منـی خۆشدەوێت خێراترە لە ڕۆیشتنی لافاو بۆ کۆتاییەکەی).

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ

٢٣٥١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِخَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئـەبو سـەعیدەوە ڕەزای خـوای لـیٚ بـیٚ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەژارانی کۆچەران پێنج سـەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشتەوە).

٢٣٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ وَاصِلٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ مُحَمَّدٍ العَابِدُ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَارِثُ بْنُ النُّعْمَانِ اللَّيْثِيُّ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مِسْكِينًا وَأَمِتْنِي مِسْكِينًا وَاحْشُرْنِي فِي زُمْرَةِ الْمَسَاكِينِ يَوْمَ القِيَامَةِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لِمَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا، يَا عَائِشَةُ لاَ تَرُدِّي الْمِسْكِينَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، يَا عَائِشَةُ أَحِبِّي الْمَسَاكِينَ وَقَرِّبِيهِمْ فَإِنَّ اللَّهَ يُقَرِّبُكِ يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـیٚ بـیٚ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (خودایـە بـە هەژاری بمژێنە، بە هەژاری بمرێنە، لەگەڵ کۆمەڵی هەژاراندا کۆمبکەرەوە و حەشـرم

بکە). عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆچی؟ فەرمووی: (بێگومان هەژارانی کۆچەران چل پایز واتە چل ساڵ لەپێش دەوڵەمەندەکانیانەوە دەچنە بەهەشتەوە، ئەی عائیشە! دەست مەنێ بەرووی هەژاردوە و بێ بەشی مەکە ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێ، ئەی عائیشە! بەدڵ هەژارانت خۆشبوێت و لە کۆڕ و دانیشتندا لێیان نزیك بەرەوە، بێگومان لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە نزیکت دەکاتەوە لەخۆی).

٢٣٥٣ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَدْخُلُ الْفُقَرَاءُ الْجَنَّةَ قَبْلَ الأَغْنِيَاءِ بِخَمْسِمِائَةِ عَامٍ نِصْفِ يَوْمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەژاران پێنج سەد ساڵ لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە، نیو رۆژ).

٢٣٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِنِصْفِ يَوْمٍ وَهُوَ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەژارانی موسوڵمانان نیو رۆژ لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە، کە بریتیە لە پێنج سەد ساڵ).

٢٣٥٥ - (صحيح بلفظ: فُقَرَاءُ المهاجرين) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ جَابِرٍ الحَضْرَمِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەژارانی موسوڵمانان چل پایز لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە، کە دەکاتە چل ساڵ).

## ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و خانەوادەکەی

### ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَعِيشَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلِهِ

٢٣٥٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَدَعَتْ لِي بِطَعَامٍ وَقَالَتْ: مَا أَشْبَعُ مِنْ طَعَامٍ فَأَشَاءُ أَنْ أَبْكِيَ إِلاَّ بَكَيْتُ قَالَ: قُلْتُ لِمَ؟ قَالَتْ: أَذْكُرُ الحَالَ الَّتِي فَارَقَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الدُّنْيَا، وَاللهِ مَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ مَرَّتَيْنِ فِي يَوْمٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە مەسروقەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ، خواردنی بۆ بانگ کردم، لەهەر خواردنێ تێر بخۆم بمەوێ بگریم ئیللا دەگریم، وتم: بۆچی؟ فەرمووی: یادی حاڵی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکەمەوە، سوێند بە (الله) لە ڕۆژێکدا دوو جار تێر نان و گۆشتی نەخوارد.

٢٣٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ، يُحَدِّثُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا شَبِعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ خُبْزِ شَعِيرٍ يَوْمَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەتا لەدونیا دەرچوو دوو ڕۆژ لەسەریەك تێر نانی جۆی نەخوارد.

٢٣٥٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ كَيْسَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: مَا شَبِعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ ثَلاَثًا تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ البُرِّ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی خانەوادەكەی هەتا لەدونیا دەرچوو سێ ڕۆژ لەسەریەك تێر نانی گەنمیان نەخوارد.

٢٣٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَرِيزُ بْنُ عُثْمَانَ، عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ، يَقُولُ: مَا كَانَ يَفْضُلُ عَنْ أَهْلِ بَيْتِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُبْزُ الشَّعِيرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَيَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ هَذَا كُوفِيٌّ وَأَبُو بُكَيْرٍ وَالِدُ يَحْيَى، رَوَى لَهُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَيَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُكَيْرٍ مِصْرِيٌّ صَاحِبُ اللَّيْثِ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: خانەوادەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نانی جۆ زیاتریان نەبوو.

٢٣٦٠ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبِيتُ اللَّيَالِي الْمُتَتَابِعَةَ طَاوِيًا وَأَهْلُهُ لاَ يَجِدُونَ عَشَاءً وَكَانَ أَكْثَرُ خُبْزِهِمْ خُبْزَ الشَّعِيرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەندەها شەو لەسەریەك بەبرسێتی و بەبێ شیو سەری دەنایەوە، خانەوادەکەی نانی شیویان نەبوو زۆرترین نانیان نانی جۆ نەبوو.

٢٣٦١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ القَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خودایە رۆزی خانەوادەی موحەممەد نانەسکی و مەمرەو مەژی بێت).

٢٣٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَدَّخِرُ شَيْئًا لِغَدٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هیچ خواردنێکی پاشەکەوت نەدەکرد بۆ سبەینێی.

٢٣٦٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مَعْمَرٍ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: مَا أَكَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى خِوَانٍ وَلاَ أَكَلَ خُبْزًا مُرَقَّقًا حَتَّى مَاتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەتا لەدونیا دەرچوو سفرەو خوانی نەڕازاندەوە و نانی نەرم و تەنکی نەخوارد.

٢٣٦٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ الحَنَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّهُ قِيلَ لَهُ: أَكَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّقِيَّ؟ يَعْنِي الحُوَّارَى، فَقَالَ سَهْلٌ: مَا رَأَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّقِيَّ حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ مَنَاخِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: مَا كَانَتْ لَنَا مَنَاخِلُ، قِيلَ: فَكَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِالشَّعِيرِ؟ قَالَ: كُنَّا نَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ، ثُمَّ نُثَرِّيهِ فَنَعْجِنُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رَوَاهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێیی وترا: ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نانی سپی خواردووە؟ سەهل فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەتا لەدونیا دەرچوو نانی سپی نەدی، پێیی وترا: ئایا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم هێڵەکتان هەبووە؟ سەهل فەرمووی: نەخێر، وترا: ئەی چۆن جۆکەتان ئامادەکرد بۆ خواردن بە نەبێژراوەیی؟ فەرمووی: دوای ئەوەی دەمانهاڕی فوومان لێ دەکرد جا ئەوەی با دەیبرد با دەیبرد، ئەوەشی کە دەمایەوە ئاومان لێ دەپژاندوو دەمانشێلاو دەمانکرد بە نان.

## دەربارەی ژیان و گوزەرانی هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٣٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي مَعِيشَةِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٢٣٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُجَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، يَقُولُ: إِنِّي لأَوَّلُ رَجُلٍ أَهْرَاقَ دَمًا فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنِّي لأَوَّلُ رَجُلٍ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَغْزُو فِي العِصَابَةِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا نَأْكُلُ إِلاَّ وَرَقَ الشَّجَرِ وَالحُبْلَةِ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ أَوِ البَعِيرُ، وَأَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يُعَزِّرُونِي فِي الدِّينِ، لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ عَمَلِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ بَيَانٍ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من یەکەم کەس بووم لەپێناوی خوا خوێنم ڕژاند، من یەکەم کەس بووم لەپێناوی خوا تیرم هاویشت بەرەو دوژمن، کە دەتبینیم لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم غەزامان دەکرد جگە لە بەر و گەڵای درەختی ئەو بیابانە هیچی ترمان نەدەخوارد، کە دادەنیشتین پاشەڕۆکەمان وەك پاشەڕۆی و وشتر یان بزن و مەڕ بوو، کەچی بەنی ئەسەد لەسەر دینداری سەرزەنشتم دەکەن و دەڵێن نوێژەکانی بە باشی ناکات، بەڕاستی ئەگەر قسەی ئەوان بێ ئەوە من نائومێدم و ڕەنجم بەباچووە.

٢٣٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَيْسٌ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: إِنِّي أَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ العَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ الحُبْلَةَ وَهَذَا السَّمُرَ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يُعَزِّرُونِي فِي الدِّينِ، لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ عَمَلِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَاب عَنْ عُتْبَةَ بْنِ غَزْوَانَ.

واتە: لە سەعدی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من یەکەم پیاو بووم لە عەرەب یەکەم تیرم هاویشت بەرەو دوژمن، کە دەتبینیم لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم غەزامان دەکرد جگە لە بەر و گەڵای درەختی ئەو بیابانە هیچی تر نەبوو بیخۆین، هەتا کە دادەنیشتین پاشەڕۆکەمان وەك پاشەڕۆی بزن و مەڕ بوو، کەچی بەنی ئەسەد لەسەر دینداری سەرزەنشتم دەکەن و دەڵێن نوێژەکانی بە باشی ناکات، بەڕاستی ئەگەر قسەی ئەوان بێ ئەوە من نائومێدم و ڕەنجم بەباچووە.

٢٣٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَشَّقَانِ مِنْ كَتَّانٍ فَتَمَخَّطَ فِي أَحَدِهِمَا ثُمَّ قَالَ: بَخٍ بَخٍ يَتَمَخَّطُ أَبُو هُرَيْرَةَ فِي الكَتَّانِ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لأَخِرُّ فِيمَا بَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحُجْرَةِ عَائِشَةَ مِنَ الجُوعِ مَغْشِيًّا عَلَيَّ، فَيَجِيءُ الجَائِي فَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى عُنُقِي يَرَى أَنَّ بِيَ الجُنُونَ، وَمَا بِي جُنُونٌ وَمَا هُوَ إِلاَّ الجُوعُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سرینەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئێمە لەخزمەت ئەبو هورەیرەدا بووین ڕەزای خوای لێ بێ دوو پۆشاکی کەتانی ڕەنگ کراوی لەبەردا بوو، ئیسراحەتی دەکرد لە یەکێکیاندا، وتی: بەخ بەخ ئەبو هورەیرە لە پۆشاکی کەتاندا دەحەوێتەوە، کە دەتبینیم من و کەسێکی تر لەنێوان مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هۆدەکەی عائیشەدا لەبەر برسێتی بورابومەوە و هۆشم نەمابوو، کەسێ هات پێی خستە سەر ملم وای دەزانی

شێتم، من شێت نەبووم بەڵکو تەنها برسێتی وای لێ کردبووم.

٢٣٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو هَانِئٍ الخَوْلاَنِيُّ، أَنَّ أَبَا عَلِيٍّ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ الجَنْبِيَّ، أَخْبَرَهُ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا صَلَّى بِالنَّاسِ يَخِرُّ رِجَالٌ مِنْ قَامَتِهِمْ فِي الصَّلاَةِ مِنَ الخَصَاصَةِ وَهُمْ أَصْحَابُ الصُّفَّةِ حَتَّى تَقُولَ الأَعْرَابُ هَؤُلاَءِ مَجَانِينُ أَوْ مَجَانُونَ، فَإِذَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: لَوْ تَعْلَمُونَ مَا لَكُمْ عِنْدَ اللهِ لأَحْبَبْتُمْ أَنْ تَزْدَادُوا فَاقَةً وَحَاجَةً. قَالَ فَضَالَةُ: وَأَنَا يَوْمَئِذٍ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـاتێ کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، کەسـانێ هـەبوون لەبرسان دەکەوتن، لەنوێژەکەدا ئەوانەش هاوەڵانی صوفە بوون — حـەفتا کەسـێکی غەریب و بێ دەرەتان بوون لەناو مزگـەوتی مـەدینـەدا - ، تەنانـەت دەشـتەکیەکان دەیانوت: ئەمانە شێتەکانن، پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وسـلم کـاتێ لەنوێـژ بوویـەوە ڕووی تـێ کـردن و فـەرمووی: (ئەگـەر دەتـانزانی لای خـوا چـی پاداشـتی گەورەتان بۆ هەیە حەزتان دەکرد زیاتر هەژار و برسی بن. (فضالة) فـەرمووی: مـن ئەوکاتە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووم.

٢٣٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَاعَةٍ لاَ يَخْرُجُ فِيهَا وَلاَ يَلْقَاهُ فِيهَا أَحَدٌ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ فَقَالَ: خَرَجْتُ أَلْقَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنْظُرُ فِي وَجْهِهِ وَالتَّسْلِيمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ

جَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا عُمَرُ؟ قَالَ: الجُوعُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَأَنَا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذَلِكَ، فَانْطَلَقُوا إِلَى مَنْزِلِ أَبِي الهَيْثَمِ بْنِ التَّيْهَانِ الأَنْصَارِيِّ وَكَانَ رَجُلاً كَثِيرَ النَّخْلِ وَالشَّاءِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ خَدَمٌ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَقَالُوا لاِمْرَأَتِهِ: أَيْنَ صَاحِبُكِ؟ فَقَالَتْ: انْطَلَقَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا الْمَاءَ، فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ جَاءَ أَبُو الهَيْثَمِ بِقِرْبَةٍ يَزْعَبُهَا فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَاءَ يَلْتَزِمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُفَدِّيهِ بِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، ثُمَّ انْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى حَدِيقَتِهِ فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطًا، ثُمَّ انْطَلَقَ إِلَى نَخْلَةٍ فَجَاءَ بِقِنْوٍ فَوَضَعَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفَلاَ تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ تَخْتَارُوا، أَوْ قَالَ: تَخَيَّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، ظِلٌّ بَارِدٌ، وَرُطَبٌ طَيِّبٌ، وَمَاءٌ بَارِدٌ، فَانْطَلَقَ أَبُو الهَيْثَمِ لِيَصْنَعَ لَهُمْ طَعَامًا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَذْبَحَنَّ ذَاتَ دَرٍّ، قَالَ: فَذَبَحَ لَهُمْ عَنَاقًا أَوْ جَدْيًا فَأَتَاهُمْ بِهَا فَأَكَلُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَإِذَا أَتَانَا سَبْيٌ فَأْتِنَا فَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ فَأَتَاهُ أَبُو الهَيْثَمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اخْتَرْ مِنْهُمَا، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ اخْتَرْ لِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ، خُذْ هَذَا فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي وَاسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفًا، فَانْطَلَقَ أَبُو الهَيْثَمِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ امْرَأَتُهُ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ أَنْ تَعْتِقَهُ، قَالَ: فَهُوَ عَتِيقٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا وَلاَ خَلِيفَةً إِلاَّ وَلَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لاَ تَأْلُوهُ خَبَالاً، وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، کە فەرموویەتی: جاریٚ پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ دەرچوو پیٚشتر عادەتی وابوو لەو

كاتەدا لەماڵ دەرنەدەچوو پێشوازی لەكەس نەدەكرد، كەس نەدەچوو بۆ لای لەو كاتەدا، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ خزمەتی، فەرمووی: (ئەی ئەبو بەكر لەم كاتەدا چی تۆی لەماڵ هێنایەدەرێ؟) فەرمووی: هاتمەدەرەوە بۆ ئەوەی بگەم بە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سەیری ڕوخساری بكەم و سەلامی لێ بكەم، زۆری پێ نەچوو پێشەوا عومەریش ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ خزمەتی، فەرمووی: (ئەی عومەر لەم كاتەدا چی تۆی لەماڵ هێنایەدەرێ؟) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، برسێتی، ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (منیش كەمێ برسیمە)، جا ڕۆشتن بەرەو ماڵی ئەبو (هیثم)ی كوڕی تەیهانی ئەنصاری، پیاوێك بوو باخە دارخورما و مەڕی زۆری هەبوو، بەڵام نۆكەر و خزمەتكاری نەبوو، خۆشی لەماڵ نەبوو، بە ژنەكەی فەرموو: (خاوەن ماڵ یان مێردەكەت لە كوێیە؟) وتی: ڕۆشتووە ئاوی سارد و زوڵاڵمان بۆ بێنێ، زۆری پێ نەچوو ئەبو (هیثم) بە كوندەیەكی پڕ لە ئاوەوە هاتەوە، كوندەكەی داناو باوەشی كرد بە پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم خۆی و باوك و دایكی كرد بە قوربانی، لەپاشدا بردنی بۆ ناو باخەكەی و لەژێر سێبەرێكدا ڕاخەرێكی بۆ ڕاخستن، ئینجا چوو هێشووێ خورمای هێناو بۆی دانان، هێشوەكە خورمای تەڕوو فەریكە خورمای پێوە بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بۆچی خورما تەڕەكانت بۆ هەڵنەبژاردین؟). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستم خۆتان هەڵیبژێرن خورما بخۆن و لەم ئاوە زوڵاڵەش بخۆنەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەمانە لەو نازو نیعمەتانەن كە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارتان لێ دەكرێت لەسەریان، سێبەری فێنك، خورمای تەڕ و باش، ئاوی سارد)، ئەبو (هیثم) ڕۆشت خواردنیان بۆ دروست بكات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاژەڵی شیردەرمان بۆ سەرنەبڕیت). وتی: گیسكێكی مێ یان نێری بۆ سەربڕین، هێنای بۆی دانان خواردیان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا تۆ نۆكەر و خزمەتكارت هەی؟) وتی:

نەخێر، فەرمووی: (ئەگەر ژنی دیلی کافرانمان بۆ هات وەرە بۆ لامان). جا دووانی بۆ هات، ئەبو (هیثم) هات، فەرمووی: (یەکێکیان هەڵبژێرە بۆ خۆت)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، تۆ یەکێکیانە بۆ هەڵبژێرە، فەرمووی: (بێگومان راوێژکار ئەمیندارەو جێگەی باوەڕە، ئەمەیان هەڵبژێرە چونکە دەبینم نوێژ دەکات و چاك بە لەگەڵی و فەرمانی پێ مەکە بە چاکە نەبێ)، ئەبو (هیثم) رۆشت بۆ لای ژنەکەی و هەواڵەکەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پێ راگەیاند، ژنەکەی وتی: تۆ ناتوانی ئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەیەوە پێی فەرموویت جێبەجێی بکەی، لەبەرئەوە من پێم وایە ئازادی بکەیت ئەوە چاکترە بۆت، وتی: دەی با ئازاد بێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێ یان هەر خەلیفەیەکی رەوانە کردبێ دوو دەستەو تاقمی هەبووە تاقمێکیان فەرمانیان پێ کردووە بە چاکە و رێگری خراپەیان لێ کردووە، تاقمەکەی تریشیان لە کار تێکدان و سەرلێشێوان و خراپە پێگەیاندنیان درێغیان نەکردووە و دەستیان هەڵنەگرتووە، جا ئەوەی خوای گەورە بیپارێزێ لە تاقمە خراپەکە ئەوە پارێزراوە).

٢٣٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يَوْمًا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَذَكَرَ نَحْوَ هَذَا الحَدِيثِ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَحَدِيثُ شَيْبَانَ أَتَمُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ وَأَطْوَلُ وَشَيْبَانُ ثِقَةٌ عِنْدَهُمْ صَاحِبُ كِتَابٍ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَيْضًا.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و پێشەوا ئەبو بەکر و پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ لە برسان لەماڵ کەی گێڕایەوە وەك فەرموودەی پێشوو.

٢٣٧١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَيَّارُ بْنُ حَاتِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي مَنْصُورٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الجُوعَ وَرَفَعْنَا عَنْ بُطُونِنَا عَنْ حَجَرٍ حَجَرٍ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ حَجَرَيْنِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو (طلحة)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سکاڵای برسێتی خۆمانمان کرد لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سکمان هەڵدایەوە لە برسان یەکی بەردێکمان بەستبوو بە سکمانەوە، ئەویش سکی هەڵدایەوە دوو بەردی بەستبوو بە سکیەوە.

٢٣٧٢ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ، يَقُولُ: أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ؟ لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلَأُ بِهِ بَطْنَهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى أَبُو عَوَانَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي الأَحْوَصِ، وَرَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ سِمَاكٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنْ عُمَرَ.

واتە: لە سیماکی کوڕی حەربەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو: ئایا ئێوە بە ئارەزووی خۆتان ناخۆن و ناخۆنەوە؟ بە چاوی خۆم پێغەمبەرەکەتانم صلی الله علیه وسلم دی خورمای قەسپی دەست نەدەکەوت تێری لێ بخوات.

### دەربارەی دەوڵەمەندی بە بەرچاو تێرییە

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الغِنَى غِنَى النَّفْسِ

٢٣٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ بُدَيْلِ بْنِ قُرَيْشٍ اليَامِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ الغِنَى عَنْ كَثْرَةِ العَرَضِ وَلَكِنَّ الغِنَى غِنَى النَّفْسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو حَصِينٍ اسْمُهُ: عُثْمَانُ بْنُ عَاصِمٍ الأَسَدِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دەوڵەمەندی بە زۆری ماڵ و سامان نییە، بەڵکو دەوڵەمەندی بە بەرچاو تێری و دڵ دەوڵەمەندییە).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی مافی ماڵ و سامان

٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الْمَالِ بِحَقِّهِ

٢٣٧٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي الوَلِيدِ، قَالَ: سَمِعْتُ خَوْلَةَ بِنْتَ قَيْسٍ، وَكَانَتْ تَحْتَ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، مَنْ أَصَابَهُ بِحَقِّهِ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَرُبَّ مُتَخَوِّضٍ فِيمَا شَاءَتْ بِهِ نَفْسُهُ مِنْ مَالِ اللهِ وَرَسُولِهِ لَيْسَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلاَّ النَّارُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو الوَلِيدِ اسْمُهُ: عُبَيْدُ سَنُوطَا.

واتە: لە ئەبو وەلیدەوە دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە خەولەی کچی قەیس بوو — خەولە هاوسەری حەمزە بوو رەزای خوای لێ بێ - دەیفەرموو: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەم ماڵ و سامانی دونیایە سەوز و شیرینە هەرکەسێ بە ئەندازەی پێویستی بە حەڵاڵی

دەستی بکەوێ و مافی خۆی بدات خۆی خوای گەورە پیت و بەرەکەتی تێ دەخات بۆی، هەرکەسێ بە ئارەزووێ خۆی دەستکاری ماڵی خوا و ماڵی پێغەمبەرەکەی بکات لەرۆژی قیامەتدا جگە لە ئاگر هیچی تر چاوەڕوانی ناکات).

٤٢ - بَابٌ

٢٣٧٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ الصَّوَّافُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لُعِنَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَلُعِنَ عَبْدُ الدِّرْهَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيث مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيْضًا أَتَمَّ مِنْ هَذَا وَأَطْوَلَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەندەی دینار و درهەم لە سۆز و بەزەیی خوا دوورخراوەتەوە).

٤٣ - بَابٌ

٢٣٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ، عَنِ ابْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا ذِئْبَانِ جَائِعَانِ أُرْسِلاَ فِي غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمَالِ وَالشَّرَفِ لِدِينِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى فِي هَذَا الْبَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ يَصِحُّ إِسْنَادُهُ.

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (زیانی دوو گورگی برسی کە بەربدرێنە نێو رانە مەرێ زۆرتر نییە لە زیانی کەسێك بۆ دینەکەی کە هەڵپە بکات بۆ ماڵ و سامان و بە پەرۆش بێ بۆی).

٤٤ - بَابٌ

٢٣٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي الْمَسْعُودِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: نَامَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حَصِيرٍ فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ لَوِ اتَّخَذْنَا لَكَ وِطَاءً، فَقَالَ: مَا لِي وَلِلدُّنْيَا، مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەسەر حەسیرێ خەوتبوو شوێنەواری حەسیرەکە بە لاتەنیشتیەوە دەرکەوتبوو، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، بریا دۆشەکێکی نەرمان بۆ دروست دەکردی، فەرمووی: (چیم داوە لە دونیا، من لە دنیادا وەك سوارێکم لەژێر سێبەری درەختێکدا وچانێ بدات و کەمێ بحەوێتەوە، لەپاشدا بڕوات بەرێی خۆیەوە و درەختەکە بەجێ بهێڵێت).

٤٥ - بَابٌ

٢٣٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، وَأَبُو دَاوُدَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ وَرْدَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ

اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پیاو لەسەر دینی هاوڕێ و برادەرەکەیەتی، با هەرکەسێ لەئێوە سەیر بکات کێ هاوڕێ و برادەریەتی).

## وێنەی ئادەمیزاد و کەسوکار و منداڵ و ماڵ و سامان و کردەوەکانی

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ مَثَلُ ابْنِ آدَمَ وَأَهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ وَعَمَلِهِ

٢٣٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ هُوَ ابْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى وَاحِدٌ، يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سێ شت شوێنی مردوو دەکەون، دووانیان دەگەڕێنەوە و یەکێکیان دەمێنێتەوە، کەسوکار و ماڵ و سامان و کردەوەکانی شوێنی دەکەون، کەسوکار و ماڵ و سامانەکەی دەگەڕێنەوە و کردەوەکانی دەمێننەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خراپی زۆرخواردن

### ٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ كَثْرَةِ الأَكْلِ

٢٣٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ الحِمْصِيُّ، وَحَبِيبُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ جَابِرٍ الطَّائِيِّ، عَنْ مِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ. بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، نَحْوَهُ، وَقَالَ الْمِقْدَامُ بْنُ مَعْدِي كَرِبَ: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە میقدامی كوڕی مەعدی كەربەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (خراپترین دەفرێ ئادەمیزاد پڕی بكات گەدەیەتی، چەند پاروویە سەروو زیادیەتی ئەوەندەی بەسە پشتی رابگرێ، خۆ ئەگەر هەر چاری نەبوو با گەدەی بكات بەسێ بەشەوە: بەشێكی بۆ خواردنی، بەشێكی بۆ خواردنەوەی، بەشێكی بۆ هەناسەدانی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ناوبانگ و ریایی

### ٤٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ

٢٣٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللهُ بِهِ، وَمَنْ يُسَمِّعْ يُسَمِّعِ اللهُ بِهِ قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: مَنْ لاَ يَرْحَمِ النَّاسَ لاَ يَرْحَمْهُ اللَّهُ. وَفِي البَاب عَنْ جُنْدَبٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ ریایی بكات خوا لەبەرچاوی خەڵكی دەخات، هەركەسێ بەدوای ناوبانگدا بگەڕێ خوا ناوی دەزڕێنێ). هەروەها فەرموویەتی: (ئەوەی روحم بە خەڵك نەكات خوای گەورەش روحم بەو ناكات و بە سۆز و بەزەیی نابێ بەرامبەری).

٢٣٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي الوَلِيدُ بْنُ أَبِي الوَلِيدِ أَبُو عُثْمَانَ الْمَدَنِيُّ، أَنَّ عُقْبَةَ بْنَ مُسْلِمٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ شُفَيًّا الأَصْبَحِيَّ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ، دَخَلَ الْمَدِينَةَ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ اجْتَمَعَ عَلَيْهِ النَّاسُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: أَبُو هُرَيْرَةَ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ حَتَّى قَعَدْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُوَ يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَلَمَّا سَكَتَ وَخَلاَ قُلْتُ لَهُ: أَسْأَلُكَ بِحَقٍّ وَبِحَقٍّ لَمَا حَدَّثْتَنِي حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَلْتَهُ وَعَلِمْتَهُ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَفْعَلُ، لَأُحَدِّثَنَّكَ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَلْتُهُ وَعَلِمْتُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً فَمَكَثْنَا قَلِيلاً ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: لَأُحَدِّثَنَّكَ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا البَيْتِ مَا مَعَنَا أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً شَدِيدَةً، ثُمَّ أَفَاقَ فَمَسَحَ وَجْهَهُ فَقَالَ: أَفْعَلُ، لَأُحَدِّثَنَّكَ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا وَهُوَ فِي هَذَا البَيْتِ مَا مَعَنَا أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً شَدِيدَةً، ثُمَّ مَالَ خَارًّا عَلَى وَجْهِهِ فَأَسْنَدْتُهُ عَلَيَّ طَوِيلاً، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: حَدَّثَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ يَنْزِلُ إِلَى العِبَادِ لِيَقْضِيَ بَيْنَهُمْ وَكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ، فَأَوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِهِ رَجُلٌ جَمَعَ القُرْآنَ، وَرَجُلٌ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَرَجُلٌ كَثِيرُ الْمَالِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لِلْقَارِئِ: أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا أَنْزَلْتُ عَلَى

رَسُولِي؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا عُلِّمْتَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: إِنَّ فُلاَنًا قَارِئٌ فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ، وَيُؤْتَى بِصَاحِبِ الْمَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَمْ أُوَسِّعْ عَلَيْكَ حَتَّى لَمْ أَدَعْكَ تَحْتَاجُ إِلَى أَحَدٍ؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ، قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا آتَيْتُكَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَصِلُ الرَّحِمَ وَأَتَصَدَّقُ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلاَنٌ جَوَادٌ فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ، وَيُؤْتَى بِالَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: فِي مَاذَا قُتِلْتَ؟ فَيَقُولُ: أُمِرْتُ بِالْجِهَادِ فِي سَبِيلِكَ فَقَاتَلْتُ حَتَّى قُتِلْتُ، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلاَنٌ جَرِيءٌ ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ، ثُمَّ ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رُكْبَتِي فَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أُولَئِكَ الثَّلاَثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللهِ تُسَعَّرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَقَالَ الْوَلِيدُ أَبُو عُثْمَانَ: فَأَخْبَرَنِي عُقْبَةُ بْنُ مُسْلِمٍ أَنَّ شُفَيًّا، هُوَ الَّذِي دَخَلَ عَلَى مُعَاوِيَةَ فَأَخْبَرَهُ بِهَذَا قَالَ أَبُو عُثْمَانَ: وَحَدَّثَنِي الْعَلاَءُ بْنُ أَبِي حَكِيمٍ، أَنَّهُ كَانَ سَيَّافًا لِمُعَاوِيَةَ فَدَخَلَ عَلَيْهِ رَجُلٌ، فَأَخْبَرَهُ بِهَذَا عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: قَدْ فُعِلَ بِهَؤُلاَءِ هَذَا فَكَيْفَ بِمَنْ بَقِيَ مِنَ النَّاسِ؟ ثُمَّ بَكَى مُعَاوِيَةُ بُكَاءً شَدِيدًا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ هَالِكٌ، وَقُلْنَا قَدْ جَاءَنَا هَذَا الرَّجُلُ بِشَرٍّ، ثُمَّ أَفَاقَ مُعَاوِيَةُ وَمَسَحَ عَنْ وَجْهِهِ، وَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

**واتە: شوفەییەی ئەصبەحی چوو بۆ شاری مەدینە، پیاوێكی دی خەڵك لەدەوری كۆبووبوونەوە، وتی: ئەوە كێ یە؟ وتیان: ئەوە ئەبو هورەیرەیە رەزای خوای لێ بێ، لێی نزیك بوومەوە لەردەمیدا دانیشتم قسەی دەكرد بۆ خەڵك، كاتێ كە لێ بوویەوە، پێم وت: سوێندت دەدەم بە هەق وە بە هەق فەرمودەیەكم بۆ باس ناكەیت**

لە پێغەمبەری خودات صلی الله علیه وسلم بیستبێ و لەبەرت کردبێ و کارت پـێ کردبێ، فەرمووی: بەڵێ فەرمودەیەکت بـۆ بـاس دەکـەم کـە لـە پێغەمبـەری خـوام صلی الله علیه وسلم بیستووەو لەبەرم کـردووەو کـارم بـێ کـردووە، لەپاشـدا ئـەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بـێ بـیری لـە رابـووردوو کـردەوەو بـە داخ و پـەژارەوە بـە توندی هاوارێکی کردو لەهۆش خۆی چوو، لەپاشدا هاتەوە سەرخۆی و دەستی هێنا بە روخساریدا و فەرمووی: بەڵێ فەرمودەیەکت بۆ باس دەکەم کـە لـە پێغەمبـەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووەو لەبەرم کردووەو کارم بێ کردووە، بەس خـۆم و خۆی بووین لەم ماڵەدا کەسمان لەگەڵ نەبوو، دیسانەوە لەهۆش خۆی چوو، لەپاشـدا هاتەوە سەرخۆی دەستی هێنا بە روخساریدا و فەرمووی: بـەڵێ فەرمودەیـەکت بـۆ باس دەکەم کە لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووەو لەبەرم کردووەو کارم بێ کردووە، بەس خۆم و خۆی بووین لەم ماڵەدا کەسمان لەگەڵ نەبوو، لەپاشدا بە توندی هاوارێکی کردو لەسەر روو کەوت، لەپاشدا هاتەوە سەرخۆی و فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆی گێڕامەوە فەرمووی: (لـەرۆژی قیامـەتـدا خوای گەورە دادگایی لـەنێوان بەندەکانیـدا دەکـات، هـەموو گـەلێ بەسـەر چـۆکدا دەکەوێت، یەکەم کەسانێ کە بانگ دەکرێن بـۆ دادگـایی کەسـێکە قورئـانی لەبـەر بووە، وە کەسێکە لەپێناوی خوادا کوژراوە، وە کەسێکە ماڵ و سـامانی زۆر بـووە، خوای گەورە بە قورئان خوێنەکە دەفەرمووێت: ئەوەی ناردم بـۆ پێغەمبەرەکـەم کـە قورئانە فێرم نەکردی؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، دەفەرمووێت: ئەوەی زانیت چ کارێکت پێ کردووە؟ دەڵێ: شەو و رۆژ خەریکی خوێندنـەوەی بـووم، خـوای گـەورە پێی دەفەرمووێت: درۆدەکەیت، مەلائیکەکان پێی دەفەرموون: درۆدەکەیت، خـوای گەورە پێی دەفەرمووێت: بەڵکو دەتویست پێت بڵێن: فـلان کـەس قورئـان خوێنـە، بێگومان پێشت وترا و بە مەبەستی خۆت گەیشتی، جـا خـاوەن مـاڵ و سـامانەکە

دەهێنن، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا ماڵ و سامانم بۆ فراوان نەكردی بە شێوەیە پێویستیت بەكەس نەبێ، دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، دەفەرموێت: ئەوەی كە پێم بەخشیت چ كارێكت پێ كردووە؟ دەڵێ: سەردانی خزمانم دەكردوو بەسەرم دەكردنەوە و خێر و خێراتم لێ دەكرد، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: درۆدەكەیت، مەلائیكەكان پێی دەفەرموون: درۆدەكەیت، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بەڵكو دەتویست پێت بڵێن: فلان كەس سەخی و بەخشندەیە، بێگومان پێشت وترا و بە مەبەستی خۆت گەیشتی، جا ئەوەی كە لەپێناوی خوادا كوژراوە دەهێنن، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: لەسەرچی كوژرای؟ دەڵێ: فەرمانم پێ كراوە بجەنگم لە پێناوی تۆدا منیش لە پێناوی تۆدا جەنگم كردووە هەتا كوژرام خوای گەورە پێی دەفەرموێت: درۆدەكەیت، مەلائیكەكان پێی دەفەرموون: درۆدەكەیت، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بەڵكو دەتویست پێت بڵێن: كەسێكی قارەمان و ئازایە، بێگومان پێشت وترا و بە مەبەستی خۆت گەیشتی، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كێشای بە ئەژنۆمدا و فەرمووی: (ئەی ئەبا هورەیرە ئەو سیانە یەكەمین دروستكراوێكن لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە ئاگری دۆزەخیان پێ تاو دەدات.

پیاوێ هاتە خزمەت موعاویە رەزای خوای لێ بێ لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەكەی سەرەوەی بۆ گێڕایەوە، موعاویە فەرمووی: ئەوە ئەو سێ كەسانەن ئاوەهایان لێ دەكەن ئەی هاوار بۆ حاڵی خەڵكانی تر دەبێ چیان لێ بكەن، ئەوەندە زۆر گریا وتمان: تێدا چووە، وتمان: ئەم پیاوە بە شەڕ و خراپەوە هات بۆ لامان، لەپاشدا هۆشی هاتەوە و دەستی هێنا بە روخساریدا و و ریدا و فەرمووی: خوا و پێغەمبەرەكەی راستیان فەرموو: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ

وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ). سورة هود: ١٥ - ١٦. واتە: هەركەسێ تەنها ژیانی ئەم دونیایە و جوانی و زەرق و بەرقی ئەوی بوێ و پاشەڕۆژ پشتگوێ بخات، ئەوا ئێمەش هەر لەم دونیایەدا بەتێر و تەسەلی پاداشتی هەموو هەوڵ و كردەوە چاكەكانیان دەدەینەوە بە تەندروستی و ئاسوودەیی و ڕۆزی و ناو و شۆرەتی دونیا، هیچیشیان لێ كەم ناكرێتەوە، ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا هیچ بەش و بەهرەیەكیان نییە جگە لە ئاگر، هەر هەوڵ و چاكەیەكیشیان كردبێ لە دونیادا بە فیڕۆ دەڕوات، باتڵ و ناهەق و ناڕەوایە ئەوەی كردیان.

٢٣٨٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ عَمَّارِ بْنِ سَيْفٍ الضَّبِّيِّ، عَنْ أَبِي مُعَانٍ الْبَصْرِيِّ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ جُبِّ الحَزَنِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ: وَمَا جُبُّ الحَزَنِ؟ قَالَ: وَادٍ فِي جَهَنَّمَ تَتَعَوَّذُ مِنْهُ جَهَنَّمُ كُلَّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَنْ يَدْخُلُهُ؟ قَالَ: الْقُرَّاءُونَ الْمُرَاءُونَ بِأَعْمَالِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پەنابگرن بە خوا لە (جُبِّ الحَزَن)). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، (جُبِّ الحَزَن) چییە؟ فەرمووی: (شیوێكە لە دۆزەخدا دۆزەخ خۆی ڕۆژی سەد جار پەنادەگرێت بە خوا لێی، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، كێ دەچێتە ناویەوە، فەرمووی: (ئەو قورئانخوێنانەن كە بە كردەوەكانیان ڕووپامایی دەكەن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کردەوەی نهێنی

٤٩ - بَابُ عَمَلِ السِّرِّ

٢٣٨٤ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سِنَانٍ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ الرَّجُلُ يَعْمَلُ العَمَلَ فَيُسِرُّهُ فَإِذَا اطُّلِعَ عَلَيْهِ أَعْجَبَهُ ذَلِكَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَهُ أَجْرَانِ، أَجْرُ السِّرِّ وَأَجْرُ العَلاَنِيَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَى الأَعْمَشُ، وَغَيْرُهُ عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَأَصْحَابُ الأَعْمَشِ لَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَقَدْ فَسَّرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذَا الحَدِيثَ فَقَالَ: إِذَا اطُّلِعَ عَلَيْهِ فَأَعْجَبَهُ فَإِنَّمَا مَعْنَاهُ أَنْ يُعْجِبَهُ ثَنَاءُ النَّاسِ عَلَيْهِ بِالخَيْرِ لِقَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرْضِ فَيُعْجِبُهُ ثَنَاءُ النَّاسِ عَلَيْهِ لِهَذَا لِمَا يَرْجُو بِثَنَاءِ النَّاسِ عَلَيْهِ، فَأَمَّا إِذَا أَعْجَبَهُ لِيَعْلَمَ النَّاسُ مِنْهُ الخَيْرَ لِيُكْرَمَ عَلَى ذَلِكَ وَيُعَظَّمَ عَلَيْهِ فَهَذَا رِيَاءٌ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِذَا اطُّلِعَ عَلَيْهِ فَأَعْجَبَهُ رَجَاءَ أَنْ يَعْمَلَ بِعَمَلِهِ فَيَكُونُ لَهُ مِثْلُ أُجُورِهِمْ فَهَذَا لَهُ مَذْهَبٌ أَيْضًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کەسێ کردەوەیەکی چاك ئەنجام دەدات و دەیشارێتەوە دوایی ئاشکرا دەبێت پێی خۆش بێ ئایا حوکمی ئەوە ڕووپامایییە؟ فەرمووی: ( - نەخێر - دوو پاداشتی بۆ هەیە پاداشتێکی نهێنیەکەی و پاداشتێکی ئاشکرابوونەکەی). هەندێ لە زانایان بەم شێوەیە ڕاچەیان کردووە: ئەگەر بۆ ئەوە پێی خۆش بێ کە خەڵك ڕێزی بگرن و بە گەورەی بگرن ئەوە ڕووپامایییە.

## دەربارەی پیاو لەگەڵ ئەوەیە کە خۆشی دەوێ

٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمَرْءَ مَعَ مَنْ أَحَبَّ

٢٣٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَتَى قِيَامُ السَّاعَةِ؟ فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ قِيَامِ السَّاعَةِ؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صَلاَةٍ وَلاَ صَوْمٍ إِلاَّ أَنِّي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ وَأَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ فَمَا رَأَيْتُ فَرِحَ الْمُسْلِمُونَ بَعْدَ الإِسْلاَمِ فَرَحَهُمْ بِهَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، کەی قیامەت هەڵەسێ؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا بۆ نوێژ، کاتێ کە لێ بوویەوە فەرمووی: (کوا ئەو پیاوەی دەربارەی هەستانی قیامەت پرسیاری کرد؟)، پیاوەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (چیت بۆ ئامادەکردووە؟)، پیاوەکە وتی: نوێژ و رۆژووی زۆرم بۆ ئامادەنەکردووە بەڵکو ئەوەندە هەیە من خواو پێغەمبەرەکەیم خۆشدەوێت، فەرمووی: (پیاو لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوە حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێ، تۆ لەگەڵ ئەوە حەشر دەکرێیت کە خۆشتدەوێ، موسوڵمانان لەدوای نیعمەتی ئیسلام بە هیچ شتێ ئەوەندەی ئەوە دڵخۆش نەبوون).

٢٣٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ وَلَهُ مَا اكْتَسَبَ. وَفِي البَاب عَنْ عَلِيٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَصَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي مُوسَى. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الحَسَنِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

**واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاو لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوە حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێ، پاداشتی کردەوەکانی خۆی بۆ هەیە ئەوانەی کە بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا ئەنجامی داون).**

٢٣٨٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ جَهْوَرِيُّ الصَّوْتِ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ الرَّجُلُ يُحِبُّ القَوْمَ وَلَمَّا يَلْحَقْ بِهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ مَحْمُودٍ.

**واتە: لە صەفوانی کوڕی عەسالەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی دەنگ زل هات وتی: ئەی موحەممەد! پیاو کەسانێکی خۆش بوێت بەڵام کردەوەی نەگات بەکردەوەی ئەوان واتە نەتوانێ وەك ئەوان کار بکات، ئەوە حوکمی چییە؟ فەرمووی: (پیاو لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوە حەشر دەکرێ کە خۆشی دەوێ).**

## دەربارەی گومانی باش بەرامبەر بە خوا

٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ الظَّنِّ بِاللَّهِ

٢٣٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ بُرْقَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ الأَصَمِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا دَعَانِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەی من گومانی چۆن بێ بەرامبەر بە من، منیش بەو شێوەیە دەبم لەگەڵی واتە ئەگەر گومانی باش بوو ئەوە منیش باش دەبم لەگەڵی، ئەگەر گومانی خراپ بوو ئەوە منیش خراپ دەبم لەگەڵی، وە من لەگەڵیام کاتێ کە لێم دەپاڕێتەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکەو خراپە

٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي البِرِّ وَالإِثْمِ

٢٣٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكِنْدِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ الحَضْرَمِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ البِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: البِرُّ حُسْنُ الخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، نَحْوَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ دەربارەی چاکەو خراپە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی

الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چاکە بریتییە لە رەوشت بەرزی، خراپەش بریتیە لەو شتەی دوو دڵی لێی و دەترسی گوناه بێ، لەبەرئەوە حەزناکەی کەس پێی بزانێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆشەویستی لەبەر خوا

## ٥٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الحُبِّ فِي اللَّهِ

٢٣٩٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا كَثِيرُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ بُرْقَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ أَبِي مَرْزُوقٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي مُسْلِمٍ الخَوْلاَنِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلاَلِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو مُسْلِمٍ الخَوْلاَنِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ ثَوْبَ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەوکەسانەی لەبەر گەورەیی و شکۆمەندی من یەکتریان خۆش دەوێ، وان لەسەر مینبەرگەلێ لەنوور پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن).

٢٣٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ، إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ كَانَ قَلْبُهُ مُعَلَّقًا بِالمسْجِدِ إِذَا خَرَجَ مِنْهُ حَتَّى

يَعُودَ إِلَيْهِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ فَاجْتَمَعَا عَلَى ذَلِكَ وَتَفَرَّقَا، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ حَسَبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَهَكَذَا رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ مِثْلَ هَذَا، وَشَكَّ فِيهِ وَقَالَ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَعُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، رَوَاهُ عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَلَمْ يَشُكَّ فِيهِ يَقُولُ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە یان لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە حەوت کەس خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەرەوە: پێشەوای دادپەروەر، گەنجێ لە خوا پەرستیدا پەروەردەبووبێ، کەسێ دڵی بە مزگەوتەوە بەسترابێتەوە کاتێ کە دەرچوو لە مزگەوت هەتا دەگەڕێتەوە بۆ مزگەوت دڵی لای بێ، دوو کەس لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت لەسەر ئەوە کۆببنەوە و جیاش ببنەوە، کەسێ لە چۆڵەوانیدا یادی خوا بکات و فرمێسك برێژێ، پیاوێ ئافرەتێکی خانەدان و شۆخ و شەنگ بانگی بکات بۆ زیناکردن بڵێ: من لە خوا دەترسم ئەو کارە ناکەم، کەسێ و خێر و خێرات بکات بە نهێنی و بیشارێتەوە بە شێوەیە بەدەستی راستی بیبەخشێ دەستی چەپی نەزانێت).

٢٣٩١م- (صحيح) حَدَّثَنَا سَوَّارُ بْنُ عَبْدِ اللهِ العَنْبَرِيُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبٌ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ بِمَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ قَلْبُهُ مُعَلَّقًا بِالمسَاجِدِ، وَقَالَ: ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی راگەیاندنی خۆشویستن

## ٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعْلاَمِ الْحُبِّ

٢٣٩٢ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُعْلِمْهُ إِيَّاهُ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَأَنَسٍ. حَدِيثُ الْمِقْدَامِ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وَالمِقْدَامُ يُكْنَى أَبَا كَرِيمَةَ.

واتە: لە میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە برایەکی موسوڵمانی خۆی خۆشویست با پێی رابگەیەنێ).

٢٣٩٢م- (**ضعيف**) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَقُتَيْبَةُ، قَالاَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ مُسْلِمٍ القَصِيرِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ نَعَامَةَ الضَّبِّيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا آخَى الرَّجُلُ الرَّجُلَ فَلْيَسْأَلْهُ عَنْ اسْمِهِ وَاسْمِ أَبِيهِ وَمِمَّنْ هُوَ فَإِنَّهُ أَوْصَلُ لِلْمَوَدَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلاَ نَعْرِفُ لِيَزِيدَ بْنِ نَعَامَةَ سَمَاعًا مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُرْوَى عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا وَلاَ يَصِحُّ إِسْنَادُهُ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی نەعامەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەبەر خوا بوو بە برادەری کەسێکی موسوڵمان با پرسیاری لێ بکات کە کێیە؟ ناوی چییە؟ کوڕی کێیە؟ باوکی ناوی چییە؟ ئەوە خۆشەویستی و پەیوەندیان زیاتر دەکات).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خراپی پیاهەڵدان و تاریف کردن

٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الْمِدْحَةِ وَالمَدَّاحِينَ

٢٣٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَأَثْنَى عَلَى أَمِيرٍ مِنَ الأُمَرَاءِ، فَجَعَلَ الْمِقْدَادُ، يَحْثُو فِي وَجْهِهِ التُّرَابَ وَقَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَحْثُوَ فِي وُجُوهِ الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَى زَائِدَةُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الْمِقْدَادِ، وَحَدِيثُ مُجَاهِدٍ عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ أَصَحُّ، وَأَبُو مَعْمَرٍ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ سَخْبَرَةَ، وَالمِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ هُوَ: الْمِقْدَادُ بْنُ عَمْرٍو الكِنْدِيُّ وَيُكْنَى أَبَا مَعْبَدٍ، وَإِنَّمَا نُسِبَ إِلَى الأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ لأَنَّهُ كَانَ قَدْ تَبَنَّاهُ وَهُوَ صَغِيرٌ.

واتە: لە ئەبو مەعمەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هەڵیدا بەسەر یەکێ لە فەرمانڕەواکاندا مەدحی زۆری کرد، میقداد ڕەزای خوای لێ بێ هەندێ خۆڵی کێشا بە دەم و چاویدا فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم فەرمانی پێ کردین خۆڵ بکێشین بە دەم و چاوی ئەو کەسانەدا مەدحی خەڵك دەکەن و پیایاندا هەڵدەدەن.

٢٣٩٤ - (صحيح بما قبله) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سَالِمٍ الخَيَّاطِ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَحْثُوَ فِي أَفْوَاهِ الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم فەرمانی پێ کردین خۆڵ بکێشین بە دەمی ئەو کەسانەدا مەدحی خەڵك دەکەن و پیایاندا هەڵدەدەن.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی هاوڕێیەتی باوەڕدار

٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صُحْبَةِ الْمُؤْمِنِ

٢٣٩٥ - (حسن) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ غَيْلاَنَ، أَنَّ الوَلِيدَ بْنَ قَيْسٍ التُّجِيبِيَّ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ، قَالَ سَالِمٌ: أَوْ عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (هاوڕێیەتی کەس مەکە جگە لە باوەڕدار، با جگە لە خاوەن تەقواو خواناس کەس نانیشت نەخوات). — مەبەست لەوەیە موسوڵمان تێکەڵی غەیری باوەڕدار و خاوەن تەقوا نەکات - .

### دەربارەی ئارامگرتن لەسەر بەڵاو مەینەتی

٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّبْرِ عَلَى البَلاَءِ

٢٣٩٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الخَيْرَ عَجَّلَ لَهُ العُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الشَّرَّ أَمْسَكَ عَنْهُ بِذَنْبِهِ حَتَّى يُوَافِيَ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ عِظَمَ الجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ البَلاَءِ، وَإِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلاَهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السَّخَطُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویــەتی: (ئەگــەر خــوای گەورە ویستی خێری بە بەندەی خۆی هەبێ لەدونیادا خێــرا تۆڵــەی لــێ دەســێنێت، کاتێ ویستی شەڕ و خراپەی بە بەنــدەی خــۆی هــەبێ بــەری تۆڵــەی تاوانــەکانی دوا دەخات لەکاتێکــدا کــە شایســتەی تۆڵەیــە بــەهۆی تاوانەکانیــەوە، هــەتا بــە کــۆڵێ گوناهو تاوانەوە دێت بۆ قیامەت ئەوکاتە بە تەواوی تۆڵەی لێ دەسێنێ).

هــەروەها پێغەمبــەری خــوا صــلى الله عليــه وسـلم فەرموویــەتی: (بێگومــان پاداشتی گەورە لەسەر بــەڵاو مەینــەتی گــەورە وەردەگیرێــت، ئەگــەر خــوای گــەورە خۆشویست ئەوا بە بەڵاو مەینــەتی تاقیــان دەکاتــەوە، جــا ئــەوەی ڕازی بــێ خــوای گەورازی دەبێ، ئەوەی نارازی بێ خوای گەورازی لەو نارازی دەبێ و سزای ســەختی دەدات).

٢٣٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ، يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: مَا رَأَيْتُ الوَجَعَ عَلَى أَحَدٍ أَشَدَّ مِنْهُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەعمەشەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گــوێم لــە ئــەبو وائــل بوو دەیفەرموو: بۆ خۆم گوێم لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ بــوو فــەرمووی: هــیچ کەسێکم نەدیوە ئازاری زۆرتر بێ لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.

٢٣٩٨ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَاصِمِ ابْنِ بَهْدَلَةَ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ، فَيُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْبًا اشْتَدَّ بَلاَؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ البَلاَءُ

بِالعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأُخْتِ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، سُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ.

واتە: لە سەعدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کێن ئەوانەی تووشی سەخترین تاقی کردنەوە دەبن و بەڵاو مەینەتی روویان تێ دەکات؟ فەرمووی: (پێغەمبەران لەپاشدا شایستەتر و شایستەتر، هەر کەسێ بەگوێرەی دینداری خۆی تاقی دەکرێتەوە و تووشی بەڵاو مەینەتی دەبێ، ئەگەر دینداریەکەی پتەو بوو تاقی کردنەوەکەی توندتر و گرانتر دەبێ، ئەگەر نەرم و نیانی لە دینداریەکەیدا هەبوو بەپێی ئەوە تاقی دەکرێتەوە، ئەو تاقی کردنەوانەش بەردەوام لەکۆڵی بەندە نابنەوە هەتا بەسەر زەویدا دەڕوات و گوناهی نامێنێ) واتە تاقی کردنەوەکان و بەڵاو مەینەتی گوناهو تاوان دەسڕنەوە.

٢٣٩٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا يَزَالُ البَلاَءُ بِالمُؤْمِنِ وَالمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەت و پیاوی باوەڕدار بەردەوام خۆی و ماڵ و منداڵەکانی ئەوەندە بەڵاو مەینەتی روویان تێ دەکات هەتا بەبێ گوناهو تاوان دەگاتەوە بە خوای خۆی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لەدەستدانی بینایی

٥٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي ذَهَابِ البَصَرِ

٢٤٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاوِيَةَ الجُمَحِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو ظِلاَلٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: إِذَا أَخَذْتُ كَرِيمَتَيْ عَبْدِي فِي الدُّنْيَا لَمْ يَكُنْ لَهُ جَزَاءٌ عِنْدِي إِلاَّ الجَنَّةَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَأَبُو ظِلاَلٍ اسْمُهُ: هِلاَلٌ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (خـوای گـەورە دەفەرمووێت: ئەگەر لەدونیادا هەردوو چـاوم لـە بەندەکـەم سـەندەوە واتـە کـوێر و نابینا بوو، پاداشتی لای من تەنها بەهەشتە).

٢٤٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: مَنْ أَذْهَبْتُ حَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ وَاحْتَسَبَ لَمْ أَرْضَ لَهُ ثَوَابًا دُونَ الجَنَّةِ. وَفِي البَاب عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: هەرکەسێ لەدونیادا بینایی هەردوو چاویم لێ سەندەوە و نابینا بـوو ئـارام بگـرێ و بە هیوای پاداشت بێ بە هیچ پاداشتێ ڕازی نابم بۆی جگە لە بەهەشت).

٥٨ - بَابٌ

٢٤٠٢ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، وَيُوسُفُ بْنُ مُوسَى الْقَطَّانُ الْبَغْدَادِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَغْرَاءَ أَبُو زُهَيْرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَوَدُّ أَهْلُ الْعَافِيَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِينَ يُعْطَى أَهْلُ الْبَلاَءِ الثَّوَابَ لَوْ أَنَّ جُلُودَهُمْ كَانَتْ قُرِضَتْ فِي الدُّنْيَا بِالْمَقَارِيضِ، وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ وَقَدْ رَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَوْلَهُ شَيْئًا مِنْ هَذَا.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوانەی لەدونیادا جەستەیان ساغ و سەلامەت بووە لەڕۆژی قیامەتدا خۆزگە دەخوازن پێستەکانیان بە مەقەست بڕرایەتەوە، لەکاتێکدا پاداشتی بێ شومار و زۆری ئەوانە دەبینن کە لەدونیادا خاوەن بەلاو دەردەدار و بەش مەینەت بوون).

٢٤٠٣ - (ضعيف جدا) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَمُوتُ إِلاَّ نَدِمَ، قَالُوا: وَمَا نَدَامَتُهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ مُحْسِنًا نَدِمَ أَنْ لاَ يَكُونَ ازْدَادَ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا نَدِمَ أَنْ لاَ يَكُونَ نَزَعَ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، وَيَحْيَى بْنُ عُبَيْدِ اللهِ قَدْ تَكَلَّمَ فِيهِ شُعْبَةُ، وَهُوَ: يَحْيَى بْنُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ مَدَنِيٌّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کەسێ کەسێ نییە بمرێ و پەشیمان نەبێتەوە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بۆچی پەشیمان دەبێتەوە؟ فەرمووی: (ئەگەر کەسێکی چاك بێ بۆ ئەوە پەشیمان

دەبێتەوە كردەوەی چاكی زیاتری ئەنجام نەداوە و خێر و خێراتی زۆرتری نەكردووە، خۆ ئەگەر كەسێكی خراپ بێ بۆ ئەوە پەشیمان دەبێتەوە كە خۆی لە گوناهو تاوان بەدوور نەگرتووە و تەوبەی نەكردووە خۆی چاك نەكردووە).

٥٩ - بَابٌ

٢٤٠٤ - (**ضعيف جدا**) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ رِجَالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيَا بِالدِّينِ يَلْبَسُونَ لِلنَّاسِ جُلُودَ الضَّأْنِ مِنَ اللِّينِ، أَلْسِنَتُهُمْ أَحْلَى مِنَ السُّكَّرِ، وَقُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الذِّئَابِ، يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَبِي يَغْتَرُّونَ، أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ؟ فَبِي حَلَفْتُ لأَبْعَثَنَّ عَلَى أُولَئِكَ مِنْهُمْ فِتْنَةً تَدَعُ الحَلِيمَ مِنْهُمْ حَيْرَانًا. وَفِي البَاب عَنِ ابْنِ عُمَرَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە كۆتایی زەمانەدا كۆمەڵانێ پەیدا دەبن بە كردەوەی دوارۆژ ژیانی دونیا بۆ خۆیان دەستەبەر دەكەن واتە كردەوە چاكەكانیان بە مەبەستی دونیایە نەك دوارۆژ، لە پێستی مەڕدان واتە ئەوەندە نەرم ونیانن لەگەڵ خەڵك، زمانیان لە شەكر شیرین ترە، دڵیان وەك دڵی گورگە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا لەبەر میرەبانیم لێم ناترسن و تەوبەو پەشیمانیان پشتگوێ خستووە و ڕۆچوون لە گوناهو تاواندا، یان جورئەت دەكەن و كردەوەی چاك دەكەن بۆ دەستەبەركردنی ماڵ و سامان، هەروەها بۆئەوەی خزمەتیان بكەن، سوێند بە گەورەیی و شكۆمەندی خۆم ئائەوانە دووچاری بەڵاو مەینەتی دەكەم هەندێكیان زاڵ دەكەم بەسەر هەندێكی تریاندا بە شێوەیە كەسی لەسەرخۆ و زانا سەرسام بێ و نەتوانێ چارەسەری بكات نە بەمانەوە لەناویاندا و نە بەدەربازبوون لێیان).

٢٤٠٥ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ الدَّارِمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمْزَةُ بْنُ أَبِي مُحَمَّدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: لَقَدْ خَلَقْتُ خَلْقًا أَلْسِنَتُهُمْ أَحْلَى مِنَ العَسَلِ، وَقُلُوبُهُمْ أَمَرُّ مِنَ الصَّبْرِ، فَبِي حَلَفْتُ لأُتِيحَنَّهُمْ فِتْنَةً تَدَعُ الحَلِيمَ مِنْهُمْ حَيْرَانًا، فَبِي يَغْتَرُّونَ أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: كەسانێكی وەهام زمانیان لە هەنگوین شیرین ترە، دڵیان تاڵترە لە گوشراوەی درەختی تاڵ وەك دڵی گورگە، سوێند بە گەورەیی و شكۆمەندی خۆم ئانەوانە دووچاری بەڵاو مەینەتی دەكەم هەندێكیان زاڵ دەكەم بەسەر هەندێكی تریاندا بە شێوەیە كەسی لەسەرخۆ و زانا سەرسام بێ و نەتوانێ چارەسەری بكات نە بەمانەوە لەناویاندا و نە بەدەربازبوونیش لێیان، ئایا لەبەر میرەبانیم لێم ناترسن و تەوبەو پەشیمانیان پشتگوێ خستووە و رۆچوون لە گوناهو تاواندا، یان جورئەت دەكەن و كردەوەی چاك دەكەن بۆ دەستەبەركردنی ماڵ و سامان، هەروەها بۆئەوەی خزمەتیان بكەن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پاراستنی زمان

## ٦٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حِفْظِ اللِّسَانِ

٢٤٠٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ (ح) وحَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ زَحْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: امْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتــە: لــە عوقبــەی كــوڕی عــامیرەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویــەتی: وتم: ئــەی پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم، چۆن ڕزگــار و ســەرفراز دەبــین؟ فــەرمووی: (زمــانی خــۆت بگــرە، پابەنــد بــە بــەكونجی ماڵــەوە و سەرقاڵی پەرستش بە، خۆت بەدووبگرە لە تێكەڵی خەڵك، لــە گونــاهو تاوانــەكانت پەشیمان بەرەوە و فرمێسكی پەشیمانی هەڵوەرێنە).

٢٤٠٧ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، رَفَعَهُ قَالَ: إِذَا أَصْبَحَ ابْنُ آدَمَ فَإِنَّ الأَعْضَاءَ كُلَّهَا تُكَفِّرُ اللِّسَانَ فَتَقُولُ: اتَّقِ اللَّهَ فِينَا فَإِنَّمَا نَحْنُ بِكَ، فَإِنْ اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا وَإِنْ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، وَقَدْ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، وَلَمْ يَرْفَعُوهُ. حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: أَحْسِبُهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كــە فەرموویــەتی: پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــە وســلم فەرموویــەتی: (هەركــە ئادەمیزاد ڕۆژی لێ دەبێتەوە بە ملكەچیەوە پێی دەڵێن: لــەخوا بترســە دەربــارەی ئێمە چونكە بەڕاستی بــە تــۆوە بەستراوین، ئەگــەر ڕاســت و دامــەزراو بیــت ئــەوا ئێمەش ڕاست و دامەزراو دەبین، خــۆ ئەگــەر چــەوت و لاریــش بیــت ئــەوا ئێمــەش چەوت و لار دەبین).

٢٤٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ الْمُقَدَّمِيُّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يَتَوَكَّلْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَتَوَكَّلْ لَهُ بِالْجَنَّةِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێك زەمانەتی پاراستنی زمان و دامێنی خۆیم بۆ مسۆگەر بكات، زەمانەتی مسۆگەری بەهەشتی بۆ دەكەم).

٢٤٠٩ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ وَقَاهُ اللهُ شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَشَرَّ مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ. أَبُو حَازِمٍ الَّذِي رَوَى عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ اسْمُهُ: سَلْمَانُ مَوْلَى عَزَّةَ الأَشْجَعِيَّةِ وَهُوَ كُوفِيٌّ، وَأَبُو حَازِمٍ الَّذِي رَوَى عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ هُوَ: أَبُو حَازِمٍ الزَّاهِدُ مَدَنِيٌّ، وَاسْمُهُ: سَلَمَةُ بْنُ دِينَارٍ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێك خوای گەورە زمان و دامێنی لەشەڕ و خراپە بپارێزێ دەچێتە بەهەشتەوە).

٢٤١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَاعِزٍ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ حَدِّثْنِي بِأَمْرٍ أَعْتَصِمُ بِهِ، قَالَ: قُلْ رَبِّيَ اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقِمْ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَخْوَفُ مَا تَخَافُ عَلَيَّ، فَأَخَذَ بِلِسَانِ نَفْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: هَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ.

واتە: لە سوفیانی كوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، كارێكم پێ بفەرموو دەستی پێوە بگرم و جێبەجێی بكەم، فەرمووی: (بڵێ: (الله) پەروەردگارمە،

لەپاشدا بەردەوام پابەندی ئەو رێبازە راستە بە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، زیاتر لەچی دەترسی کە من بەهۆیەوە لەناوبچم؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەری زمانی خۆی گرت. واتە: بەهۆی زمانەوە لەناودەچیت، گەر زمان بێڵێ سەر سەلامەتە.

## باسێکی تر لەو بارەوە

٦١ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤١١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللهِ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي ثَلْجٍ البَغْدَادِيُّ، صَاحِبُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَفْصٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَاطِبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُكْثِرُوا الكَلاَمَ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ فَإِنَّ كَثْرَةَ الكَلاَمِ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ قَسْوَةٌ لِلْقَلْبِ، وَإِنَّ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنَ اللهِ القَلْبُ القَاسِي. حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي النَّضْرِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو النَّضْرِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَاطِبٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَاطِبٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زۆر مەڵێن بەبێ ئەوەی یادی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی زۆر وتن بەبێ یادی خوا دەبێتەهۆی دڵ رەقی، بێگومان دوورترین کەس لە خواوە کەسی دڵ ڕەقە).

## باسێکی تر لەو بارەوە

٦٢ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤١٢ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ بْنِ خُنَيْسٍ الْمَكِّيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ حَسَّانَ الْمَخْزُومِيَّ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ صَالِحٍ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كُلُّ كَلاَمِ ابْنِ آدَمَ عَلَيْهِ لاَ لَهُ إِلاَّ أَمْرٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ أَوْ ذِكْرُ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ خُنَيْسٍ.

**واتە: لە ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو قسەیەکی ئادەمیزاد زیانەکانی لەئەستۆی خۆیەتی و سوودی بۆی نییە جگە لە فەرمان بە چاکە یان ڕێگری لە خراپە یا یادی خوا).**

٦٣ - بَابٌ

٢٤١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْعُمَيْسِ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: آخَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ سَلْمَانَ وَبَيْنَ أَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ: مَا شَأْنُكِ مُتَبَذِّلَةً؟ قَالَتْ: إِنَّ أَخَاكَ أَبَا الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا، قَالَ: فَلَمَّا جَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ قَرَّبَ إِلَيْهِ طَعَامًا، فَقَالَ: كُلْ فَإِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ، قَالَ: فَأَكَلَ، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لِيَقُومَ، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: نَمْ، فَنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ، فَقَالَ لَهُ: نَمْ، فَنَامَ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الصُّبْحِ، قَالَ لَهُ سَلْمَانُ: قُمِ الآنَ، فَقَامَا فَصَلَّيَا، فَقَالَ: إِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِضَيْفِكَ

عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَأَتَيَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَا ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ: صَدَقَ سَلْمَانُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو الْعُمَيْسِ اسْمُهُ: عُتْبَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، وَهُوَ أَخُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمَسْعُودِيِّ.

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ کە موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلمان و ئەبو دەردائی کرد بە برای یەك، ڕۆژێ سەلمان ڕەزای خوای لێ بێ چوو بۆ سەردانی بینی ئوممو دەردائی هاوسەری زۆر پەرپوتە و خزمەتی خۆی ناکات، سەلمان فەرمووی: ئەوە بۆ وات لەخۆت کردووە، وتی: ئەبو دەردائی برات هیچ پێویستی بە دونیا نەماوە و کاری بە ژن نییە؟ وتی: کاتێ کە ئەبو دەردا ڕەزای خوای لێ بێ هاتەوە خواردنی دانا بۆ سەلمان و فەرمووی: بخۆ من بەڕۆژووم، سەلمان فەرمووی: منیش نایخۆم هەتا تۆش نان نەخۆی، وتی: ئەویش نانی خوارد، کاتێ کە شەو داهات واتە سەرەتای شەو ئەبو دەردا ڕەزای خوای لێ بێ هەستا بۆ شەو نوێژ، سەلمان فەرمووی: بخەوە، ئەویش خەوت، لەپاشدا هەستا بۆ شەو نوێژ، سەلمان فەرمووی: بخەوە، ئەویش خەوتەوە، لەکۆتایی شەودا سەلمان پێی فەرموو: دەی ئێستا هەستە بۆ شەو نوێژ، هەردووکیان هەستان شەو نوێژیان کرد، سەلمان ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: نەفست مافی لەسەرتە، پەروەردگارت مافی لەسەرتە، میوانەکەت مافی لەسەرتە، هاوسەرەکەت مافی لەسەرتە، دەی تۆش مافی هەر هەموویان جێبەجێ بکە و هەقیان مەفەوتێنە، ئەبو دەردا ڕەزای خوای لێ بێ چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (سەلمان ڕاست دەکات).

## باسێکی تر لەو بارەوە

## ٦٤ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عَبْدِ الوَهَّابِ بْنِ الوَرْدِ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنِ اكْتُبِي إِلَيَّ كِتَابًا تُوصِينِي فِيهِ، وَلاَ تُكْثِرِي عَلَيَّ، فَكَتَبَتْ عَائِشَةُ إِلَى مُعَاوِيَةَ: سَلاَمٌ عَلَيْكَ. أَمَّا بَعْدُ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنِ التَمَسَ رِضَاءَ اللهِ بِسَخَطِ النَّاسِ كَفَاهُ اللَّهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ، وَمَنِ التَمَسَ رِضَاءَ النَّاسِ بِسَخَطِ اللهِ وَكَلَهُ اللَّهُ إِلَى النَّاسِ، وَالسَّلاَمُ عَلَيْكَ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهَا كَتَبَتْ إِلَى مُعَاوِيَةَ، فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِمَعْنَاهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە پیاوێکی خەڵکی مەدینەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: موعاویە ڕەزای خوای لێ بێ نامەی نووسی بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداران ڕەزای خوای لێ بێ، کە نامەیەکم بۆ بنووسە بە کورتی ئامۆژگاریم بکەو قورسی مەکە لەسەرم، ئەویش وەڵامی نامەکەی دایەوە بەم شێوەیە: سڵاوی خوات لەسەربێ، لەدوایدا: بەڕاستی بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەس داوای ڕەزامەندی خوا بکات بە ناڕەزامەندی و تووڕەیی خەڵك ئەوە خوای گەورە ئەرکی خەڵکی لەسەر لادەبات، بە پێچەوانەوە هەرکەسێ داوای ڕەزامەندی خەڵك بکات بە ناڕەزامەندی و تووڕەیی خوای گەورە ئەوە خوا زەمانەتی دەداتە دەست خەڵك). سڵاوی خوات لەسەربێ.

# باسەكانی سیفەتەكانی قیامەت لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٣٥ - أَبْوَابُ صِفَةِ الْقِيَامَةِ وَالرَّقَائِقِ وَالْوَرَعِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### باسی دەربارەی قیامەت

### ١ - بَابٌ فِي الْقِيَامَةِ

٢٤١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ رَجُلٍ إِلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلاَ يَرَى شَيْئًا إِلاَّ شَيْئًا قَدَّمَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلاَ يَرَى شَيْئًا إِلاَّ شَيْئًا قَدَّمَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَقِيَ وَجْهَهُ حَرَّ النَّارِ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا أَبُو السَّائِبِ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، يَوْمًا بِهَذَا الحَدِيثِ عَنِ الأَعْمَشِ، فَلَمَّا فَرَغَ وَكِيعٌ، مِنْ هَذَا الحَدِيثِ قَالَ: مَنْ كَانَ هَاهُنَا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ فَلْيَحْتَسِبْ فِي إِظْهَارِ هَذَا الحَدِيثِ بِخُرَاسَانَ، لأَنَّ الجَهْمِيَّةَ يُنْكِرُونَ هَذَا اسْمُ أَبِي السَّائِبِ: سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ بْنِ سَلْمِ بْنِ خَالِدِ بْنِ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ الكُوفِيُّ.

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە ئێوەی موسوڵمان پەروەردگاری بەبێ تەرجومان گفت و گۆی لەگەڵ دەکات ، جائەو

كاتە تەماشای لای راستی دەكات ئەوەی لەپێش خۆیەوە رەوانەی كردووە هەر ئەوە دەبینێتەوە، تەماشای لای چەپی دەكات ئەوەی لەپێش خۆیەوە رەوانەی كردووە هەر ئەوە دەبینێت، تەماشای بەردەمی خۆی دەكات دۆزەخ دەبینێ روو بەرووی راوەستاوە، كەواتە هەركەس لە ئێوە دەتوانێ با خۆی بپارێزێ لە تینی ئاگری دۆزەخ هەرچەندە بە لەتە خورمایەك بێ).

كاتێ وەكیع لە گێرانەوەی ئەم فەرموودە بوویەوە فەرمووی: با هەركەس خەڵكی خۆراسانە ئەم فەرموودە لەوێ ئاشكرا بكات و داوای پاداشت لە خوای گەورە بكات، چونكە خوراسان جەهمیەی لێ بوو نەفی سیفەتەكانی خوایان دەكرد بۆیە وەكیع ئاماژەی بۆ خوراسان كرد.

٢٤١٦ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ نُمَيْرٍ أَبُو مِحْصَنٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ قَيْسٍ الرَّحَبِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَزُولُ قَدَمُ ابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عِنْدِ رَبِّهِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ خَمْسٍ، عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ، وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَ أَبْلاَهُ، وَمَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الحُسَيْنِ بْنِ قَيْسٍ، وَحُسَيْنُ بْنُ قَيْسٍ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَرْزَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا بەندەی موسوڵمان قاچی نابزوێت هەتا لەسەر پێنج شت پرسیاری لێ دەكرێت: تەمەنی لەچیدا بەسەر برد، گەنجێتی چۆن بەسەر برد، ماڵ و سامانەكەی چۆن پەیدا كرد و لەچیدا خەرجی كرد، چ كارێكی كرد بە زانست و زانیاریەكەی).

٢٤١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَسْوَدُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَسَعِيدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ جُرَيْجٍ هُوَ بَصْرِيٌّ، وَهُوَ مَوْلَى أَبِي بَرْزَةَ، وَأَبُو بَرْزَةَ اسْمُهُ: نَضْلَةُ بْنُ عُبَيْدٍ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا بەندەی موسوڵمان قاچی نابزوێت هەتا لەسەر پێنج شت پرسیاری لێ دەكرێت: تەمەنی لەچیدا بەسەر برد، چ كارێكی كرد بە زانست و زانیاریەكەی، ماڵ و سامانەكەی چۆن پەیدا كرد و لەچیدا خەرجی كرد، جەستەی لەچیدا لەناودا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لێپێچینەوە و تۆڵە

## ٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَأْنِ الحِسَابِ وَالْقِصَاصِ

٢٤١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَتَدْرُونَ مَنِ الْمُفْلِسُ؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُفْلِسُ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ القِيَامَةِ بِصَلاَتِهِ وَصِيَامِهِ وَزَكَاتِهِ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا فَيَقْعُدُ فَيَقْتَصُّ هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْتَصَّ مَا عَلَيْهِ مِنَ الخَطَايَا أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا دەزانن موفلیس کێیە؟). وتیان: موفلیس لای ئێمە ئەو کەسەیە ماڵ و سامان و پارە و شمەکی نەبێ، فەرمووی: (موفلیسی راستەقینە لە ئوممەتی مندا ئەو کەسەیە لەرۆژی قیامەتدا کە دێت بە نوێژ و رۆژوو و زەکاتەکەیەوە واتە خاوەنی ئەو پەرستانەیە، کە دێت جنێوی داوە بەوە، بوختانی کردووە بۆ ئەوە، خوێنی ئەوەی رشتووە، لەوەی داوە، موفلیسەکە دادەنیشێنن وەك تۆڵە لێ کردنەوەیە لەکردەوە چاکەکانی بەشی ئەوانەی لێ دەسێنن کە خراپەی کردووە بەرمبەریان، ئەگەر کردەوە چاکەکانی تەواوبوون لەپێش ئەوەی تۆڵەی گوناهەکانی بە تەواوی لێ بکرێتەوە، ئەوا لە گوناهی ئەوانە دەخرێتە سەر گوناهەکانی و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

٢٤١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَنَصْرُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الكُوفِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ أَبِي خَالِدٍ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَحِمَ اللهُ عَبْدًا كَانَتْ لأَخِيهِ عِنْدَهُ مَظْلِمَةٌ فِي عِرْضٍ أَوْ مَالٍ، فَجَاءَهُ فَاسْتَحَلَّهُ قَبْلَ أَنْ يُؤْخَذَ وَلَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ حَمَّلُوهُ عَلَيْهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، وَقَدْ رَوَاهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رەحمەتی خوا لەو بەندەیەی ستەمێکی کردووە لە ئابروو یان لەماڵی برا موسوڵمانەکەی گەردنی پێ ئازاد دەکات لەپێش ئەوەی بمرێ و لەرۆژێکدا لێی وەرگیرێتەوە دینار و درهەم دەوری نامێنێ، ئەگەر چاکەی هەبوو ئەوەندەی ستەمەکەی لە چاکەکانی وەردەگیرێت، خۆ

ئەگەر چاکەی نەبوو ئەوە لە کردەوە خراپەکانی ستەم لێکراوەکە هەڵدەگیرێ و دەخرێتە سەر خراپەکانی ئەو).

٢٤٢٠ – (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَتُؤَدُّنَّ الحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ القَرْنَاءِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أُنَيْسٍ. وَحَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەرجەم مافەکان دەگەڕێنرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان تەنانەت تۆڵەی بزن و مەڕی شاخدار لە بێ شاخ دەکرێتەوە).

٢٤٢١ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمِقْدَادُ، صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ أُدْنِيَتِ الشَّمْسُ مِنَ العِبَادِ حَتَّى تَكُونَ قِيدَ مِيلٍ أَوْ اثْنَيْنِ، قَالَ سُلَيْمٌ: لاَ أَدْرِي أَيَّ الْمِيلَيْنِ عَنَى؟ أَمَسَافَةُ الأَرْضِ، أَمْ الْمِيلُ الَّذِي يُكْحَلُ بِهِ الْعَيْنُ؟، قَالَ: فَتَصْهَرُهُمُ الشَّمْسُ، فَيَكُونُونَ فِي العَرَقِ بِقَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى عَقِبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى حِقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ إِلْجَامًا فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ: أَيْ يُلْجِمُهُ إِلْجَامًا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە میقدادی هاوەڵی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لەرۆژی قیامەتدا خۆر نزیك دەكرێتەوە لە بەندەكان تا دەگاتە

ئەندازەی مێلی یان دوو میل). سولەیم وتی: جا نازانم مەبەستی میلی پێوانەی زەوی بوو یان میلی چاو رشتن بە کل بوو، تین و گەرمای خۆرەکە دەیانتوێنێتەوە، بەپێی کردەوەکانیان لە ئارەقدان، هەندێکیان هەتا پاژنەیان لە ئارەقدان، هەندێکیان هەتا ئەژنۆیان لە ئارەقدان، هەندێکیان هەتا پشتوێنگە یان ناوەڕاستیان لە ئارەقدان، هەشیانە وەك لەغاوکردن لەغاویان دەکات واتە هەتا ناو دەمیان لە ئارەقدان).

٢٤٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو زَكَرِيَّا يَحْيَى بْنُ دُرُسْتَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ حَمَّادٌ: وَهُوَ عِنْدَنَا مَرْفُوعٌ، (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ) قَالَ: يَقُومُونَ فِي الرَّشْحِ إِلَى أَنْصَافِ آذَانِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: **(يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ)**. فەرموویەتی: واتە: خەڵکان هەتا نەرمایی گوێیان لە ئارەقدان.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی رۆژی حەشر

### ٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَأْنِ الحَشْرِ

٢٤٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً كَمَا خُلِقُوا، ثُمَّ قَرَأَ (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ) وَأَوَّلُ مَنْ يُكْسَى مِنَ الخَلاَئِقِ إِبْرَاهِيمُ، وَيُؤْخَذُ مِنْ أَصْحَابِي بِرِجَالٍ ذَاتَ اليَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ،

فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أَصْحَابِي فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، إِنَّهُمْ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ، فَأَقُولُ كَمَا قَالَ العَبْدُ الصَّالِحُ: (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ). حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ فَذَكَرَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا خەڵك بەپێی پەتی و بەڕووتی و بە خەتەنە نەکراوی زیندودەکرێنەوە وەك چۆن یەکەم جار دروستکراون، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ). سورة الأنبياء: ١٠٤ - ١٠٥. یەکەم کەس کە پۆشاکی لەبەردەکرێت پێغەمبەر ئیبراهیمە سەلامی خوای لەسەر بێ، کەسانێ لە هاوەڵانم دەهێنن بەرەو لای ڕاست بۆ بەهەشت و کەسانێکیشیان بەرەو لای چەپ پەلکێشیان دەکەن بۆ دۆزەخ، منیش دەڵێم: (ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوڕێی من بوون). پێی دەوترێت: تۆ نازانی لەدوای تۆ چیان داهێنا لەدیندا، ئەوانە لەپاش مردنی تۆ پاشگەزبوونەوە لە دینەکەیان، منیش وەك بەندە صالحەکە دەڵێم: (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ). سورة المائدة: ١١٨. واتە: ئەگەر تۆ سزاو ئەشکەنجەیان بدەیت، بێگومانە کە بەندەی خۆتن و کەسیش بۆی نیە هیچ بڵێت، ئەگەر لێشیان ببوریت ئەوە خۆت چاك دەزانی، بۆخۆشت دەسەڵاتدار و کارجوانی.

٢٤٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

يَقُولُ: إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ رِجَالاً وَرُكْبَانًا، وَتُجَرُّونَ عَلَى وُجُوهِكُمْ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (بێگومان بە سواری و بە پیادە زیندودەکرێنەوە و کۆدەکرێنەوە، لەسەر ڕووخسارتان رادەکێشرێن).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی خستنەڕوو

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي العَرْضِ

٢٤٢٥ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَلِيٍّ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُعْرَضُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ ثَلاَثَ عَرَضَاتٍ، فَأَمَّا عَرْضَتَانِ فَجِدَالٌ وَمَعَاذِيرُ، وَأَمَّا العَرْضَةُ الثَّالِثَةُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَطِيرُ الصُّحُفُ فِي الأَيْدِي، فَآخِذٌ بِيَمِينِهِ وَآخِذٌ بِشِمَالِهِ. وَلاَ يَصِحُّ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ قِبَلِ أَنَّ الحَسَنَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَقَدْ رَوَاهُ بَعْضُهُمْ عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَلِيٍّ وَهُوَ الرِّفَاعِيُّ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَلاَ يَصِحُّ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ قِبَلِ أَنَّ الحَسَنَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي مُوسَى.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵك سێ جار دەخرێنەڕوو نیشان دەدرێن، یەکەم جار بەرگری لەخۆیان دەکەن، دووەم جار دانی پیادەنێن و پۆزش دەێننەوە، بەڵام سێیەم جار بە پەلە نامەی کردەوەکانیان دەدرێتە دەست، هەیانە دەدرێتە دەستی ڕاستی و هەشیانە دەدرێتە دەستی چەپی).

## باسێکی تر لەو بارەوە

### ٥ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٢٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ هَلَكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: (فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا) قَالَ: ذَلِكَ العَرْضُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَرَوَاهُ أَيُّوبُ، أَيْضًا عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت تیادەچێت و سزاو ئەشکەنجە دەدرێت)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ ﴾ الانشقاق: ٧ - ٩. واتە: ئەو کەسەی نامەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی، ئەوە لێپرسینەوەیەکی سوك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، وە بە دڵخۆشیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کاری. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: بێگومان ئەوە خستنەڕووی کردەوەکانە).

## باسێکی تر لەو بارەوە

### ٦ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٢٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، وَقَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُجَاءُ بِابْنِ آدَمَ يَوْمَ القِيَامَةِ كَأَنَّهُ بَذَجٌ فَيُوقَفُ بَيْنَ يَدَيِ اللهِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ:

أَعْطَيْتُكَ وَخَوَّلْتُكَ وَأَنْعَمْتُ عَلَيْكَ، فَمَاذَا صَنَعْتَ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ جَمَعْتُهُ وَثَمَّرْتُهُ فَتَرَكْتُهُ أَكْثَرَ مَا كَانَ فَارْجِعْنِي آتِكَ بِهِ كُلِّهِ، فَيَقُولُ لَهُ: أَرِنِي مَا قَدَّمْتَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ جَمَعْتُهُ وَثَمَّرْتُهُ فَتَرَكْتُهُ أَكْثَرَ مَا كَانَ، فَارْجِعْنِي آتِكَ بِهِ كُلِّهِ، فَإِذَا عَبْدٌ لَمْ يُقَدِّمْ خَيْرًا، فَيُمْضَى بِهِ إِلَى النَّارِ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الحَسَنِ، قَوْلَهُ وَلَمْ يُسْنِدُوهُ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا ئادەمیزاد دەهێنرێت وەك بەرخێکی بێ زمان و بێ دەسەڵات، رادەوەستێنرێت خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا ژیان و تەندروستی و خۆشگوزەرانیم ماڵ و سامان و پلەو پایەو جۆرەها ناز و نیعمەتی زۆرم پێ نەبەخشیت؟ ئەی تۆ چیت کرد؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگار کۆمکردەوە و زۆرم کردوو بەجێم هێشت، بمگێڕەوە بۆ دونیا هەتا هەمووی ببەخشم لە پێناوی تۆدا، پێی دەوترێت: چیت پێش خستووە لەکاری چاك بۆ قیامەت؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگار کۆمکردەوە و زۆرم کردوو بەجێم هێشت، بمگێڕەوە بۆ دونیا هەتا هەمووی ببەخشم لە پێناوی تۆدا، ئەگەر بەندەیە بوو کاری چاکی پێش نەخستبوو بۆ قیامەت ئەوە دەیبەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ).

٢٤٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الزُّهْرِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ سُعَيْرٍ أَبُو مُحَمَّدٍ التَّمِيمِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُؤْتَى بِالعَبْدِ يَوْمَ القِيَامَةِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا وَمَالاً وَوَلَدًا، وَسَخَّرْتُ لَكَ الأَنْعَامَ وَالحَرْثَ، وَتَرَكْتُكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَكُنْتَ تَظُنُّ أَنَّكَ مُلاَقِي يَوْمَكَ هَذَا؟ فَيَقُولُ: لاَ،

فَيَقُولُ لَهُ: اليَوْمَ أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: اليَوْمَ أَنْسَاكَ، يَقُولُ: اليَوْمَ أَتْرُكُكَ فِي العَذَابِ. هَكَذَا فَسَّرُوهُ. وَقَدْ فَسَّرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذِهِ الآيَةَ (فَالْيَوْمَ نَنْسَاهُمْ) قَالُوا: إِنَّمَا مَعْنَاهُ اليَوْمَ نَتْرُكُهُمْ فِي العَذَابِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا بەندە دەهێنرێت، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: ئایا گوێ و چاو و ماڵ و سامان و منداڵم پێ نەبەخشیت؟ ئاژەڵان و مەڕ و ماڵات کێڵگەم بۆ نەهێنایتە ژێربار بۆت؟ وازم لێ نەهێنایت سەرۆکایەتی بکەیت و چواریەکی دەستکەوت ببەیت[1]؟ دەتزانی تووشی ئەم ڕۆژە دەبیت، ئەویش دەڵێ: نەخێر، جا پێی دەفەرمووێت: ئە مرۆ لەبیرت دەکەم وەك چۆن تۆ لەبیرت کردم).

## باسێکی تر لەو بارەوە

٧ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٢٩ - (ضعيف الإسناد) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا) قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا أَخْبَارُهَا؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّ أَخْبَارَهَا أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا أَنْ تَقُولَ: عَمِلَ كَذَا وَكَذَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَهَذِهِ أَخْبَارُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (**يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ**

---

[1] لەسەردەمی نەفامیدا سەرۆك هۆز چواریەکی ماڵی خەڵکی پێ دەدرا.

**أَخْبَارَهَا**). واتە: لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەو هەواڵەی کە زەوی دەگێڕێتەوە چییە؟). وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش دەیزانن، فەرمووی: (ئەوەیە زەوی شایەتی دەدات لەسەر هەموو بەندەیە، چ پیاو بێ چ ژن کە چی کردووە لەسەر پشتی و دەڵێ: تۆ لەو ڕۆژە و لەو ڕۆژەدا ئەوە و ئەوەت کردووە). فەرمووی: (ئەوەیە هەواڵەکەی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڕەنا

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَأْنِ الصُّورِ

٢٤٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَسْلَمَ العِجْلِيِّ، عَنْ بِشْرِ بْنِ شَغَافٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: مَا الصُّورُ؟ قَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێکە عەرەبی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: ( (صور) چی یە؟) فەرمووی: شەیپور یان کەڕەنایە فووی پێدا دەکرێت). — ئیسرافیل دوو جار فووی پێدا دەکات -.

٢٤٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ أَبُو الْعَلاَءِ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ القَرْنِ قَدِ التَقَمَ القَرْنَ وَاسْتَمَعَ الإِذْنَ مَتَى يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ فَيَنْفُخُ فَكَأَنَّ ذَلِكَ ثَقُلَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُمْ: قُولُوا: حَسْبُنَا اللَّهُ

وَنِعْمَ الْوَكِيلُ عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ هَذَا الْحَدِيثُ عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

**واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: چۆن شاد و دڵخۆش بم لەکاتێکدا خاوەنی کەڕەنا کەڕەناکەی بەدەمەوەیە و گوێی هەڵخستووە و چاوەڕێییە کەی فەرمانی پێ بکرێ فووی پێدا بکات ). وەك بڵێی: ئەمە زۆر قورس بوو بەلای هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، بۆیە پێی فەرموون: (بڵێن: خوامان بەسە، ئەو چاکترین خۆ پێ سپێردراوە، پشتمان بەخوای خۆمان بەستووە).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پردی *(صراط)*.

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي شَأْنِ الصِّرَاطِ

٢٤٣٢ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: شِعَارُ الْمُؤْمِنِ عَلَى الصِّرَاطِ، رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ. وَفِي الْبَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

**واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دروشمی باوەڕدار لەسەر پردی (صراط) ئەمەیە: ئەی پەروەردگار بمپارێزە لەزیانی پردی (صراط) و سەلامەتم بکە).**

٢٤٣٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الصَّبَّاحِ الهَاشِمِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَدَلُ بْنُ الْمُحَبَّرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَرْبُ بْنُ مَيْمُونٍ الأَنْصَارِيُّ أَبُو الخَطَّابِ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَشْفَعَ لِي يَوْمَ القِيَامَةِ، فَقَالَ: أَنَا فَاعِلٌ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ فَأَيْنَ أَطْلُبُكَ؟ قَالَ: اطْلُبْنِي أَوَّلَ مَا تَطْلُبُنِي عَلَى الصِّرَاطِ. قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عَلَى الصِّرَاطِ؟ قَالَ: فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الْمِيزَانِ. قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عِنْدَ الْمِيزَانِ؟ قَالَ: فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الحَوْضِ فَإِنِّي لاَ أُخْطِئُ هَذِهِ الثَّلاَثَ الْمَوَاطِنَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەرۆژی قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکات، فەرمووی: (باشە شەفاعەتت بۆ دەکەم). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەکوێ پێویستیم بە شەفاعەتی تۆ هەیە و داوات لێ بکەم رزگارم بێ؟ فەرمووی: (یەکەمجار لەسەر پردی (صراط)، وتم: ئەگەر لەسەر پردی (صراط) پێت نەگەیشتم، فەرمووی: (لای تەرازوو واتە لەکاتی کێشانەو پێوانەی کردەوەکاندا)، وتم: ئەی ئەگەر لای تەرازوو پێت نەگەیشتم، فەرمووی: (لەسەر حەوزی کەوسەر، بێگومان لەم سێ شوێنە زیاتر بۆ هیچ شوێنێکی تر ناڕۆم هەردەبێ لە یەکێ لەو سێ شوێنە پێم بگەیت).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی شەفاعەت

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّفَاعَةِ

٢٤٣٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَحْمٍ فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ فَأَكَلَهُ وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ فَنَهَسَ

مِنْهَا نَهْسَةً ثُمَّ قَالَ: أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ هَلْ تَدْرُونَ لِمَ ذَاكَ؟ يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَيُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمُ البَصَرُ وَتَدْنُو الشَّمْسُ مِنْهُمْ فَيَبْلُغُ النَّاسُ مِنَ الغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَلاَ يَحْتَمِلُونَ. فَيَقُولُ النَّاسُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ النَّاسُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: عَلَيْكُمْ بِآدَمَ، فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: أَنْتَ أَبُو البَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنَّهُ قَدْ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ وَقَدْ سَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ نُوحٌ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنَّهُ قَدْ كَانَ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ أَنْتَ نَبِيُّ اللهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذِبَاتٍ، فَذَكَرَهُنَّ أَبُو حَيَّانَ فِي الحَدِيثِ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى فَيَأْتُونَ مُوسَى فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى أَنْتَ رَسُولُ اللهِ فَضَّلَكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ عَلَى البَشَرِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ: يَا عِيسَى أَنْتَ رَسُولُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ عِيسَى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَلَمْ يَذْكُرْ

ذَنْبًا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ، قَالَ: فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللهِ وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ وَقَدْ غُفِرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ العَرْشِ فَأَخِرُّ سَاجِدًا لِرَبِّي، ثُمَّ يَفْتَحُ اللهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالَ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ سَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أُمَّتِي يَا رَبِّ أُمَّتِي، يَا رَبِّ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِ مِنَ البَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الجَنَّةِ وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرَ وَكَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى.

وَفِي البَاب عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَأَنَسٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ سَعِيدِ بْنِ حَيَّانَ كُوفِيٌّ وَهُوَ ثِقَةٌ، وَأَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ اسْمُهُ: هَرِمٌ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی لە گۆشتی دەست بوو، دەستێ گۆشتی خواردنیان بۆ دانا قەپێکی لێ گرت و فەرمووی: (من گەورە و سەروەری خەڵکم لە رۆژی قیامەتدا، دەزانن ئەوەش لەبەر چییە؟ خوای گەورە پێشینان و پاشینان هەر هەموویان لە گۆڕەپانێکدا کۆدەکاتەوە کە بانگکەر دەنگی دەیانگاتێ و چاو دەیانبینێ، وە خۆر نزیك دەکەوێتەوەو خەڵك دەکەونە خەم و پەژارەو تەنگانەیەکی واوە لە وزەو توانایاندا نییەو نایتوانن، بۆیە لە ناو خۆیاندا دەڵێن: سەیری خۆتان ناکەن چیتان بەسەر هاتووە، حاڵتان چەند شرە، ئایا یەکێك نادۆزنەوە کە تکاتان بۆ بکات لای پەروەردگارتان، تاکو لەم تەنگانەیە رزگارتان بکات؟**

**جا هەندێك لە خەڵکی بە هەندێکی تریان دەڵێن: بچنە لای ئادەم، جا دەچنە**

خزمەتی و دەڵێن: ئەی ئادەم تۆ باوکی بەرەی ئادەمیزادی، خوا بەدەستی خۆی دروستیکردووی و لە روحی خۆی فووی بەبەردا کردووی، وە فەرمانی بە مەلائیکەکانی کردووە کڕنوشیان بۆ ببووی، دەی بفەرموو لەلای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە؟ ئایا نابینی لە چیداین و نابینی چیمان لێ بەسەر هاتووە توشی چی گۆبەندێك بووین؟!

ئادەم دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبونێك توڕە بووە هەرگیز پێشتر وا توڕە نەبووەو لە داهاتوشدا وا توڕە نابێتەوە، لە هەمان کاتدا هۆیەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە درەختەکەی لێ قەدەغەکردم سەرپێچیم لێ کرد، هەر بۆ خۆم دەپاڕێمەوەو بەس: خۆم، خۆم، خۆم، بچن بۆ لای یەکێکی دیکە، بچن بۆ لای نوح.

ئینجا دێنە لای نوح و دەڵێن: ئەی نوح! تۆ یەکەم پێغەمبەری رەوانەکراوی خوای بۆ سەر خەڵکی زەوی، وە خوا ناوی بەندەی سوپاسگوزار، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە! خۆ خۆت دەبینی ئێمە لە چ حاڵێکی ناخۆش داین و چیمان لێ قەوماوە؟ ئەویش پێیان دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبونێك توڕە بووە هەرگیز پێشتر وا توڕە نەبووەو لە داهاتوشدا وا توڕە نابێتەوە، وە من نزاو پاڕانەوەیەکم هەبوو لە رابوردودا لە گەلەکەمم کرد، خۆم، خۆم، خۆم، بچن بۆ لای یەکێکی تر، بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم.

ئینجا دەڕۆن بۆ لای ئیبراهیم و دەڵێن: ئەی ئیبراهیم! تۆ پێغەمبەری خواو دۆست و خۆشەویستی ئەوی، کەواتە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە! ئایا نابینی لە چ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چیمان لێ هاتووە؟ ئیبراهیمیش پێیان دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبونێك توڕە بووە هەرگیز پێشتر وا توڕە نەبووەو

لە داهاتوشدا وا تورە نابێتەوە، ئینجا باسی سێ درۆکانی خۆی کرد[1]، گوتی: هەر خۆم، هەر خۆم، هەر خۆم! بچنە لای یەکێکی دیکە، بچنە لای موسا.

ئینجا دەچنە خزمەت موساو دەڵێن: ئەی موسا! تۆ پێغەمبەری خوای، خوا بەهۆی پەیام و قسە لەگەڵ کردنتدا بەسەر خەڵکیدا هەڵی بژاردووی! بۆیە لای خوا تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی لە چ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چیمان لێ قەوماوە؟ موساش پێیان دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تورەبونێك تورە بووە هەرگیز پێشتر وا تورە نەبووەو لە داهاتوشدا وا تورە نابێتەوە، وە من کەسێکم کوشت فەرمانم پێ نەکرابوو بیکوژم، هەر هەر خۆم هەر خۆم، خۆم هەر خۆم، هەر خۆم هەر خۆم، بڕۆن بۆ لای عیسا.

ئینجا دەچنە لای عیساو دەڵێن: ئەی عیسا ! تۆ پێغەمبەری خوای، لە بێشکەدا قسەت لەگەڵ خەڵك کردووە، تۆ وشەی خوای گیانێکی لە خواوە بۆ مەریەمی نارد، جا تکامان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت، نابینی لە چ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چیمان لێ هاتووە؟ عیساش پێیان دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تورەبونێك تورە بووە هەرگیز پێشتر وا تورە نەبووەو لە داهاتوشدا وا تورە نابێتەوە، بەڵام باسی هیچ گوناهێکی نەکرد، هەر خۆم هەر خۆم، هەر خۆم، هەر خۆم! بچنە لای یەکێکی دیکە، بچنە لای موحەممەد.

ئینجا دێنە لای خۆم و دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ ڕەوانەکراوی خواو کۆتایی پێغەمبەرانی وە خوا لە گوناهی سەرەتاو کۆتایشت خۆش بووە، جا تکامان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت،ئایا سەرنج لەچی داین؟ ئایا سەرنج نادەی چیمان لێ هاتوە؟

---

[1] شایەنی باسە ئەم سێ درۆیە لە رواڵەتدا درۆ بوون ئەویش ئەمانەن: ١- ئەوە بوو کە گوتی من نەخۆشم تاکو نەچێتە دەرەوەو بتەکان بشکێنێ . ٢- کە گوتی بتە گەورەکەیان شکاندونی. ٣- کە سارای خێزانی بە خوشکی ناو برد تا دەربازی بکات لە پاشای میصر.

منیش دەڕۆم بۆ ژێر عەرش و سەجدەیەك بۆ خوا دەبەم و پاشان خوا دەروونم رۆشن دەکاتەوەو لە ستایش کردن و چاك پیاهەڵاگوتنی خۆی شتی وام فێر دەکات کە پێش من فێری کەسی تری نەکردووە. ئینجا دەگوترێ: ئەی موحەممەد! سەرت بەرزکەرەوە، داوا بکە دەتدرێتێ، تکا بکە تکات وەردەگیرێت،! منیش سەرم بەرزدەکەمەوەو دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئومەتەکەم، ئەی پەروەردگارم ئومەتەکەم، ئەی پەروەردگارم ئومەتەکەم، دەگوترێ: ئەی موحەممەد! سەرجەم ئەوانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نییە لە ئومەتت بیانخە بەهەشتەوە لە دەرگای راستی لە دەرگاکانی بەهەشت، وە لە دەرگاکانی تریشدا خەڵکی تری بەشدارن. جا سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە نێوان هەرکام لە دوو لاشیپانەکانی دەرگاکانی بەهەشت هێندەی مەککەو هەجەر، یان نێوانی مەککەو بوصرا دەبێت[1].

## باسێکی تر لەو بارەوە

### ١١ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٣٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا العَبَّاسُ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: شَفَاعَتِي لأَهْلِ الكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَاب عَنْ جَابِرٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەفاعەتی من ئەو کەسانە دەبێت کە لە ئومەتی منن و خاوەنی تاوانە گەورەکانن).

---

[1] شایەنی باسە (هجر) شارێکە لە یەمەن و (بصری)ش شارێکە لە شام.

٢٤٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: شَفَاعَتِي لأَهْلِ الكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ: فَقَالَ لِي جَابِرٌ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ الكَبَائِرِ فَمَا لَهُ وَلِلشَّفَاعَةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ يُسْتَغْرَبُ مِنْ حَدِيثِ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەفاعەتی من ئەو کەسانە دەبێت کە لە ئومەتی منن و خاوەنی تاوانە گەورەکانن). موحەممەدی کوڕی عەلی باوکی جەعفەری صادق وتی: جابیر پێی وتم: ئەی موحەممەد، ئەگەر کەسێ خاوەنی تاوانە گەورەکان نەبێ پێویستی بە شەفاعەت نییە، تاعەت و پەرستشەکان گوناهو تاوانە بچوکەکان دەسڕنەوە.

## باسێکی تر لەو بارەوە

١٢ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ الأَلْهَانِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلاَ عَذَابَ مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعُونَ أَلْفًا وَثَلاَثُ حَثَيَاتٍ مِنْ حَثَيَاتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم حەفتا هەزار کەس لە ئومەتی من بەبێ لێپرسینەوە و سزاو تۆڵە

بخاتە بەهەشتەوە، لەگەڵ هەر هەزار کەسێکیاندا حەفتا هەزار کەسی تریش و سێ مشتیش بە مشتی پەروەردگارم).

٢٤٣٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَهْطٍ بِإِيلِيَاءَ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: يَدْخُلُ الجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَكْثَرُ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ سِوَاكَ؟ قَالَ: سِوَايَ. فَلَمَّا قَامَ قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا ابْنُ أَبِي الجَذْعَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَابْنُ أَبِي الجَذْعَاءِ هُوَ: عَبْدُ اللهِ، وَإِنَّمَا يُعْرَفُ لَهُ هَذَا الحَدِيثُ الْوَاحِدُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە ئیلیا لەگەڵ کۆمەڵێکدا بووم، پیاوێکیان وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (خوای گەورە بەهۆی شەفاعەتی کەسێ لە ئوممەتەکەمەوە زیاتر لەهۆزی بەنی تەمیم دەخاتە بەهەشتەوە کە هۆزێك بوو ژمارەیان زۆر زۆر بوو، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمە جگە لە شەفاعەتی تۆ؟ فەرمووی: (بەڵێ، جگە لە شەفاعەتی من)، کاتێ کە هەستا وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە (ابْنُ أَبِي الجَذْعَاءِ)ە.

٢٤٣٩ - حَدَّثَنَا أَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ الْكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الْيَمَانِ، عَنْ جِسْرٍ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنِ الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: يَشْفَعُ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمِثْلِ رَبِيعَةَ، وَمُضَرَ[1].

واتە: لە حەسەنی بەصریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەڕۆژی قیامەتدا

[1] قال بشار: قلنا: هذا الحديث المرسل ليس من "جامع الترمذي": إذ لم نجده في شيء من النسخ التي بين أيدينا، ولاذكره المزي في "تحفة الأشراف"، ولا استدركه عليه المستدركون، وأيضًا فإن في رجال إسناده من ليس من الكتب الستة أصلاً.

پێشەوا (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ شەفاعەت دەکات بۆ خەڵکانێ ژمارەیان هێندەی ژمارەی هۆزی ڕەبیعە و (مضر) دەبێ کە دوو هۆزی بەناوبانگ بوون.

٢٤٤٠ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَشْفَعُ لِلْفِئَامِ مِنَ النَّاسِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْقَبِيلَةِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْعَصَبَةِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلرَّجُلِ حَتَّى يَدْخُلُوا الجَنَّةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان هەندێ کەسانی ئومەتی من شەفاعەت دەکەن بۆ کۆمەڵانێ لە خەڵك، هەیانە شەفاعەت دەکات بۆ تیرە و هۆزێ، هەیانە شەفاعەت دەکات بۆ کۆمەڵێ ژمارەیان لەنێوان دە کەس بۆ چل کەس دەبێ، هەشیانە شەفاعەت دەکات بۆ کەسێ هەتا دەیباتە بەهەشتەوە).

## باسێکی تر لەو بارەوە

١٣ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٤١ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الجَنَّةَ وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ، فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ، وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ رَجُلٍ آخَرَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَذْكُرْ عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێرراوێ لەلایەن پەروەردگارمەوە هات بۆلام لەنێوان شەفاعەت کردن بۆ ئوممەتەکەم و نیوەی ئوممەتەکەم بخەمە بەهەشتەوە سەرپشکی کردم، منیش شەفاعەتم هەڵبژارد، ئەویش بۆ کەسێکە بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتەکانی حەوزی کەوسەر

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الحَوْضِ

٢٤٤٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ شُعَيْبِ بْنِ أَبِي حَمْزَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ فِي حَوْضِي مِنَ الأَبَارِيقِ بِعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەسەر حەوزەکەم هێندەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان سوراحی هەیە).

٢٤٤٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ نِيزَكَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارٍ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوْضًا وَإِنَّهُمْ يَتَبَاهَوْنَ أَيُّهُمْ أَكْثَرُ وَارِدَةً، وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ وَارِدَةً. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رَوَى الأَشْعَثُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، هَذَا الحَدِيثَ عَنِ الحَسَنِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ سَمُرَةَ وَهُوَ أَصَحُّ.

واتە: لە سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەرجەم پێغەمبەران

هەریەکەیان حەوزێکی هەیە، شانازی دەکەن بەوەی حەوزی کامیان خەڵکی زۆرتر دەچێتە سەری، ئومێدەوارم زۆرترین خەڵك بێتە سەر حەوزەکەی من).

## سیفەتی پەرداخ و دۆلکەو سوراحیەکانی سەر حەوزەکە

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ أَوَانِي الحَوْضِ

٢٤٤٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُهَاجِرِ، عَنِ العَبَّاسِ، عَنْ أَبِي سَلاَّمٍ الحَبَشِيِّ، قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ فَحُمِلْتُ عَلَى البَرِيدِ، قَالَ: فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لَقَدْ شَقَّ عَلَى مَرْكَبِي البَرِيدُ، فَقَالَ: يَا أَبَا سَلاَّمٍ مَا أَرَدْتُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ وَلَكِنْ بَلَغَنِي عَنْكَ حَدِيثٌ تُحَدِّثُهُ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الحَوْضِ فَأَحْبَبْتُ أَنْ تُشَافِهَنِي بِهِ، قَالَ أَبُو سَلاَّمٍ، حَدَّثَنِي ثَوْبَانُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: حَوْضِي مِنْ عَدَنَ إِلَى عَمَّانَ البَلْقَاءِ، مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ، وَأَكْوَابُهُ عَدَدُ نُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا، أَوَّلُ النَّاسِ وُرُودًا عَلَيْهِ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ، الشُّعْثُ رُءُوسًا، الدُّنْسُ ثِيَابًا الَّذِينَ لاَ يَنْكِحُونَ الْمُتَنَعِّمَاتِ وَلاَ تُفْتَحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السُّدَدِ قَالَ عُمَرُ: لَكِنِّي نَكَحْتُ الْمُتَنَعِّمَاتِ، وَفُتِحَ لِيَ السُّدَدُ، وَنَكَحْتُ فَاطِمَةَ بِنْتَ عَبْدِ الْمَلِكِ لاَ جَرَمَ أَنِّي لاَ أَغْسِلُ رَأْسِي حَتَّى يَشْعَثَ، وَلاَ أَغْسِلُ ثَوْبِي الَّذِي يَلِي جَسَدِي حَتَّى يَتَّسِخَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو سَلاَّمٍ الحَبَشِيُّ اسْمُهُ: مَمْطُورٌ وَهُوَ شَامِيٌّ ثِقَةٌ.

واتە: لە ئەبو سەلامی حەبەشیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: عومەری کوڕی (عبد العزیز) ناردی بۆلام، سواری ئێستریّ کرام، وتی: کاتیّ کە چووە لای فەرمووی: ئەی پێشەوای باوەڕداران! ولاخەکە زۆر ئەزیەتی دام، فەرمووی: ئەی

ئەبا سەلام! نەمویست ئەزیەتت بدەم، بەڵكو پێم گەیشتبوو كە فەرموودەیەكت دەربارەی حەوزەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە(ثوبان)ەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ گێڕاوەتەوە، بۆیە پێم خۆش بوو روو بە روو لەخۆتی ببیستم، ئەبو سەلام فەرمووی: لە(ثوبان)ەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەسافەی حەوزەكەم لە عەدەنەوە بۆ عومانی بەلقا دەبیٚ كە ناوچەیە بووە لە یەمەن، ئاوەكەی لە شیر سپی ترە، لە هەنگوین خۆشتر و شیرین ترە، كوپ و پەرداخەكانی هێندەی ژمارەی ئەستێرەكانی ئاسمانن، هەر كەسێك قومێكی لیٚ بخواتەوە هەرگیز تینوی نابیٚ،، یەكەم كەسانیٚ دەچنە سەر حەوزەكەم لە هەژارەكانی كۆچەرانن، قژی سەریان ئاڵۆسكاو و پەرش و بڵاوە، جل و بەرگیان چڵكنە، ئافرەتە خۆشگوزەرانەكان شوویان پیٚ ناكەن و دەرگاشیان لیٚ ناكەنەوە). عومەری كوڕی (عبد العزيز) فەرمووی: بەڵام من (فاطمـة)ی كچی (عبد الملك)م مارەكردووە كچی خەلیفەیە باپیری خەلیفە بووە، خوشكی چەند خەلیفەیەكیشە، كەواتە قژم داناهێنم هەتا دەئاڵۆسكیٚ و پەرش و بڵاو دەبنەوە، ئەم جل و بەرگانەی كە لەبەرم دایە نایانشۆم هەتا چڵكن دەبن.

٢٤٤٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ الصَّمَدِ العَمِّيُّ عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الجَوْنِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الصَّامِتِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا آنِيَةُ الحَوْضِ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ مُصْحِيَةٍ مِنْ آنِيَةِ الجَنَّةِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ، آخِرَ مَا عَلَيْهِ عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ مَا بَيْنَ عُمَانَ إِلَى أَيْلَةَ مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. وَفِي الْبَاب عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَأَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَحَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ، وَالمسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ. وَرُوِي

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حَوْضِي كَمَا بَيْنَ الْكُوفَةِ إِلَى الْحَجَرِ الأَسْوَدِ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، ژمارەی دەفرە و قاپەکانی حەوز چەندن؟ فەرمووی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بە دەستە، ژمارەی دەفرە و قاپەکانی زیاترە لە ژمارەی کەوکەب و ئەستێرەکانی ئاسمان لەشەوێکی تاریکدا کە هەور نەبێ، هەر کەسێك قومێکی لێ بخواتەوە هەرگیز تینوی نابێ، پانی و درێژی وەك یەکە مەسافەکەی لە عومانەوە بۆ ئەیلەیە، رەنگی ئاوەکەی لە شیر سپی ترە، لە هەنگوین خۆشتر و شیرین ترە).

١٦ - بَابٌ

٢٤٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ يُونُسَ كُوفِيٌّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْثَرُ بْنُ القَاسِمِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ هُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا أُسْرِيَ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَعَلَ يَمُرُّ بِالنَّبِيِّ وَالنَّبِيَّيْنِ وَمَعَهُمُ القَوْمُ وَالنَّبِيِّ وَالنَّبِيَّيْنِ وَمَعَهُمُ الرَّهْطُ وَالنَّبِيِّ وَالنَّبِيَّيْنِ وَلَيْسَ مَعَهُمْ أَحَدٌ حَتَّى مَرَّ بِسَوَادٍ عَظِيمٍ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قِيلَ: مُوسَى وَقَوْمُهُ وَلَكِنِ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَانْظُرْ. قَالَ: فَإِذَا هُوَ سَوَادٌ عَظِيمٌ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ مِنْ ذَا الجَانِبِ وَمِنْ ذَا الجَانِبِ، فَقِيلَ هَؤُلاَءِ أُمَّتُكَ وَسِوَى هَؤُلاَءِ مِنْ أُمَّتِكَ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ، فَدَخَلَ وَلَمْ يَسْأَلُوهُ وَلَمْ يُفَسِّرْ لَهُمْ فَقَالُوا: نَحْنُ هُمْ، وَقَالَ قَائِلُونَ: هُمْ أَبْنَاءُ الَّذِينَ وُلِدُوا عَلَى الفِطْرَةِ وَالإِسْلاَمِ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: هُمُ الَّذِينَ لاَ يَكْتَوُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ: أَنَا مِنْهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: نَعَمْ،

ثُمَّ قَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَنَا مِنْهُمْ؟ فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَاب عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەو شەوەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەورەوی پێ کرا بۆ ئاسمان دەیدا بەلای پێغەمبەراندا هەیان بوو گەلێکی لەگەڵ بوو، هەیان بوو کۆمەڵێکی لەگەڵ بوو، هەشیان بوو کەسی لەگەڵ نەبوو، هەتا دای بەلای خەڵکانێکی زۆر زۆردا، وتم: (ئەوە کێیە؟) وتیان: ئەوە موساو گەلەکەیەتی، بەڵام سەرهەڵبڕە و سەیرکە، فەرمووی: (خەڵکانێکی زۆر زۆر و بێ شومارم دی لەم لاو لەو لاوە ئاسۆی داگرتبوو، وترا: ئەوە ئومەتەکەتە جگە لەوانەش حەفتا هەزاریان بەبێ حساب و لێپێچینەوە چوونەتە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی نەکرد ئەوانە کێن و چووە ژوورەوە، هاوەڵان وتیان: ئێمە ئەوانەین: قسەکەران وتیان: ئەوانە منداڵی ئەوانەن لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام لەدایك بوون، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەدەرەوە و فەرمووی: (ئەوانە ئەو کەسانەن لەبەر نەخۆشی خۆیان داخ ناکەن، نە نوشتە دەکەن بۆ خەڵك نە نوشتەش دەکەن بۆ خۆیان لەلای کەسێکی تر، نوقڵانەی خراپ لێ نادەن و رەشبین نین، پشت بە خوای خۆیان دەبەستن). عوکاشەی کوڕی میحصەن هەستایەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من یەکێکم لەوانە؟ فەرمووی: (بەڵێ). لەپاشدا کەسێکی تر هەستا وتی: من یەکێکم لەوانە؟ فەرمووی: (عوکاشە لەوبارەوە پێشتکەوت).

١٧ - بَابٌ

٢٤٤٧ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ الرَّبِيعِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الجَوْنِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: مَا أَعْرِفُ شَيْئًا مِمَّا كُنَّا عَلَيْهِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: أَيْنَ الصَّلاَةُ؟ قَالَ: أَوَلَمْ تَصْنَعُوا فِي صَلاَتِكُمْ مَا قَدْ عَلِمْتُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي عِمْرَانَ الجَوْنِيِّ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ.

**واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێ نازانم هیچ شتێ کە ئێمە لەسەری بووین لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم وەك خۆی مابێتەوە، وتم: ئەی نوێژەکان چی؟ فەرمووی: ئەی نابینن چیتان بەسەر نوێژەکانتان هێناوە لەکاتی یەکەمی خۆیاندا جێبەجێیان ناکەن و پارێزگاریان لێ ناکەن.**

٢٤٤٨ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى الأَزْدِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ عَبْدِ الوَارِثِ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَاشِمٌ وَهُوَ ابْنُ سَعِيدٍ الكُوفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدٌ الخَثْعَمِيُّ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ الخَثْعَمِيَّةِ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ تَخَيَّلَ وَاخْتَالَ وَنَسِيَ الكَبِيرَ الْمُتَعَالِ، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ تَجَبَّرَ وَاعْتَدَى وَنَسِيَ الجَبَّارَ الأَعْلَى، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ سَهَا وَلَهَا وَنَسِيَ الْمَقَابِرَ وَالبِلَى، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ عَتَا وَطَغَى وَنَسِيَ الْمُبْتَدَا وَالمُنْتَهَى، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ يَخْتِلُ الدُّنْيَا بِالدِّينِ، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ يَخْتِلُ الدِّينَ بِالشُّبُهَاتِ، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ طَمَعٌ يَقُودُهُ، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ هَوًى يُضِلُّهُ، بِئْسَ العَبْدُ عَبْدٌ رَغَبٌ يُذِلُّهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ.

**واتە: لە ئەسمای کچی عومەیسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو**

دەیفەرموو: (خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە لەدەروونی خۆیدا خۆی لەلا مەزن بێت و خۆی بە گەورە بزانێ و فیز بکات بەسەر خەڵکدا، شکۆمەندی و بڵندی و پایەداری خوای گەورە لەیاد بکات، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە زوڵم و ستەم بکات و خاوەن دەسەڵاتی ناچارکەری بڵند لەیاد بکات، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە غافڵ و بێ ئاگا بێ لە هەق و پەرستشەکان و خۆی سەرقاڵ بکات بە شتی پڕ و پوچ و شتی بێ مانا وە و مردن و گۆڕستان و رزینی جەستەی لەیاد بکات، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە خراپەکاری بکات و سنورەکان ببەزێنێ و سەرەتای خۆی و کۆتایی خۆی لەیاد بکات کە سەرەتا لە نوتفەیەکەوە دروست بووە و سەرەنجامی لەناو گۆڕدا ئێسك و وسکی دەرزێت و دەبێتەوە بە خۆڵ، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە بە کردەوەی دوارۆژ داوای ژیانی دونیا بکات دینەکەی بفرۆشێ بە دونیا، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە بە شوبوهات دینەکەی هەڵوەشێنێتەوە، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە تەماع و چاوچنۆکی رایکێشێ بۆ گوناهو تاوان بەرامبەر بە خوا، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە هەواو هەوەس پەرستی گومڕای بکات، خراپترین بەندە ئەو بەندەیە کە هیوا زۆری و دونیاویستی زەلیل و سەرشۆڕی بکات و بیکاتە پەندی زەمانە).

١٨ - بَابٌ

٢٤٤٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ الْمُؤَدِّبُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَمَّارُ بْنُ مُحَمَّدٍ، ابْنُ أُخْتِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الجَارُودِ الأَعْمَى وَاسْمُهُ زِيَادُ بْنُ الْمُنْذِرِ الهَمْدَانِيُّ، عَنْ عَطِيَّةَ العَوْفِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّمَا مُؤْمِنٍ أَطْعَمَ مُؤْمِنًا عَلَى جُوعٍ أَطْعَمَهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ ثِمَارِ الجَنَّةِ، وَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَقَى مُؤْمِنًا عَلَى ظَمَإٍ سَقَاهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنَ الرَّحِيقِ الْمَخْتُومِ، وَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ كَسَا مُؤْمِنًا عَلَى عُرْيٍ كَسَاهُ اللَّهُ مِنْ خُضْرِ الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مَوْقُوفًا، وَهُوَ أَصَحُّ عِنْدَنَا وَأَشْبَهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ خۆراك بدات بە موسوڵمانێکی برسی و تێری بکات خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا لە بەروبووم و میوەی بەهەشت تێری دەکات، وە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی تینو تێراو بکات خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا شەرابی پاکی سەرمۆری بەهەشتی دەرخوارد دەدا، هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی رووت پۆشتە بکاتەوە ئەوە خوای گەورە لە پۆشاکی سەوزی بەهەشت پۆشتەی دەکاتەوە).

٢٤٥٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي النَّضْرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو النَّضْرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَقِيلٍ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو فَرْوَةَ يَزِيدُ بْنُ سِنَانٍ التَّمِيمِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي بُكَيْرُ بْنُ فَيْرُوزَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ غَالِيَةٌ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ الجَنَّةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي النَّضْرِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بترسێت لەسەرەتای شەوەوە زوو بەرێ دەکەوێت، هەرکەس زوو بەرێ بکەوێت دەگاتە مەنزڵ واتە ئەو جێگایەی کە خۆی دەیەوێت، هۆشیاربن بێگومان کاڵای خوای گەورە گران بەهایە، هۆشیاربن بێگومان کاڵای خوای گەورە بەهەشتە).

١٩ - بَابٌ

٢٤٥١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي النَّضْرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو النَّضْرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَقِيلٍ الثَّقَفِيُّ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَقِيلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: حَدَّثَنِي رَبِيعَةُ بْنُ يَزِيدَ، وَعَطِيَّةُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عَطِيَّةَ السَّعْدِيِّ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَبْلُغُ العَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ حَتَّى يَدَعَ مَا لاَ بَأْسَ بِهِ حَذَرًا لِمَا بِهِ البَأْسُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە (عطیة)ی كوڕی سەعدیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پلەو پایەی بەندە ناگاتە پلەو پایەی لەخوا ترساوان و خاوەن تەقواكان هەتا وازنەهێنێ لە شتانێ كە هیچی تێدا نییە، لەترسی ئەوەی نەوەكا بكەوێتە ناو شتانێكی حەرامەوە).

٢٠ - بَابٌ

٢٤٥٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ أَنَّكُمْ تَكُونُونَ كَمَا تَكُونُونَ عِنْدِي لأَظَلَّتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيْدِيِّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَاب عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە (حنظلة)ی ئەسەدیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر هەر بەو شێوەیە بن كە لەلای منن و لەكۆڕ و دانیشتنی مندان مەلائیكە بە باڵی سێبەرتان بۆ دەكات).

**باسێکی تر لەو بارەوە**

٢١ - بَابٌ مِنْهُ

٢٤٥٣ - (حسن) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ سَلْمَانَ أَبُو عُمَرَ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنِ القَعْقَاعِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ شِرَّةً وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةً، فَإِنْ كَانَ صَاحِبُهَا سَدَّدَ وَقَارَبَ فَارْجُوهُ، وَإِنْ أُشِيرَ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ فَلاَ تَعُدُّوهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يُشَارَ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ فِي دِينٍ أَوْ دُنْيَا إِلاَّ مَنْ عَصَمَهُ اللَّهُ "

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو ئیش و کارێ سەرتاکەی بە چالاکی و گەرم و گوڕی دەست پێ دەکات، چالاکی و گەرم و گوڕیش ماوەیەکە خاوبوونەوەی لەدوایە، جا ئەگەر خاوەن ئیش ژیرانە و مامناوەندیانە کاری کرد ئەوە هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم، بەڵام ئەگەر ئاماژەی بۆ کرا بە پەنجە ئەوە بە باشی مەزانن).**

٢٢ - بَابٌ

٢٤٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي يَعْلَى، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطًّا مُرَبَّعًا، وَخَطَّ فِي وَسَطِ الخَطِّ خَطًّا، وَخَطَّ خَارِجًا مِنَ الخَطِّ خَطًّا، وَحَوْلَ الَّذِي فِي الوَسَطِ خُطُوطًا، فَقَالَ: هَذَا ابْنُ آدَمَ

وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ، وَهَذَا الَّذِي فِي الوَسَطِ الإِنْسَانُ، وَهَذِهِ الخُطُوطُ عُرُوضُهُ إِنْ نَجَا مِنْ هَذَا يَنْهَشُهُ هَذَا، وَالخَطُّ الخَارِجُ الأَمَلُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەتێکی چوارگۆشەی بۆ کێشاین، جا لەناوەڕاستی ئەو خەتە چوارگۆشەیەوە خەتێکی درێژی کێشا هەتا دەرەوە، لەسەر خەتەکەی دەرەوە خەتێکی تری کێشا، ئینجا لەدەوروبەری خەتەکەی ناوڕاست چەند خەتێکی وردی کێشا، فەرمووی: (ئەمە ئادەمیزادە و ئەمەش ناکامەکەیەتی لەهەموو لایەکەوە دەورەی داوە، خەتی ناوەڕاست ئینسانە، ئەم خەتە وردانەش دەرد و بەڵاو مەینەتی و برسێتی و تینوێتییە، ئەگەر لە هەندێکیان ڕزگاری بوو لە هەندێکی تریان ڕزگاری نابێ وەك مار و گەزەندە دەیگەزن، خەتەکەی دەرەوەش هیواو ئاواتەکانیەتی).

٢٤٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَتَشُبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ: الحِرْصُ عَلَى الْمَالِ وَالحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئادەمیزاد پیر دەبێ بەڵام دوو شتی بەگەنجی و تێدا دەمێنێتەوە: هەڵپە بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و، پەرۆشی بۆ تەمەن درێژی).

٢٤٥٦ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ مُحَمَّدُ بْنُ فِرَاسٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ سَلْمُ بْنُ قُتَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو العَوَّامِ وَهُوَ عِمْرَانُ القَطَّانُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مُثِّلَ ابْنُ

آدَمَ وَإِلَى جَنْبِهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ مَنِيَّةً إِنْ أَخْطَأَتْهُ الْمَنَايَا وَقَعَ فِي الْهَرَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شیخیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نمونەی ئادەمیزاد نەوەدو نۆ مەرگی بە تەنیشتەوەیە، ئەگەر ئەوانەشی بۆ رێك نەکەوێ ئەوا پیر دەبێ و دەمرێت).

٢٣ - بَابٌ

٢٤٥٧ - (حسن) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ذَهَبَ ثُلُثَا اللَّيْلِ قَامَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا اللهَ اذْكُرُوا اللهَ جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ جَاءَ الْمَوْتُ بِمَا فِيهِ جَاءَ الْمَوْتُ بِمَا فِيهِ، قَالَ أُبَيٌّ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أُكْثِرُ الصَّلَاةَ عَلَيْكَ فَكَمْ أَجْعَلُ لَكَ مِنْ صَلَاتِي؟ فَقَالَ: مَا شِئْتَ. قَالَ: قُلْتُ: الرُّبُعَ، قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ: النِّصْفَ، قَالَ: مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قَالَ: قُلْتُ: فَالثُّلُثَيْنِ، قَالَ: مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ: أَجْعَلُ لَكَ صَلَاتِي كُلَّهَا قَالَ: إِذًا تُكْفَى هَمَّكَ، وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ دوو سێیەکی شەو دەڕۆشت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەڵەسا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە یادی خوا بکەن، یادی خوا بکەن واهات فووی یەکەم دەکرێت بە کەڕەنادا دەستبەجێ زەوی بە توندی تەکان دەدات و دەکەوێتە لەرزەو ژێرەو ژوور دەبێ، دووبارە فووی پیا دەکرێتەوەو ئاسمان

لەت لەت دەبێ و هەرچی ئەستێرەی لەخۆی گرتووە هەڵئەوەرێ، مردن هات بە خۆی و هەرچی تێدایە، مردن هات بە خۆی و هەرچی تێدایە)، ئوبەی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من سڵاوات زۆر دەدەم لەدیداری تۆ، کاتی پاڕانەوە و تاعەت و عیبادەت چەنێ لە کاتم دانێم بۆ سڵاواتدان لەدیداری تۆ؟ فەرمووی: (بە ئارەزووی خۆت)، وتم: چواریەکی دانێم بۆ سڵاواتدان؟ فەرمووی: (بە ئارەزووی خۆت ئەگەر زیاتری بکەی ئەوە باشترە بۆت)، وتم: نیوەی دانێم؟ فەرمووی: (بە ئارەزووی خۆت ئەگەر زیاتری بکەی ئەوە باشترە بۆت)، وتم: دوو سێیەکی دانێم بۆ سڵاواتدان؟ فەرمووی: (بە ئارەزووی خۆت ئەگەر زیاتری بکەی ئەوە باشترە بۆت)، وتم: هەمووی دانێم بۆ سڵاواتدان؟ فەرمووی: (کەواتە خەمی هیچت نەبێ، خوای گەورە لە سەرجەم گوناهەکانت خۆش دەبێ).

٢٤ - بَابٌ

٢٤٥٨ - (حسن) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ أَبَانَ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ الصَّبَّاحِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ مُرَّةَ الهَمْدَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اسْتَحْيُوا مِنَ اللهِ حَقَّ الحَيَاءِ. قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا نَسْتَحْيِي وَالحَمْدُ لِلَّهِ، قَالَ: لَيْسَ ذَاكَ، وَلَكِنَّ الإِسْتِحْيَاءَ مِنَ اللهِ حَقَّ الحَيَاءِ أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى، وَالبَطْنَ وَمَا حَوَى، وَلْتَذْكُرِ الْمَوْتَ وَالبِلَى، وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيَا، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ اسْتَحْيَا مِنَ اللهِ حَقَّ الحَيَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبَانَ بْنِ إِسْحَاقَ عَنِ الصَّبَّاحِ بْنِ مُحَمَّدٍ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شەرم لەخوا بکەن شەرمی ڕاستەقینە)، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم،

سوپاس بۆ خوا ئێمە شەرم لەخوا دەکەین، فەرمووی: (شەرمی راستەقینە ئەوە نیە، بەڵکو شەرمی راستەقینە لە خوا ئەوەیە مرۆڤ پارێزگاری بکات لە سەری و هۆشی و چاوی و زمانی و گوێی و و سکی و ئەوەی کە پێوەی نوساوە وەك دڵی و شەرمگەیی و قاچەکانی و دەستەکانی، یادی مردن و رزینی جەستەی بکات لە گۆڕدا، هەرکەس ژیانی دوارۆژی دەوێ واز لە جوانی رازوەیی ژیانی دونیا دێنێ، هەرکەس ئەوانەی ئەنجامدا کە باسکران ئەوە بەڕاستی شەرمی راستەقینەی لە خوا کردووە).

٢٥ - بَابٌ

٢٤٥٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ (ح) وحَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ ضَمْرَةَ بْنِ حَبِيبٍ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا وَتَمَنَّى عَلَى اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ: مَنْ دَانَ نَفْسَهُ يَقُولُ حَاسَبَ نَفْسَهُ فِي الدُّنْيَا قَبْلَ أَنْ يُحَاسَبَ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَيُرْوَى عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: حَاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحَاسَبُوا، وَتَزَيَّنُوا لِلْعَرْضِ الأَكْبَرِ، وَإِنَّمَا يَخِفُّ الحِسَابُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى مَنْ حَاسَبَ نَفْسَهُ فِي الدُّنْيَا. وَيُرْوَى عَنْ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ، قَالَ: لاَ يَكُونُ العَبْدُ تَقِيًّا حَتَّى يُحَاسِبَ نَفْسَهُ كَمَا يُحَاسِبُ شَرِيكَهُ مِنْ أَيْنَ مَطْعَمُهُ وَمَلْبَسُهُ.

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کەسی ژیر و هۆشیار ئەو کەسەیە موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات و کار دەکات بۆ دوای مردن — لەدونیادا

موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات پێش ئەوەی لە قیامەتدا موحاسەبەی بکەن - ، کەسی کەمتەرخەم و نەفام و گەمژەش ئەو کەسەیە شوێن هەواو هەوەسی خۆی بکەوێ و هیواو ئاواتی ئەوەبێ خوا لێی خۆش ببێ).

دەگێڕنەوە کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: لەدونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆتان بکەن لەپێش ئەوەی لە قیامەتدا موحاسەبەتان بکەن، خۆتان ئامادەبکەن بۆ نمایش و نیشاندانی گەورە، ئەوەی لەدونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆی بکات، لە قیامەتدا موحاسەبەی سوك و ئاسانە).

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسی ژیر و هۆشیار ئەو کەسەیە موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات و کار دەکات بۆ دوای مردن — لەدونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات پێش ئەوەی لە قیامەتدا موحاسەبەی بکەن - ، کەسی کەمتەرخەم و نەفام و گەمژەش ئەو کەسەیە شوێن هەواو هەوەسی خۆی بکەوێ و هیواو ئاواتی ئەوەبێ خوا لێی خۆش ببێ).

دەگێڕنەوە کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: لەدونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆتان بکەن لەپێش ئەوەی لە قیامەتدا موحاسەبەتان بکەن، خۆتان ئامادەبکەن بۆ نمایش و نیشاندانی گەورە، ئەوەی : لەدونیادا موحاسەبەی نەفسی خۆی بکات، لە قیامەتدا موحاسەبەی سوك و ئاسانە).

لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بەندە نابێتە کەسێکی خاوەن تەقوا هەتا موحاسەبەی نەفسی خۆی نەکات وەك چۆن موحاسەبەی شەریکەکەی دەکات خواردن و پۆشاکەکەی لەکوێ بوو.

٢٦ - بَابٌ

٢٤٦٠ - **(ضعيف جدا)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ وَهُوَ ابْنُ مَدُّوَيْهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ الحَكَمِ العُرَنِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ الوَلِيدِ الوَصَّافِيُّ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُصَلاَّهُ فَرَأَى نَاسًا كَأَنَّهُمْ يَكْتَشِرُونَ قَالَ: أَمَا إِنَّكُمْ لَوْ أَكْثَرْتُمْ ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ لَشَغَلَكُمْ عَمَّا أَرَى، فَأَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ الْمَوْتِ، فَإِنَّهُ لَمْ يَأْتِ عَلَى القَبْرِ يَوْمٌ إِلاَّ تَكَلَّمَ فِيهِ فَيَقُولُ: أَنَا بَيْتُ الغُرْبَةِ وَأَنَا بَيْتُ الوَحْدَةِ، وَأَنَا بَيْتُ التُّرَابِ، وَأَنَا بَيْتُ الدُّودِ، فَإِذَا دُفِنَ العَبْدُ الْمُؤْمِنُ قَالَ لَهُ القَبْرُ: مَرْحَبًا وَأَهْلاً أَمَا إِنْ كُنْتَ لأَحَبَّ مَنْ يَمْشِي عَلَى ظَهْرِي إِلَيَّ، فَإِذْ وُلِّيتُكَ اليَوْمَ وَصِرْتَ إِلَيَّ فَسَتَرَى صَنِيعِيَ بِكَ قَالَ: فَيَتَّسِعُ لَهُ مَدَّ بَصَرِهِ وَيُفْتَحُ لَهُ بَابٌ إِلَى الجَنَّةِ. وَإِذَا دُفِنَ العَبْدُ الفَاجِرُ أَوِ الكَافِرُ قَالَ لَهُ القَبْرُ: لاَ مَرْحَبًا وَلاَ أَهْلاً أَمَا إِنْ كُنْتَ لأَبْغَضَ مَنْ يَمْشِي عَلَى ظَهْرِي إِلَيَّ، فَإِذْ وُلِّيتُكَ اليَوْمَ وَصِرْتَ إِلَيَّ فَسَتَرَى صَنِيعِيَ بِكَ قَالَ: فَيَلْتَئِمُ عَلَيْهِ حَتَّى تَلْتَقِيَ عَلَيْهِ وَتَخْتَلِفَ أَضْلاَعُهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِأَصَابِعِهِ، فَأَدْخَلَ بَعْضَهَا فِي جَوْفِ بَعْضٍ قَالَ: وَيُقَيِّضُ اللَّهُ لَهُ سَبْعِينَ تِنِّينًا لَوْ أَنَّ وَاحِدًا مِنْهَا نَفَخَ فِي الأَرْضِ مَا أَنْبَتَتْ شَيْئًا مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا فَيَنْهَشْنَهُ وَيَخْدِشْنَهُ حَتَّى يُفْضَى بِهِ إِلَى الحِسَابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّمَا القَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

**واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ نوێژگاکەی بینی خەڵك زەردەخەنە دەکەن و پێدەکەنن، فەرمووی: (خۆزگە یادی مردنتان زیاتر بکردایە ئەو مردنەی کە سەرجەم خۆشیەکان تێك دەشکێنێ و لەناویان دەبات، بێگومان هەموو ڕۆژێ گۆڕ دەڵێ: من ماڵی غوربەت و تەنیاییم، ئەوەی بگرمە خۆم دەبێ غەریب**

و تەنیا بیّ، من ماڵی گلّ و کرمم ئەوەی بگرمە خۆم خۆڵ و کرم دەیخوات، کاتیّ کە بەندەی باوەڕدار ئەسپەردەی خاك کرا گۆڕ پێی دەڵیّ: مەرحەبات لیّ بیّ بەهۆی کردەوە چاکەکانتەوە شوێنێکی فراوانت دەستکەوت، تۆ چاکترین و خۆشەویست کەس بویت بەسەر پشتی مندا دەڕۆشتی ئەمڕۆ منیش دەسەڵاتم هەیە بەسەرتا سەیرکە بزانە چۆن بە چاکە رەفتارت گەڵ دەکەم و فروان دەبم بۆت ئیتر هەتا چاو بڕ بکات فراوان دەبیّ بۆی، دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە بەرەو بەهەشت، کاتیّ کە بەندەی لەڕیّ دەرچوو بیّ باوەڕ ئەسپەردەی خاك کرا گۆڕ پێی دەڵیّ: مەرحەبات لیّ نەبیّ بەهۆی کردەوە خراپەکانتەوە شوێنێکی تەنگەلانت دەستکەوت، تۆ بێزراوترین و خراپترین کەس بویت بەسەر پشتی مندا دەڕۆشتی ئەمڕۆ منیش دەسەڵاتم هەیە بەسەرتا سەیرکە بزانە چەن بە خراپی رەفتارت گەڵ دەکەم و تەنگ دەبم بۆت ئیتر گۆڕەکەی دێتەوە یەك هەتا پەراسووەکانی دەچن بەناو یەکتردا) وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دەستی ئاماژەی کردو پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا واتە بەم شێوەیە، جا فەرمووی: (خوای گەورە حەفتا ماری گەورەی بۆ دادەنیّ ئەگەر یەکێکیان فوو بکات بە زەویدا هەتا دونیا بمێنیّ هیچی لیّ ناڕوێت، جا دەیگەزن و بریینداری دەکەن هەتا دەگاتە رۆژی لێپێچینەوە)، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (گۆڕ یان باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، یان چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگر).

٢٧ – بَابٌ

٢٤٦١ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا هُوَ مُتَّكِئٌ

عَلَى رَمْلِ حَصِيرٍ فَرَأَيْتُ أَثَرَهُ فِي جَنْبِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەسەر حەسیرێکی چنراو راکشابوو، حەسیرەکە چەقیبووە لاتەنیشتی شوێنەوارەکەیم دی بە لاتەنیشتیەوە.

٢٨ - بَابٌ

٢٤٦٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، وَيُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، أَخْبَرَهُ أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَمْرَو بْنَ عَوْفٍ، وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الجَرَّاحِ فَقَدِمَ بِمَالٍ مِنَ البَحْرَيْنِ، وَسَمِعَتِ الأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ، فَوَافَوْا صَلاَةَ الفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ، فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنْ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيْءٍ. قَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ فَوَاللَّهِ مَا الفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنِّي أَخْشَى أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا فَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی عەوفەوە رەزای خوای لێ بێ کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی جەنگی بەدر دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی رەزای خوای لێ بێ رەوانە کرد بۆ بەحرەین، کاتێ گەڕایەوە هەندێ ماڵ و سامانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ئەنصارەکان بیستیان ئەبو عوبەیدە گەڕاوەتەوە، هاتن لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانیان

کرد، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە نوێژ بوویەوە ویستی بڕواتەوە، ئەوان بۆ بەشی خۆیان لەو ماڵ و سامانە روویان لێ نا، کاتێ کە بەو شێوەیە بینینی زەدەخەنە گرتی، لەپاشدا فەرمووی: (وائەزانم بیستوتانە ئەبو عوبەیدە گەڕاوەتەوە و هەندێ ماڵ و سامانی لەگەڵ خۆی هێناوە؟)، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (موژدەتان لێ بێ و هیواو ئومێدتان بەشتێ هەبێ کە دڵخۆشتان دەکات، سوێند بە (الله) ئیتر من ترسی ئەوەم نەماوە هەژاری و نەداری وەك جاران رووتان تێ بکات و پەرێشانتان بکات، بەڵکو لەوە دەترسم دونیا رووتان تێ بکات و بێ بەپیرتانەوە هەروەك چۆن رووی کردە گەلانی پێش ئێوە و خۆشگوزەران بوون، ئێوەش پەلاماری بدەن و پێشبڕکێ بکەن لەسەری و لەناوتان بەرێ، وەك چۆن گەلانی پێش ئێوە پەلاماریان داو پێشبڕکێیان کرد لەسەری و لەناوی بردن).

٢٩ – بَابٌ

٢٤٦٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، وَابْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: يَا حَكِيمُ، إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى. فَقَالَ حَكِيمٌ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ، يَدْعُو حَكِيمًا إِلَى الْعَطَاءِ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَهُ ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ، دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أُشْهِدُكُمْ يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى حَكِيمٍ أَنِّي أَعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ مِنْ هَذَا الْفَيْءِ فَيَأْبَى أَنْ يَأْخُذَهُ فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ

أَحَدًا مِنَ النَّاسِ شَيْئًا بَعْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تُوُفِّيَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: داوای بەشم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێی بەخشیم، لەپاشدا داوای بەشم لێ کردەوە، پێی بەخشیم، لەپاشدا جارێکی تر داوای بەشم لێ کردەوە، پێی بەخشیم، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی حەکیم! بێگومان ئەم ماڵ و سامانە میوەیەکی سەوز و شیرینە، ئەوەی بە بەرچاو تێری وەری بگرێ خوای گورە پیت و بەرەکەتی تێ دەخات بۆی، ئەوەی بە چاوچنۆکی هەڵپە هەڵپی بۆ دەکات خوای گورە پیت و بەرەکەتی تێ ناخات بۆی، وەك ئەوەی لێ دێ کە هەر دەخواو تێر نابێ، دەستێ کاربکات و ببەخشێ و چاکترە لەو دەستەی کارناکات و پێی دەبەخشرێت، حەکیم وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سوێند بە (الله) کە تۆی ڕەوانە کردووە بە هەق لەپاش تۆ هەرگیزاو هەرگیز شت لەکەس وەرناگرم هەتا لەدونیا دەردەچم، کاتێ کە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان حەکیمی بانگ کرد بۆ ئەوەی لەدەستکەوت بەشی بدات، لێی وەرنەگرت، لەپاشدا کاتێ کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان حەکیمی بانگ کرد بۆ ئەوەی لەدەستکەوت بەشی بدات، لێی وەرنەگرت، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ئێوە بە شایەت بن لەم دەستکەوتە هەقی شەرعی دەدەمێ خۆی وەری ناگرێت، حەکیم بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ شتێکی لەکەس وەرنەگرت هەتا مرد.

٣٠ - بَابٌ

٢٤٦٤ - (صحيح الإسناد) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، قَالَ: ابْتُلِينَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالضَّرَّاءِ فَصَبَرْنَا، ثُمَّ ابْتُلِينَا بِالسَّرَّاءِ بَعْدَهُ فَلَمْ نَصْبِرْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوفەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ناخۆشی و نەبوونی و ئەشکەنجەو ئازار تاقیکراینەوە ئاراممان گرت، بەڵام بە خۆشگوزەرانی و بە دەوڵەمەندی تاقیکراینەوە ئارامان نەگرت.

٢٤٦٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ صَبِيحٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبَانَ وَهُوَ الرَّقَاشِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك هەر خەمی قیامەتی بێت، خوای گەورە دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە، ئیش و کارە بڵاوبووەکانی بۆ کۆدەکاتەوە، دونیا بۆ خۆی بە ناچاری دێتە بەردەستی و پێویستی بە هەوڵ و تەقەلای زۆر نییە، هەرکەسێك هەر خەمی دونیای بێت، خوای گەورە هەژاری دەخاتە نێوان هەردووچاویەوە، ئیش و کارە بڵاوبووەکانی بۆ پەرتەوازە دەکات، هیچی لە دونیا دەست ناکەوێت تەنها ئەوە نەبێ کە بۆی نووسراوە و بۆی دانراوە).

٢٤٦٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ زَائِدَةَ بْنِ نَشِيطٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي خَالِدٍ الوَالِبِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلأْ صَدْرَكَ غِنًى وَأَسُدَّ فَقْرَكَ، وَإِلاَّ تَفْعَلْ مَلأْتُ يَدَيْكَ شُغْلاً وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو خَالِدٍ الوَالِبِيُّ اسْمُهُ: هُرْمُزُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم خۆت یەکلاکەرەوە بۆ پەرستنی من، دڵت دەوڵەمەند دەکەم، هەژاریت بنەبڕ دەکەم بە شێوەیە دەوڵەمەندت دەکەم پێویستت بە کەس نەبێ، ئەگەر وانەکەیت سەرقاڵت دەکەم و هەژاریت بنەبڕ ناکەم و زیاتر هەژاریشت دەکەم).

٣١ - بَابٌ

٢٤٦٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَنَا شَطْرٌ مِنْ شَعِيرٍ فَأَكَلْنَا مِنْهُ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ قُلْتُ لِلْجَارِيَةِ: كِيلِيهِ، فَكَالَتْهُ فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ فَنِيَ قَالَتْ: فَلَوْ كُنَّا تَرَكْنَاهُ لأَكَلْنَا مِنْهُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَمَعْنَى قَوْلِهَا شَطْرٌ: تَعْنِي شَيْئًا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدونیا دەرچوو هەندێ جۆمان هەبوو ئەوەندەی خوای گەورە بیەوێ لێمان دەخوارد، لەپاشدا بە کەنیزەیەکم وت: کێشانەو پێوانەی بکە، ئەویش کێشای، زۆری پێ نەچوو پیت و بەرەکەتی نەماو تەواو بوو،

فەرمووی: ئەگەر وازمان لیّ بهێنایە کێشانەو پێوانەمان نەکردایە زیاترمان لیّ دەخواردو بەشی زیاتری دەکردین.

٣٢ - بَابٌ

٢٤٦٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ عَزْرَةَ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحِمْيَرِيِّ، عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ لَنَا قِرَامُ سِتْرٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ عَلَى بَابِي، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: انْزَعِيهِ فَإِنَّهُ يُذَكِّرُنِي الدُّنْيَا قَالَتْ: وَكَانَ لَنَا سَمَلُ قَطِيفَةٍ تَقُولُ عَلَمُهَا مِنْ حَرِيرٍ كُنَّا نَلْبَسُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پەردەی دەرگاکەمان وێنەی ئاژەڵ و گیانەوەری لەسەر بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینی فەرمووی: (ئەو پەردە لابە دونیام بیردەخاتەوە). عائیشە ڕەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی: پۆشاکێکی قەیفەی کۆنمان هەبوو گوڵەکانی لە ئاوریشم بوو لەبەرمان دەکرد.

٢٤٦٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ وِسَادَةُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّتِي يَضْطَجِعُ عَلَيْهَا مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پشتیەکی هەبوو بەرگەکەی لە چەرم بوو، ناواخنەکەی لە ریشووی دارخورما بوو.

٣٣ - بَابٌ

٢٤٧٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّهُمْ ذَبَحُوا شَاةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا بَقِيَ مِنْهَا؟ قَالَتْ: مَا بَقِيَ مِنْهَا إِلاَّ كَتِفُهَا قَالَ: بَقِيَ كُلُّهَا غَيْرَ كَتِفِهَا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو مَيْسَرَةَ هُوَ الهَمْدَانِيُّ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ شُرَحْبِيلَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە مەڕێكیان سەربڕی و كردیان بە خێر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چی لێ ماوەتەوە؟)، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: هیچی لێ نەماوەتەوە جگە لە شانەكانی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەمووی ماوەتەوە جگە لە شانەكانی).

واتە ئەوەی كراوە بەخێر هی ئێمەیە، ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە: **(مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ)**. سورة النحل: ٩٦. واتە: هەرچی لای ئێوەیە تیادەچێ و نابووت دەبێ، ئەو خێر و پاداشتە لای خوایە هەردەمێنێتەوە و كۆتایی نایەت.

٣٤ - بَابٌ

٢٤٧١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: إِنْ كُنَّا آلَ مُحَمَّدٍ نَمْكُثُ شَهْرًا مَا نَسْتَوْقِدُ بِنَارٍ إِنْ هُوَ إِلاَّ الْمَاءُ وَالتَّمْرُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جار وا دەبوو ئێمەی خانەوادەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم مانگێ لەماڵمان ئاگر نەدەكرایەوە بۆ چێشت لێنان و خواردن دروستكردن، خواردنمان بەس خورماو ئاو بوو.

٢٤٧٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ أَسْلَمَ أَبُو حَاتِمٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللهِ وَمَا يُخَافُ أَحَدٌ، وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ، وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلاثُونَ مِنْ بَيْنِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ وَمَا لِي وَلِبِلاَلٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلاَّ شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبْطُ بِلاَلٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ: حِينَ خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَارِبًا مِنْ مَكَّةَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ إِنَّمَا كَانَ مَعَ بِلاَلٍ مِنَ الطَّعَامِ مَا يَحْمِلُهُ تَحْتَ إِبْطِهِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویــەتی: (لــەپێناوی خــوا ترسێنراوم لەکاتێکدا کە کەس نەدەترسێنرا، لەپێناوی خوا ئــازار و ئەشــکەنجەدراوم لەکاتێکدا کە ئــازار نــەدەدرا، مــن و بــیلال مــانگێ شــەو و ڕۆژ ئــەوەی گیانلەبــەر بیخوات نەبوو بیخۆین جگە لەشتێکی کەم نەبێ کە بن باڵی بیلال داپۆشی بوو).

٢٤٧٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ القُرَظِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ، سَمِعَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، يَقُولُ: خَرَجْتُ فِي يَوْمٍ شَاتٍ مِنْ بَيْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ أَخَذْتُ إِهَابًا مَعْطُونًا فَجَوَّبْتُ وَسَطَهُ فَأَدْخَلْتُهُ عُنُقِي، وَشَدَدْتُ وَسَطِي فَحَزَمْتُهُ بِخُوصِ النَّخْلِ، وَإِنِّي لَشَدِيدُ الجُوعِ، وَلَوْ كَانَ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامٌ لَطَعِمْتُ مِنْهُ فَخَرَجْتُ أَلْتَمِسُ شَيْئًا فَمَرَرْتُ بِيَهُودِيٍّ فِي مَالٍ لَهُ وَهُوَ يَسْقِي بِبَكَرَةٍ لَهُ فَاطَّلَعْتُ عَلَيْهِ مِنْ ثُلْمَةٍ فِي الحَائِطِ. فَقَالَ: مَا لَكَ يَا أَعْرَابِيُّ؟ هَلْ لَكَ فِي كُلِّ دَلْوٍ بِتَمْرَةٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَافْتَحِ البَابَ حَتَّى أَدْخُلَ فَفَتَحَ فَدَخَلْتُ فَأَعْطَانِي دَلْوَهُ فَكُلَّمَا نَزَعْتُ دَلْوًا أَعْطَانِي تَمْرَةً حَتَّى إِذَا امْتَلأَتْ كَفِّي أَرْسَلْتُ دَلْوَهُ وَقُلْتُ: حَسْبِي

فَأَكَلْتُهَا ثُمَّ جَرَعْتُ مِنَ الْمَاءِ فَشَرِبْتُ ثُمَّ جِئْتُ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: رۆژێكی زۆر سارد لەماڵی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بووم زۆرم برسی بوو، خواردنیان نەبوو بیخۆم، پێستەیەكی خۆشەكراوم وەك دشداشە لەبەر كرد بە پەلكە خورما توندم كرد بە خۆمەوە وەك چۆن پشتوێن دەبەسترێ بەو شێوەیە، لەماڵ دەرچووم بۆ ئەوەی شتێكم دەستكەوێ، دام بەلای یەهودیەكدا لە باخەكەی خۆیدا بە دۆڵچەیەكی لە تەختە دروستكراو ئاوی درختەكانی دەدا لە كونێكی باخەكەوە سەیرم كرد وتی: ئەی ئەعرابی چیت دەوێ، ئەتوانی ئەم درەختانەم بۆ ئاو بدەی بۆ هەر دۆڵچەیە دەنكە خورمایەكت دەدەمێ، وتم: بەڵێ، دەرگاكە بكەرەوە هەتا بێمە مەژوورەوە، دەرگاكەی كەردەوە چوومەژوورەوە، دۆڵچەكەی دامێ، منیش دەستم كرد بەئاو هێنان هەركە دۆڵچەكەم خاڵی دەكرد دەنكە خورمایەكی دەدامێ هەتا مشتم پڕ كرد، دۆڵچەكەم بۆ بردەوە وتم: ئیتر بەسمە دەنكە خورماكانم خواردو ئاوم خواردەوە، لەپاشدا چووم بۆ مزگەوت دەبینم پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم لە مزگەوتە.

٢٤٧٤ - (شاذ) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبَّاسٍ الْجُرَيْرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُثْمَانَ النَّهْدِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُمْ أَصَابَهُمْ جُوعٌ فَأَعْطَاهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَمْرَةً تَمْرَةً. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە جارێ هاوەڵان تووشی برسێتی بوون پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەنكە دەنكە خورمای دەدانێ.

٢٤٧٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ ثَلاثُمِائَةٍ نَحْمِلُ زَادَنَا عَلَى رِقَابِنَا فَفَنِيَ زَادُنَا حَتَّى إِنْ كَانَ يَكُونُ لِلرَّجُلِ مِنَّا كُلَّ يَوْمٍ تَمْرَةٌ، فَقِيلَ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ وَأَيْنَ كَانَتْ تَقَعُ التَّمْرَةُ مِنَ الرَّجُلِ؟ فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَقَدْنَاهَا وَأَتَيْنَا الْبَحْرَ فَإِذَا نَحْنُ بِحُوتٍ قَدْ قَذَفَهُ الْبَحْرُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ يَوْمًا مَا أَحْبَبْنَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَرَوَاهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ، أَتَمَّ مِنْ هَذَا وَأَطْوَلَ.

واتە: لە جابیری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: سێ سەد کەسێ دەبووین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕەوانەی کردین بۆ غەزایە، خواردنەکانمان بەکۆڵی خۆمانەوە بوو، خواردنەکانمان ئەوەندە کەم بوویەوە هەر یەکێ لە ئێمە ڕۆژی دەنکە خورمایەکی بەردەکەوت بیخوات، پێی وترا: واتە بە جابیر: ئەی باوکی (عبد الله) جا دەنکێ خورما چی بوو بۆ یەکێ لەئێوە؟ فەرمووی: کاتێ ئەوەش تەواو بوو گەیشتینە کەنار دەریا نەهنگێکی زەبەلاحمان بینی دەریا فڕێی دابووە کەنارەوە هەژدە ڕۆژ ئەو سێ سەد کەسە بە ئارەزووی خۆمان لێمان خوارد.

٣٥ - بَابٌ

٢٤٧٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ، سَمِعَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، يَقُولُ: إِنَّا لَجُلُوسٌ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ طَلَعَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ مَا عَلَيْهِ إِلاَّ بُرْدَةٌ لَهُ مَرْقُوعَةٌ بِفَرْوٍ فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَكَى لِلَّذِي كَانَ فِيهِ مِنَ النِّعْمَةِ وَالَّذِي هُوَ الْيَوْمَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَيْفَ بِكُمْ إِذَا غَدَا أَحَدُكُمْ فِي حُلَّةٍ وَرَاحَ فِي حُلَّةٍ وَوُضِعَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ صَحْفَةٌ وَرُفِعَتْ أُخْرَى وَسَتَرْتُمْ بُيُوتَكُمْ كَمَا تُسْتَرُ الكَعْبَةُ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مِنَّا اليَوْمَ نَتَفَرَّغُ لِلْعِبَادَةِ وَنُكْفَى الْمُؤْنَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لأَنْتُمْ اليَوْمَ خَيْرٌ مِنْكُمْ يَوْمَئِذٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَيَزِيدُ بْنُ زِيَادٍ هُوَ: ابْنُ مَيْسَرَةَ وَهُوَ مَدِينِيٌّ، وَقَدْ رَوَى عَنْهُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ وَيَزِيدُ بْنُ زِيَادٍ الدِّمَشْقِيُّ الَّذِي رَوَى عَنِ الزُّهْرِيِّ رَوَى عَنْهُ وَكِيعٌ وَمَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ وَيَزِيدُ بْنُ أَبِي زِيَادٍ كُوفِيٌّ، رَوَى عَنْهُ سُفْيَانُ وَشُعْبَةُ وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە مزگەوت لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبووم، موصعەبی کوڕی عومەیر دەرکەوت کە لە خانەوادەیەکی زۆر دەوڵەمەند بوو تەنها بوردەیەکی لەبەردا بوو بە پێستە پینەی کردبوو، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاوی پێی کەوت دەستی کردە گریان لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەتە ئێستە ئەوە حاڵیەتی، لەپاشدا فەرمووی: (دەبێ حاڵتان چۆن ڕۆژێ دێ یەکێ لەئێوە لەسەرەتای ڕۆژەی پۆشتەو پەرداخە و بەرگێکی نەرم و جوانی لەبەردایە و بۆ سەر لە ئێوارەش بەرگێکی نەرم و جوانی تری لەبەردایە، خواردنێکی بۆ دادەنێن و یەکێکی تری لەبەردەستدا هەڵدەگرن، دیواری ماڵەکانتان بە قوماشی گرانبەها دەرازێننەوە وەك دیواری کەعبە؟)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئێمە ئەو کاتە چاکترین لە ئێستا کە خۆمان یەکلاکردۆتەوە بۆ پەرستش و بەدەستهێنانی زانستی شەرعی و بە ژیانی هەژاری ڕازین، فەرمووی: (نەخێر ئێوە ئێستا چاکترن، چونکە دەوڵەمەند خۆی یەکلایی ناکاتەوە بۆ پەرستش لەبەر سەرقاڵی بەدەستهێنانی دونیاوە).

٣٦ - بَابٌ

٢٤٧٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُجَاهِدٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ يَأْوُونَ عَلَى أَهْلٍ وَلاَ مَالٍ، وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ إِنْ كُنْتُ لأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الأَرْضِ مِنَ الجُوعِ وَأَشُدُّ الحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الجُوعِ وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْمًا عَلَى طَرِيقِهِمُ الَّذِي يَخْرُجُونَ فِيهِ فَمَرَّ بِي أَبُو بَكْرٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَا أَسْأَلُهُ إِلاَّ لِيَسْتَتْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَا أَسْأَلُهُ إِلاَّ لِيَسْتَتْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ ثُمَّ مَرَّ أَبُو القَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي وَقَالَ: أَبَا هُرَيْرَةَ قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: الحَقْ، وَمَضَى فَاتَّبَعْتُهُ وَدَخَلَ مَنْزِلَهُ فَاسْتَأْذَنْتُ فَأَذِنَ لِي فَوَجَدَ قَدَحًا مِنْ لَبَنٍ فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ لَكُمْ؟ قِيلَ: أَهْدَاهُ لَنَا فُلاَنٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَبَا هُرَيْرَةَ قُلْتُ: لَبَّيْكَ. فَقَالَ: الحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ، وَهُمْ أَضْيَافُ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ يَأْوُونَ عَلَى أَهْلٍ وَمَالٍ إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئًا وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ فَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا، فَسَاءَنِي ذَلِكَ وَقُلْتُ: مَا هَذَا القَدَحُ بَيْنَ أَهْلِ الصُّفَّةِ وَأَنَا رَسُولُهُ إِلَيْهِمْ فَسَيَأْمُرُنِي أَنْ أُدِيرَهُ عَلَيْهِمْ فَمَا عَسَى أَنْ يُصِيبَنِي مِنْهُ، وَقَدْ كُنْتُ أَرْجُو أَنْ أُصِيبَ مِنْهُ مَا يُغْنِينِي وَلَمْ يَكُنْ بُدٌّ مِنْ طَاعَةِ اللهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ، فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ فَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ فَقَالَ: أَبَا هُرَيْرَةَ، خُذِ القَدَحَ وَأَعْطِهِمْ فَأَخَذْتُ القَدَحَ فَجَعَلْتُ أُنَاوِلُهُ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّهُ فَأُنَاوِلُهُ الآخَرَ حَتَّى انْتَهَيْتُ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رَوَى القَوْمُ كُلُّهُمْ فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدَيْهِ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَتَبَسَّمَ فَقَالَ: أَبَا هُرَيْرَةَ اشْرَبْ، فَشَرِبْتُ ثُمَّ قَالَ: اشْرَبْ فَلَمْ أَزَلْ أَشْرَبُ، وَيَقُولُ: اشْرَبْ حَتَّى قُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكًا، فَأَخَذَ القَدَحَ فَحَمِدَ اللهَ وَسَمَّى ثُمَّ شَرِبَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویـەتی: هەژارانی ئەهلی صوففە کەسوکار و ماڵ و منـداڵیان نـەبوو لـە مزگەوتـدا دەژیـان میوانی موسوڵمانان بوون، سوێند بە (الله) کە جگە لەو هیچ پەرسـتراوێکی بەهـەق نییە جاری وا هەبووە لەتاو برسێتی خۆم کوتاوە بەزەویدا، یان بەردم شەتەك داوە بەسـکمەوە، رۆژێ لەسـەر رێگـەی دەرچـوونی موسـوڵمانان دانیشـتم بـۆ ئـەوەی یەکێکیان دەعوەتم بکات بۆ نان خواردن و تێر بخۆم، پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ رەت بوو دەربارەی ئایەتێکی قورئاوە پرسیارم لێ کرد بـە بیـانووی ئـەوەی بمباتەوە بۆ ماڵی خۆیان بەڵام خولکی نەکردم و رۆیشـت، لەپاشـدا پێشـەوا عومـەر رەزای خوای لێ بێ رەت بوو دەربـارەی ئایـەتێکی قورئـاوە پرسـیارم لـێ کـرد بـە بیانووی ئـەوەی بمباتـەوە بـۆ مـاڵی خۆیـان بـەڵام خـولکی نـەکردم و رۆیشـت، جـا پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم رەت بوو، کاتێ چاوی کەوت پێم زانی بۆچـی وەسـتاوم زەردەخەنەیـە گرتـی فـەرمووی: (ئـەبو هـورەیرە؟) وتم: ((لبیـك) ئـەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، فەرمووی: (شـوێنم کـەوە)، منـیش شـوێنی کەوتم هەتا چووە ماڵـەوە روخسـەتی چـوونە ماڵـەوەی بـۆ مـن وەرگـرت و منـیش چوومە ماڵەوە، بینی جامێ شیر دانراوە، فەرمووی: (ئەم شیرەتان لە کـوێ بـوو؟)، وترا: فلان کەس بەدیاری بـۆی هێنـاوین، پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـە وسـلم فەرمووی: (ئەبو هورەیرە؟) وتم: (لبیك)، فەرمووی: (برۆ ئەهلی صوففە بانگ بکە بۆ خواردنی ئەم شیرە)، هەژارانی ئەهلی صوففە کەسوکار و ماڵ و منداڵیان نـەبوو لە مزگەوتدا دەژیان میوانی موسوڵمانان بوون، ئەگەر خێر و سەدەقەی بـۆ بهاتایـە بۆی دەناردن چونکە خۆی لێی نەدەخوارد، بەڵام ئەگەر دیـاری بـۆ بهاتایـە دەینـارد بە دوایاندا خۆشی لەگەڵی دەخواردن، منیش لەبەر کەمی شیرەکە پێم ناخۆش بوو، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەم جامە شیرە چییە بـۆ ئـەو هـەموو خەڵکـە، بـە هیـوا بـووم

تۆزێکی لێ بخۆم بۆ ئەوەی تۆزێ هێزم تێکەوێ، بەلاّم فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی چار نییە بۆیە رۆشتم بانگم کردن، کاتێ هاتن فەرمووی: (ئەبو هورەیرە ئەو جامە بگرە بەدەستەوە و بەشیان بدە)، منیش جامەکەم دەدایە دەست یەکێکیان هەتا تێر شیری دەخواردەوە، ئینجا دەمدایە دەستی یەکێکی تریان ئیتر بەو شێوەیە یەك بە یەك دەمدایە دەستیان، هەتا گەیشتە سەرەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەر هەموویان تێریان لێ خواردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جامەکەی لێ وەرگرتم و لەسەر دەستی دانا سەری هەلّبڕی زەردەخەنەیە گرتی فەرمووی: (ئەبو هورەیرە بخۆرەوە)، منیش خواردمەوە لەپاشدا فەرمووی: (بخۆرەوە)، منیش بەردەوام دەمخواردمەوە، ئەویش دەیفەرموو: (بخۆرەوە)، هەتا وتم: سوێند بەوەی کە تۆی بەهەق رەوانەکردووە بۆم ناخورێ و جێگە نەما تێی بکەم، جامەکەی لێ گرتم و ناوی خوای لێ هێنا خواردیەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد لەسەر ئەو پیت و بەرەکەتەی کەوتە شیرەکەوە.

٣٧ - بَابٌ

٢٤٧٨ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ القُرَشِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى البَكَّاءُ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: تَجَشَّأَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: كُفَّ عَنَّا جُشَاءَكَ فَإِنَّ أَكْثَرَهُمْ شِبَعًا فِي الدُّنْيَا أَطْوَلُهُمْ جُوعًا يَوْمَ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ قرقێنەی دا لەلای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (قرقێنەکەتمان لێ دوورخەرەوە، چونکە بەڕاستی تێرترین کەس لەدونیادا لەهەموو کەس زیاتر برسێتی بەخۆیەوە دەبینێت لەرۆژی قیامەتدا).

٣٨ - بَابٌ

٢٤٧٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: يَا بُنَيَّ لَوْ رَأَيْتَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصَابَتْنَا السَّمَاءُ لَحَسِبْتَ أَنَّ رِيحَنَا رِيحُ الضَّأْنِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ أَنَّهُ كَانَ ثِيَابَهُمُ الصُّوفُ، فَإِذَا أَصَابَهُمُ الْمَطَرُ يَجِيءُ مِنْ ثِيَابِهِمْ رِيحُ الضَّأْنِ.

واتە: لە ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موساوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کوڕی خۆم گەر دەتبینیم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین باران لێی دایین تەڕ بووین جل و بەرگەکەمان چونکە لە خوری بوو بۆنی مەڕی لێ دەهات.

٣٩ - بَابٌ

٢٤٨٠ - (ضعيف الإسناد مقطوع) حَدَّثَنَا الجَارُودُ بْنُ مُعَاذٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ، قَالَ: البِنَاءُ كُلُّهُ وَبَالٌ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ مَا لاَ بُدَّ مِنْهُ؟ قَالَ: لاَ أَجْرَ وَلاَ وِزْرَ.

واتە: لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەموو خانوو بیانایە ئەگەر زیاد لە پێویست بوو لەرۆژی قیامەتدا زیان و چەرمەسەریە بۆ خاوەنەکەی، وتم: پێم بڵێ ئەی ئەگەر هەر چارە نەبوو؟ فەرمووی: خاوەنەکەی نە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، نە گوناهی بۆ دەنوسرێت.

٢٤٨١ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي مَرْحُومٍ عَبْدِ الرَّحِيمِ بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ

سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَرَكَ اللِّبَاسَ تَوَاضُعًا لِلَّهِ وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ دَعَاهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ مِنْ أَيِّ حُلَلِ الإِيمَانِ شَاءَ يَلْبَسُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ حُلَلِ الإِيمَانِ: يَعْنِي مَا يُعْطَى أَهْلُ الإِيمَانِ مِنْ حُلَلِ الجَنَّةِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)وە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە واز لە پۆشاکێکی گرانبەها بهێنێ لەڕووی خۆ بەکەم زانینەوە، لەکاتێکدا توانای هەبێ لەبەری بکات، لەڕۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار بە بەرچاوی سەرجەم خەڵکەوە بانگی دەکات و سەرپشکی دەکات بە ئارەزووی خۆی لە پۆشاکەکانی ئەهلی ئیمان هەڵبژێرێ و لەبەری بکات).

٤٠ - بَابٌ

٢٤٨٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ الرَّازِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَافِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ شَبِيبِ بْنِ بَشِيرٍ، هَكَذَا قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ: شَبِيبُ بْنُ بَشِيرٍ، وَإِنَّمَا هُوَ شَبِيبُ بْنُ بِشْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّفَقَةُ كُلُّهَا فِي سَبِيلِ اللهِ إِلاَّ البِنَاءَ فَلاَ خَيْرَ فِيهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەرجی و مەسروف هەر هەمووی لەڕێی خوادایە خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەردەگرێت جگە لە خەرجی دروستکردنی خانوو یان بینایە خێری تێدا نەبێ).

٢٤٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ، قَالَ: أَتَيْنَا خَبَّابًا، نَعُودُهُ وَقَدْ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ، فَقَالَ: لَقَدْ

تَطَاوَلَ مَرَضِي، وَلَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ تَمَنَّوْا الْمَوْتَ، لَتَمَنَّيْتُ، وَقَالَ: يُؤْجَرُ الرَّجُلُ فِي نَفَقَتِهِ كُلِّهَا إِلاَّ التُّرَابَ أَوْ قَالَ: فِي الْبِنَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (حارثـة)ی كوڕی (مضرب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، كـە فەرموویەتی: سەردانی خەبابمان كرد ڕەزای خوای لێ بێ، جەستەی لە حەوت شوێن داخ كرابوو بە مەبەستی چارەسەری و شیفای نەخۆشی، فـەرمووی: نەخۆشـیەكەم درێژەی كێشـا، ئەگەر لـە پێغەمبـەری خـوام صلی الله علیـه وسـلم نەبیسـتایە دەیفەرموو: (ئاوات مەخوازن بۆ مردن). ئەوا ئـاواتم دەخواسـت بـۆ مـەرگی خـۆم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: پیاو لەسەر هـەموو خـەرجی و مەسروفێ پاداشت وەردەگرێت جگە لە خـەرجی خانوویـە لـەپێناوی خـوادا نـەبێ و پێویست نەبێ.

٤١ - بَابٌ

٢٤٨٤ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ طَهْمَانَ أَبُو العَلاَءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، قَالَ: جَاءَ سَائِلٌ فَسَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، لِلسَّائِلِ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَتَصُومُ رَمَضَانَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَأَلْتَ وَلِلسَّائِلِ حَقٌّ، إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْنَا أَنْ نَصِلَكَ، فَأَعْطَاهُ ثَوْبًا ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ كَسَا مُسْلِمًا ثَوْبًا إِلاَّ كَانَ فِي حِفْظٍ مِنَ اللهِ مَا دَامَ مِنْهُ عَلَيْهِ خِرْقَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە حوصەینەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: سواڵكەرێ هات بۆلای ئیبنو عـەباس ڕەزای خوایان لێ بێ داوای لێ كرد شـتێكی بـداتێ، ئیبنـو عـەباس ڕەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: شایەتی دەدەی كە جگە (الله) هیچ پەرستراوێكی بە هـەق

نییە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: شایەتی دەدەی كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: مانگی رەمەزان بەرۆژوو دەبیت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: داوات كرد داواكەر مافی هەیە، بێگومان هەقە لەسەرمان پێت ببەخشین، پۆشاكێ یان كراسێكی دایە، لەپاشدا فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ برایەكی موسوڵمانی خۆی پۆشتەو پەرداخ بكات، لەژێر سایەی پارێزگاری خوای گەورەدایە هەتا ئەو پۆشاكە كۆن دەبێ و دەڕزێت لەبەری برا موسوڵمانەكەیدا).

٤٢ - بَابٌ

٢٤٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَوْفِ بْنِ أَبِي جَمِيلَةَ الأَعْرَابِيِّ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ انْجَفَلَ النَّاسُ إِلَيْهِ، وَقِيلَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجِئْتُ فِي النَّاسِ لأَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا اسْتَبَنْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ وَكَانَ أَوَّلُ شَيْءٍ تَكَلَّمَ بِهِ أَنْ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْشُوا السَّلاَمَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصَلُّوا وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُونَ الجَنَّةَ بِسَلاَمٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی كوڕی سەلامەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە مەدینە خەڵك بە پەلە رۆشتن بۆ خزمەتی، وترا: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشت، منیش لەگەڵ خەڵكەكە رۆشتم بۆ ئەوەی بیبینم، كاتێ كە روخساری جوان و درەوشاوەی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی بۆم دەركەوت كە روخساری كەسێكی درۆزن نییە، یەكەم فەرمایشتێ كە فەرمووی ئەمە بوو: (ئەی خەڵكینە! سەلام لەیەكتر بكەن، خواردن بدەن بە هەژاران، لە كاتێكدا كە خەڵك خەوتون شەونوێژ بكەن، بە سەلامەتی دەچنە بەهەشتەوە).

٤٣ - بَابٌ

٢٤٨٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَعْنٍ الْمَدَنِيُّ الغِفَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نانخۆرێكی سوپاسگوزار واتە لەپێشدا ناوی خوا بهێنێ و لەكاتی لێ بوونەوەدا سوپاسی خوا بكات لەرۆژی قیامەتدا دەگاتە پلەی رۆژووەوانێكی خۆڕاگر).

٤٤ - بَابٌ

٢٤٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ الْحَسَنِ الْمَرْوَزِيُّ، بِمَكَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ أَتَاهُ الْمُهَاجِرُونَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا رَأَيْنَا قَوْمًا أَبْذَلَ مِنْ كَثِيرٍ وَلاَ أَحْسَنَ مُوَاسَاةً مِنْ قَلِيلٍ مِنْ قَوْمٍ نَزَلْنَا بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ لَقَدْ كَفَوْنَا الْمُؤْنَةَ وَأَشْرَكُونَا فِي الْمَهْنَإِ حَتَّى لَقَدْ خِفْنَا أَنْ يَذْهَبُوا بِالأَجْرِ كُلِّهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ مَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ لَهُمْ وَأَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە مەدینە، كۆچەران هاتن بۆ خزمەتی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هیچ قەومێكمان نەدیوە ئەوەندەی ئەمانەی كە لەناویاندا دەژین چاك بن بۆ

برایەتی بۆ بەخشندەیی ئیتر دەوڵەمەند بن یان هەژار، دەترسین خوای گەورە پاداشتێ کۆچەکەمان و پەرستشەکانمان و چاکەکانمان هەر هەمووی بۆ ئەوان بێ ئەوەندە خزمەتمان دەکەن و چاکن بەرامبەرمان، فەرمووی: (نا مەترسن، مادەم ئێوەش لە خوا بپارێنەوە بۆیان و سوپاس و ستایشیان بکەن).

٤٥ - بَابٌ

٢٤٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو الأَوْدِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّارِ أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ، عَلَى كُلِّ قَرِيبٍ هَيِّنٍ سَهْلٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن، پێتان بڵێم کێ لە ئاگر قەدەغەیە، یان ئاگر لە کێ قەدەغەیە؟ ئاگر قەدەغەیە لەسەر کەسێکی نزیك لە خەڵك و هێمن و لەسەرخۆ و نەرم نیان).

٢٤٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَيُّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ؟ قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مَهْنَةِ أَهْلِهِ، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ قَامَ فَصَلَّى..هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ وت: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە ماڵەوە چی دەکرد؟ خەریکی خزمەتکردنی ماڵ و خانەوادەکەی بوو واتە ئیشی ناوماڵی دەکرد، کە کاتی نوێژیش بهاتایە هەڵەسا نوێژی دەکرد.

٤٦ - بَابٌ

٢٤٩٠ - (ضعيف: الا جملة المصاحفة فهي ثابتة) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ زَيْدٍ التَّغْلَبِيِّ، عَنْ زَيْدٍ العَمِّيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَقْبَلَهُ الرَّجُلُ فَصَافَحَهُ لاَ يَنْزِعُ يَدَهُ مِنْ يَدِهِ حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ الَّذِي يَنْزِعُ، وَلاَ يَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنْ وَجْهِهِ حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ هُوَ الَّذِي يَصْرِفُهُ، وَلَمْ يُرَ مُقَدِّمًا رُكْبَتَيْهِ بَيْنَ يَدَيْ جَلِيسٍ لَهُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێ بگەیشتایە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەوقەی لەگەڵ بکردایە دەستی بەرنەدەدا هەتا ئەو کەسە دەستی بەرنەدایە، ڕووی لە ڕووخساری وەرنەدەگێڕا هەتا ئەو کەسە ڕووی وەرنەگێڕایە، نەبینراوە لە کۆڕ و دانیشتنیدا ئەژنۆکانی پێش ئەژنۆی دانیشتوان بکەوێ واتە ئەژنۆکانی ڕێکی ئەژنۆی ئەوان بوو.

٤٧ - بَابٌ

٢٤٩١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَرَجَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فِي حُلَّةٍ لَهُ يَخْتَالُ فِيهَا، فَأَمَرَ اللَّهُ الأَرْضَ فَأَخَذَتْهُ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِيهَا، أَوْ قَالَ: يَتَلَجْلَجُ فِيهَا، إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پیاوێ لەوانەی پێش ئێوە لەپۆشاکێکی ڕازاوەدا بە لەخۆبایی و لوت بەرزیەوە لەماڵ دەرچوو، خوای گەورە فەرمانی کرد بە زەوی گرتی و بردی بە ناخی خۆیدا هەتا ڕۆژی قیامەت ڕۆدەچێ بە ناخی زەویدا).

٢٤٩٢ - (حسن) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ القِيَامَةِ أَمْثَالَ الذَّرِّ فِي صُوَرِ الرِّجَالِ يَغْشَاهُمُ الذُّلُّ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ، فَيُسَاقُونَ إِلَى سِجْنٍ فِي جَهَنَّمَ يُسَمَّى بُولَسَ تَعْلُوهُمْ نَارُ الأَنْيَارِ يُسْقَوْنَ مِنْ عُصَارَةِ أَهْلِ النَّارِ طِينَةَ الخَبَالِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆبەزلزانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا وەك وردە مێرولە کۆدەکرێنەوە لەسەر شێوەی پیاواندا، لەهەموو لایەکەوە زەلیلی و ریسوایی و زەبوونی دایان دەپۆشێ، دەبرێن بۆ زیندانێکی تاریك لە دۆزەخ پێی دەوترێت (بولس) ئاگری زۆریان لەسەرەوەیەو دەورەیان دەدات و دایان دەپۆشێ، کێم و زوخی خەڵکی جەهەنەمیان دەرخوارد دەدرێت، لە قوڕی دۆزەخ.

٤٨ - بَابٌ

٢٤٩٣ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وَعَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْمُقْرِئُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو مَرْحُومٍ عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ مَيْمُونٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يُنَفِّذَهُ دَعَاهُ اللَّهُ عَلَى رُءُوسِ الخَلاَئِقِ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ فِي أَيِّ الحُورِ شَاءَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)وە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی بتوانێ ڕقی خۆی بە یەکێ بڕێژێ بەڵام لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ڕقەکەی بخواتەوە، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار لەناو ئاپۆڕای خەڵکدا بە بەرچاوی سەرجەم

دروستکراوەکانیەوە بانگی دەکات و خۆی سەر پشك دەکات بە ئارەزووی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت هەڵیبژێرێت بۆ خۆی).

٢٤٩٤ - **(موضوع)** حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الغِفَارِيُّ الْمَدِينِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ نَشَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَأَدْخَلَهُ جَنَّتَهُ: رِفْقٌ بِالضَّعِيفِ، وَشَفَقَةٌ عَلَى الوَالِدَيْنِ، وَإِحْسَانٌ إِلَى الْمَمْلُوكِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ الْمُنْكَدِرِ هُوَ أَخُو مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێ ئەم سێ شتەی تێدا بێ خوای گەورە دەیخاتە ژێر سێبەری رەحمەتی خۆیەوە و دەیباتە بەهەشتەوە: نەرم و نیانی بەرامبەر بێ دەسەلات، سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە دایك و باوك، چاکە بەرامبەر بە کۆیلەی ژێردەستە).

٢٤٩٥ - **(ضعيف بهذا السياق، وأكثره صحيح في (م)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُ فَسَلُونِي الهُدَى أَهْدِكُمْ، وَكُلُّكُمْ فَقِيرٌ إِلاَّ مَنْ أَغْنَيْتُ فَسَلُونِي أَرْزُقْكُمْ، وَكُلُّكُمْ مُذْنِبٌ إِلاَّ مَنْ عَافَيْتُ، فَمَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى الْمَغْفِرَةِ فَاسْتَغْفَرَنِي غَفَرْتُ لَهُ وَلاَ أُبَالِي، وَلَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَحَيَّكُمْ وَمَيِّتَكُمْ وَرَطْبَكُمْ وَيَابِسَكُمْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ عَبْدٍ مِنْ عِبَادِي مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَلَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَحَيَّكُمْ وَمَيِّتَكُمْ وَرَطْبَكُمْ وَيَابِسَكُمْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ عَبْدٍ مِنْ عِبَادِي مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَلَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَحَيَّكُمْ وَمَيِّتَكُمْ وَرَطْبَكُمْ وَيَابِسَكُمْ اجْتَمَعُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْكُمْ مَا بَلَغَتْ أُمْنِيَّتُهُ

فَأَعْطَيْتُ كُلَّ سَائِلٍ مِنْكُمْ مَا سَأَلَ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي إِلاَّ كَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ مَرَّ بِالبَحْرِ فَغَمَسَ فِيهِ إِبْرَةً ثُمَّ رَفَعَهَا إِلَيْهِ، ذَلِكَ بِأَنِّي جَوَادٌ وَاجِدٌ مَاجِدٌ أَفْعَلُ مَا أُرِيدُ عَطَائِي كَلاَمٌ وَعَذَابِي كَلاَمٌ إِنَّمَا أَمْرِي لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْتُهُ أَنْ أَقُولَ لَهُ: كُنْ، فَيَكُونُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَرَوَى بَعْضُهُمْ هَذَا الحَدِيثَ عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ مَعْدِي كَرِبَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی بەندەکانم! ئێوە هەمووتان گومڕاو سەرلێشێواون جگە لەوەی من ڕێنموونیم کردووە، کەوابوو داوای هیدایەت لە من بکەن، منیش هیدایەتتان دەدەم، هەمووتان هەژارن و پێویستیتان بە خۆراك هەیەو برسین جگە لەوەی من خواردەمەنیم داوەتێ، کەواتە داوا لە من بکەن و کەسی تر بە ڕۆزیدەر مەزانن، من ڕۆزیتان دەدەم، ئێوە هەمووتان گوناهبارن مەگەر کەسێ خۆم لێی خۆش بووبم یان پاراستبێتم و بەدوورم گرتبێ لە گوناهو تاوان وەك پێغەمبەران، هەرکەس لە ئێوە باوەڕوابێ و بزانێ من توانای لێخۆشبوونم هەیە، داوای لێخۆشبوونم لێ بکات، لێی خۆشدەبم، بێگومان ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە هەتا دوا کەستان بە زیندوو مردووتانەوە، بە گەنج و بە پیرتانەوە، بە زاناو نەزانتانەوە، بە فەرمانبەردار و سەرپێچیکارتانەوە، وەکو دڵی لەخوا ترسترین بەندە لە بەندەکانی من بن، ئەوەندەی باڵی مێشوولەیە لە موڵکی من زیاد ناکات، خۆ ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە هەتا دوا کەستان بە زیندوو مردووتانەوە، بە گەنج و بە پیرتانەوە، بە زاناو نەزانتانەوە، بە فەرمانبەردار و سەرپێچیکارتانەوە، وەکو دڵی بەدبەخترین و خراپترین بەندە لە بەندەکانی من بن، ئەوەندەی باڵی مێشوولەیە لە موڵکی من کەم ناکات، ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە هەتا دوا کەستان بە زیندوو

مردووتانەوە، بە گەنج و بە پیرتانەوە، بە زاناو نەزانتانەوە، بە فەرمانبەردار و سەرپێچیکارتانەوە، لە دەشتێکدا کۆببنەوە هەر یەکێ لە ئێوە داوای هەر پێویستییەك بکات دێ بە خەیاڵیدا، هەریەکەیان داخوازی خۆیم بۆ جێبەجێ کرد، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، وەك چۆن یەکێ لە ئێوە بدات بەلای دەریایەکدا دەرزیە بکات بەناو ئاوی دەریاکەدا، لەپاشدا بەرزی بکاتەوە بۆلای خۆی، واتە: ئەو ئاوەی دەرزیەکە تەڕ دەکات چۆن هیچ لە ئاوی دەریاکە کەم ناکاتەوە، ئەگەر خوایش هەرچی دروستکراوی خۆی هەیە بەشی بدات هیچ لە موڵکی کەم ناکاتەوە، لەبەرئەوەی من زۆر سەخی و شکۆدار بەخشندە و پایەبەرزم ئەوەی داوابکرێ و بویسترێ لام دەست دەکەوێ، بەخشینم و سزاو ئەشکەنجەم بە وتە و بە فەرمانی خۆمە، هەر کارێ بمەوێ ئەنجامی دەدەم پێی بفەرمووم ببە دەستبەجێ دەبێت).

٢٤٩٦ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ أَسْبَاطِ بْنِ مُحَمَّدٍ الْقُرَشِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الرَّازِيِّ، عَنْ سَعْدٍ، مَوْلَى طَلْحَةَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ لَمْ أَسْمَعْهُ إِلاَّ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ حَتَّى عَدَّ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُهُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: كَانَ الكِفْلُ مِنْ بني إسرائيل لاَ يَتَوَرَّعُ مِنْ ذَنْبٍ عَمِلَهُ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَأَعْطَاهَا سِتِّينَ دِينَارًا عَلَى أَنْ يَطَأَهَا، فَلَمَّا قَعَدَ مِنْهَا مَقْعَدَ الرَّجُلِ مِنْ امْرَأَتِهِ أَرْعَدَتْ وَبَكَتْ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكِ أَأَكْرَهْتُكِ؟ قَالَتْ: لاَ وَلَكِنَّهُ عَمَلٌ مَا عَمِلْتُهُ قَطُّ، وَمَا حَمَلَنِي عَلَيْهِ إِلاَّ الحَاجَةُ، فَقَالَ: تَفْعَلِينَ أَنْتِ هَذَا وَمَا فَعَلْتِهِ؟ اذْهَبِي فَهِيَ لَكِ، وَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أَعْصِي اللَّهَ بَعْدَهَا أَبَدًا، فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ فَأَصْبَحَ مَكْتُوبًا عَلَى بَابِهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لِلْكِفْلِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رَوَاهُ شَيْبَانُ وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الأَعْمَشِ، نَحْوَ هَذَا وَرَفَعُوهُ، وَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنِ الأَعْمَشِ فَلَمْ يَرْفَعْهُ وَرَوَى أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، هَذَا الحَدِيثَ

عَنِ الأَعْمَشِ، فَأَخْطَأَ فِيهِ، وَقَالَ: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَهُوَ غَيْرُ مَحْفُوظٍ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ الرَّازِيُّ، هُوَ كُوفِيٌّ وَكَانَتْ جَدَّتُهُ سُرِّيَّةً لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ. وَرَوَى عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الرَّازِيِّ، عُبَيْدَةُ الضَّبِّيُّ، وَالحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنْ كِبَارِ أَهْلِ العِلْمِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: زیاتر لە حەوت جار بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (پیاوێکی نەوەی ئیسرائیل ناوی کیفل بوو سڵی لە تاوان نەدەکردەوە، جارێ ئافرەتێکی هەژار هات بۆ لای شەست دیناری دایە بە مەرجێ جووت ببێ لەگەڵی، کاتێ ویستی جوت ببێ لەگەڵی ئافرەتەکە لە ترسی خوا لەرزی لێ نیشت و گریا، وتی: بۆ دەگریت خۆ زۆرم لێ نەکردووی؟ وتی: نەخێر، بەڵکو ئەم کارە قیزەونەم هەرگیز نەکردووە، ئێستا ناچاری و موحتاجی ئەم کارەم پێ دەکات، وتی: ئێستا تۆ ئەم کارە لەبەر ناچاری دەکەیت و پێشتر کاری وات نەکردووە، بڕۆ پارەکە بۆ خۆت، سەێند بە (الله) ئیتر لەمەودوا هەرگیز سەرپێچی خوا ناکەم، هەر ئەو شەوە کیفل مرد، کاتێ رۆژبوویەوە لەسەر دەرگاکەی نوسرابوو بەڕاستی خوای گەورە لە کیفل خۆش بوو).

٤٩ – بَابٌ

٢٤٩٧ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ بِحَدِيثَيْنِ أَحَدِهِمَا عَنْ نَفْسِهِ وَالآخَرِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ فِي أَصْلِ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ، وَإِنَّ الفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ وَقَعَ عَلَى أَنْفِهِ قَالَ بِهِ هَكَذَا.

واتە: لە (حارث)ی کوڕی سوەیدەوە دەگێڕنەوە، کە (عبد الله)ی کوڕی

مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ دوو فەرمایشتی بۆ گێڕاینەوە، یەکێکیان لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، ئەوی تریشیان فەرمایشتی خۆی بوو، فەرمایشتەکەی خۆی ئەمە بوو فەرمووی: بێگومان مرۆڤی باوەڕدار گوناهو تاوانەکانی وەك کێوێ دەبینێ لەبنی کێوەکەدا دانیشتبێ مەترسی ئەوەی هەبێ بڕوخێ بە سەریا، بەڵام بەدکار گوناهی خۆی وەك مێشێ دەبینێ بدات بەلای لوتیدا و دەستێکی لێ ڕاوەشێنێ.

٢٤٩٨ - (صحيح) وقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَلَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ أَحَدِكُمْ مِنْ رَجُلٍ بِأَرْضٍ دَوِيَّةٍ مُهْلِكَةٍ مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ وَشَرَابُهُ وَمَا يُصْلِحُهُ فَأَضَلَّهَا فَخَرَجَ فِي طَلَبِهَا، حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِي الَّذِي أَضْلَلْتُهَا فِيهِ فَأَمُوتُ فِيهِ، فَرَجَعَ إِلَى مَكَانِهِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ فَاسْتَيْقَظَ فَإِذَا رَاحِلَتُهُ عِنْدَ رَأْسِهِ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ وَمَا يُصْلِحُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَفِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: هەروەها (عبد الله)ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە بە تەوبە و پەشیمانی بەندەی خۆی کاتێ کە تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە زیاتر شادومان دەبێ هەتا ئەو کەسەی لە وڵاخە سواریەکەی بە تێشو خواردن و خواردنەوەوە و پێویستیەکانیەوە لە دەشتێکی چۆڵەوانیدا ون دەکات کە نە ئاوی لێیە نە ڕووەك و دار و درەخت، جێگەی مەترسی و فەوتان بێ، بڕوات بگەڕێ بە دوابا بیدۆزێتەوە هەتا نزیکی ئەوەی خەریکە ڕۆحی دەرچێ و بمرێ ئەوەندە برسی و تینو ماندوو دەبێت، بڵێ: دەگەڕێمەوە بۆ شوێنەی وڵاخەکەم لێ ون بوو با لەوێ بمرم، جا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە خەو زۆری بۆ دێنێ و دەخەوێ کاتێ کە خەبەری دەبێتەوە سەیر دەکات وڵاخەکەی بە راسەریەوەیەتی بەتێشو خواردن و خواردنەوەوە و پێویستیەکانیەوە).

٢٤٩٩ - (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مَسْعَدَةَ البَاهِلِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَلِيِّ بْنِ مَسْعَدَةَ عَنْ قَتَادَةَ.

واتە: لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەرجەم مرۆڤەکان هەر هەموویان هەڵەکارن، چاکترین هەڵەکارن ئەوانەن پەشیمان دەبنەوە و تەوبە دەکەن).

٥٠ - بَابٌ

٢٥٠٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ.

هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي شُرَيْحٍ العَدَوِيِّ الكَعْبِيِّ الخُزَاعِيِّ وَاسْمُهُ: خُوَيْلِدُ بْنُ عَمْرٍو.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، وە هەرکەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە قسەی چاك بکات یان بێدەنگ بێت).

٢٥٠١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَمْرٍو الْمَعَافِرِيِّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ صَمَتَ نَجَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ. وَأَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيُّ هُوَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك بێدەنگ بێت لە خراپە ڕزگاری دەبێت).

٥١ – بَابٌ

٢٥٠٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الأَقْمَرِ، عَنْ أَبِي حُذَيْفَةَ،، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: حَكَيْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً فَقَالَ: مَا يَسُرُّنِي أَنِّي حَكَيْتُ رَجُلاً وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ صَفِيَّةَ امْرَأَةٌ، وَقَالَتْ بِيَدِهَا هَكَذَا كَأَنَّهَا تَعْنِي قَصِيرَةً، فَقَالَ: لَقَدْ مَزَجْتِ بِكَلِمَةٍ لَوْ مَزَجْتِ بِهَا مَاءَ البَحْرِ لَمُزِجَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ لاسایی پیاوێکم کردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (حەزناکەم لاسایی کەس بکەمەوە ئەگەر ئەوەندە و ئەوندەشم لە ماڵی دنیا پێ بدەن واتە ئەگەر ماڵ و سامانێکی زۆریشم بدەنێ)، عائیشە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم صەفیە ئافرەتێکی کورتە بالآیە، فەرمووی: (ئەو قسەی کە تۆ کردت ئەوەندە پیس و بۆگەنە، ئەگەر تێکەڵی ئاوی دەریای بکەی ئاوی دەریاکە پیس و بۆگەن دەکات).

٢٥٠٣ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الأَقْمَرِ، عَنْ أَبِي حُذَيْفَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا

أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ أَحَدًا وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو حُذَيْفَةَ هُوَ كُوفِيٌّ مِنْ أَصْحَابِ ابْنِ مَسْعُودٍ وَيُقَالُ اسْمُهُ: سَلَمَةُ بْنُ صُهَيْبَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حەزناکەم لاسایی کەس بکەمەوە ئەگەر ئەوەندە و ئەوندەشم لە ماڵی دنیا پێ بدەن واتە ئەگەر ماڵ و سامانێکی زۆریشم بدەنێ).

٥٢ - بَابٌ

٢٥٠٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْمُسْلِمِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى.

واتە: لە ئەبو موساوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی چ موسوڵمانێ چاکترین کەسە لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (چاکترین موسوڵمان ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان لەدەست و لەزمانی سەلامەت بن).

٥٣ - بَابٌ

٢٥٠٥ - (موضوع) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الحَسَنِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ الهَمْدَانِيُّ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ عَيَّرَ أَخَاهُ بِذَنْبٍ لَمْ يَمُتْ حَتَّى يَعْمَلَهُ. قَالَ أَحْمَدُ: قَالُوا: مِنْ ذَنْبٍ قَدْ تَابَ مِنْهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ وَخَالِدُ

بْنُ مَعْدَانَ لَمْ يُدْرِكْ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، وَرُوِيَ عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ أَنَّهُ أَدْرَكَ سَبْعِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَاتَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ فِي خِلَافَةِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، وَخَالِدُ بْنُ مَعْدَانَ رَوَى عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ مُعَاذٍ عَنْ مُعَاذٍ غَيْرَ حَدِيثٍ.

واتە: لە (معاذ)ی كوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ تانەی ئەوە بدات لە برایەكی موسوڵمانی كە ئەو گوناهەی كردووە و ڕەخنەی لێ بگرێ، خۆی نامرێ هەتا تووشی ئەو گوناهە نەبێت). ئەحمەدی كوڕی حەنبەل یا ئەحمەدی كوڕی مەنیع دەڵێ: گوناهێ كە تەوبەی لێ كردبێ.

٥٤ - بَابٌ

٢٥٠٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُجَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ الْهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ (ح) وأَخْبَرَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أُمَيَّةُ بْنُ القَاسِمِ الحَذَّاءُ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ بُرْدِ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ مَكْحُولٍ، عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُظْهِرِ الشَّمَاتَةَ لأَخِيكَ فَيَرْحَمَهُ اللَّهُ وَيَبْتَلِيكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە (واثلة)ی كوڕی ئەسقەعەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شاكامی بەرامبەر بە برای موسوڵمانی خۆت دەرمەبڕە كاتێ تووشی بەڵایە دەبێ، ئەگەر ئەو كارەت كرد ئەوە خوای گەورە ڕەحم بەو دەكات ڕزگاری دەكات و تۆ تووش دەكات).

(حسن الإسناد مقطوع) وَمَكْحُولٌ قَدْ سَمِعَ مِنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ وَأَبِي هِنْدٍ الدَّارِيِّ، وَيُقَالُ: إِنَّهُ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ هَؤُلاَءِ الثَّلاَثَةِ وَمَكْحُولٌ، شَامِيٌّ يُكْنَى أَبَا عَبْدِ اللهِ وَكَانَ عَبْدًا فَأُعْتِقَ ومكْحُولٌ الأَزْدِيُّ بَصْرِيٌّ سَمِعَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، يَرْوِي عَنْهُ عُمَارَةُ بْنُ زَاذَانَ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ تَمِيمِ بْنِ عَطِيَّةَ، قَالَ: كَثِيرًا مَا كُنْتُ أَسْمَعُ مَكْحُولاً يُسْأَلُ فَيَقُولُ: نَدَانَمْ.

٥٥ - بَابٌ

٢٥٠٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَعْمَشِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ وَثَّابٍ، عَنْ شَيْخٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرَاهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُسْلِمُ إِذَا كَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ. قَالَ ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ: كَانَ شُعْبَةُ، يَرَى أَنَّهُ ابْنُ عُمَرَ.

واتە: لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (ئەگەر موسوڵمانێ تێکەڵی خەڵکی کردوو لەلایەن ئەو خەڵکەوە زیان و ئازاری پێگەیشت و خۆڕاگر بێ، چاکترە لەو موسوڵمانەی تێکەڵی خەڵك ناکات و ئارام ناگرێت بەرامبەر بە زیان و ئازاریان).

٥٦ - بَابٌ

٢٥٠٨ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ الْمَخْرَمِيُّ، هُوَ مِنْ وَلَدِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ الأَخْنَسِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَسُوءَ ذَاتِ البَيْنِ فَإِنَّهَا الحَالِقَةُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ

مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَمَعْنَى قَوْلِهِ وَسُوءَ ذَاتِ البَيْنِ إِنَّمَا يَعْنِي العَدَاوَةَ وَالبَغْضَاءَ، وَقَوْلُهُ الحَالِقَةُ يَقُولُ: إِنَّهَا تَحْلِقُ الدِّينَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن بەدووربن لەتێکدانی نێوان خەڵك و دوژمنایەتی و دووبەرەکی و رق و کینە خستنە نێوان یەکترەوە، چونکە بێگومان ئەوە تاشەری دینە واتە وەك چۆن گوێزان موو دەتاشێ ئەویش ئاوا دین دەتاشێ و لابەری کردەوە چاکەکانە). مانای (سُوءَ ذَاتِ البَيْنِ) واتە: دوژمنایەتی و دووبەرەکی و رق و کینە خستنە نێوان یەکترەوە، وە مانای (الحَالِقَةُ) واتە: تاشەری دین.

٢٥٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ، قَالُوا: بَلَى، قَالَ: صَلاَحُ ذَاتِ البَيْنِ، فَإِنَّ فَسَادَ ذَاتِ البَيْنِ هِيَ الحَالِقَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَيُرْوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: هِيَ الحَالِقَةُ لاَ أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعَرَ، وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ.

واتە: لە ئەبو دەرداوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هۆشیاربن، هەواڵتان بدەمێ بە چاکتر لە پلەو پایەی ڕۆژوو نوێژ سەدەقە و خێر و خێرات؟) وتیان: بەڵێ: فەرمووی: (چاکسازی نێوان خەڵك و ئاشتکردنەوەی ئەو کەسانەی قسە لەگەڵ یەك ناکەن و ناکۆکن و نێوانیان تێك چووە، چونکە تێکدانی نێوان خەڵك تاشەری دینە). دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (تێکدانی نێوان خەڵك تاشەرە، من ناڵێم قژ تاشینە بەڵکو دین تاشینە).

٢٥١٠ - (حسن) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ حَرْبِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ يَعِيشَ بْنِ الوَلِيدِ، أَنَّ مَوْلًى لِلزُّبَيْرِ، حَدَّثَهُ أَنَّ الزُّبَيْرَ بْنَ العَوَّامِ، حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الأُمَمِ قَبْلَكُمْ: الحَسَدُ وَالبَغْضَاءُ، هِيَ الحَالِقَةُ، لاَ أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعَرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَلِكَ لَكُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ قَدْ اخْتَلَفُوا فِي رِوَايَتِهِ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ. فَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ يَعِيشَ بْنِ الوَلِيدِ، عَنْ مَوْلَى الزُّبَيْرِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنِ الزُّبَيْرِ.

واتە: لە زوبێری کوڕی عەوامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دەردو نەخۆشی گەلانی پێش خۆتان لەنێوانتاندا پەرەدەسێنێ حەسادەت و ئیرەیی بە نهێنی لە ناختاندا و رق و کینەش بەئاشکرا، حەسادەت و رق و کینەش تاشەرە، من ناڵێم قژ دەتاشن بەڵکو دەڵێم دین دەتاشن، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ نیشان بدەم ئەوە بچەسپێنێ و جێگیری بکات واتە یەکترتان خۆش بوێت؟ لەناو خۆتاندا سڵاو بڵاو بکەنەوە).

٥٧ - بَابٌ

٢٥١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُيَيْنَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللَّهُ لِصَاحِبِهِ العُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنَ البَغْيِ وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو بەکرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ تاوانێ هێندەی جەور و ستەم و بڕینی سیلەی رەحم و پشت هەڵکردن لە خزم و کەس و کار شایەنی ئەوە نیە خوای گەورە لە دونیادا بە زوویی تۆڵە لە خاوەنەکەی بسێنێ، چ جای ئەو هەموو سزاو ئازارەیش کە لە دوارۆژیشدا بۆی دانراوە).

٥٨ - بَابٌ

٢٥١٢ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنِ الْمُثَنَّى بْنِ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: خَصْلَتَانِ مَنْ كَانَتَا فِيهِ كَتَبَهُ اللهُ شَاكِرًا صَابِرًا، وَمَنْ لَمْ تَكُونَا فِيهِ لَمْ يَكْتُبْهُ اللهُ شَاكِرًا وَلاَ صَابِرًا، مَنْ نَظَرَ فِي دِينِهِ إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَهُ فَاقْتَدَى بِهِ، وَنَظَرَ فِي دُنْيَاهُ إِلَى مَنْ هُوَ دُونَهُ فَحَمِدَ اللهَ عَلَى مَا فَضَّلَهُ بِهِ عَلَيْهِ كَتَبَهُ اللهُ شَاكِرًا وَصَابِرًا، وَمَنْ نَظَرَ فِي دِينِهِ إِلَى مَنْ هُوَ دُونَهُ، وَنَظَرَ فِي دُنْيَاهُ إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَهُ فَأَسِفَ عَلَى مَا فَاتَهُ مِنْهُ لَمْ يَكْتُبْهُ اللهُ شَاكِرًا وَلاَ صَابِرًا. حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ حِزَامٍ، الرَّجُلُ الصَّالِحُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا الْمُثَنَّى بْنُ الصَّبَّاحِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَلَمْ يَذْكُرْ سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ فِي حَدِيثِهِ عَنْ أَبِيهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باپیریەوە (عبد الله)ی کوڕی عەمر رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەرکەس ئەم دوو شتەی تێدا بێت خوای گەورە بە سوپاسگوزار و خۆڕاگر دەینوسێ، هەرکەس ئەم دوو شتەی تێدا نەبێت خوای گەورە بە سوپاسگوزار و خۆڕاگر ناینوسێ، هەرکەس لەدینەکەیدا سەیری کەسێ بکات لەسەرووی خۆیەوە بێت واتە لە ئەنجامدانی پەرستشەکان و کردەوەی

چاكەدا لەپێشتر بێت و بیكاتە پێشەنگ و سەرمەشق بۆ خۆی، هەروەها بۆ ژیانی دونیای سەیری كەسێ بكات لەخوارووی خۆیەوە بێت واتە ماڵ و سامان و پایە و دەسەڵاتی لەخۆی كەمتر بێ و سوپاس و ستایشی خوای گەورە بكات لەسەر ئەو فەزڵەی پێی بەخشیوە، ئەوە خوای گەورە بە سوپاسگوزار و خۆڕاگر دەینوسێ، هەركەس لەدینەكەیدا سەیری كەسێ بكات لەخوارووی خۆیەوە بێت، هەروەها بۆ ژیانی دونیای سەیری كەسێ بكات لەسەرووی خۆیەوە بێ و خەمبار و دڵگران بێ بۆ ئەوەی لەدەستی چووە، ئەوە خوای گەورە بە سوپاسگوزار و خۆڕاگر ناینوسێ).

٢٥١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، وَوَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: انْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سەیری كەسێك بكەن لەخوارووی خۆتانەوە بێت، سەیری سەیری كەسێك مەكەن لە سەرووی خۆتانەوە بێت، چونكە ئەوە شایەنترە بەوەی نیعمەتی خوای گەورەتان لەبەرچاو نەكەوێت).

٥٩ - بَابٌ

٢٥١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ هِلاَلٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدٍ الجُرَيْرِيِّ (ح) وحَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ البَزَّازُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَيَّارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدٍ الجُرَيْرِيِّ، وَالْمَعْنَى وَاحِدٌ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ،، وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ مَرَّ بِأَبِي بَكْرٍ وَهُوَ يَبْكِي، فَقَالَ: مَا لَكَ يَا حَنْظَلَةُ؟ قَالَ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا أَبَا بَكْرٍ، نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ

اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالجَنَّةِ كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا رَجَعْنَا عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالضَّيْعَةَ وَنَسِينَا كَثِيرًا، قَالَ: فَوَاللهِ إِنَّا لَكَذَلِكَ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَانْطَلَقْنَا، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا لَكَ يَا حَنْظَلَةُ؟ قَالَ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا رَسُولَ اللهِ، نَكُونُ عِنْدَكَ تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالجَنَّةِ كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا رَجَعْنَا عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالضَّيْعَةَ وَنَسِينَا كَثِيرًا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ تَدُومُونَ عَلَى الحَالِ الَّتِي تَقُومُونَ بِهَا مِنْ عِنْدِي لَصَافَحَتْكُمُ المَلائِكَةُ فِي مَجَالِسِكُمْ، وَفِي طُرُقِكُمْ، وَعَلَى فُرُشِكُمْ، وَلَكِنْ يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتـە: لـە (حنظلـة)ی ئوسـەیدیەوە رەزای خـوای لـێ بـێ کـە یـەکێ بـووە لەنووسەرەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، بـە گریانـەوە دای بەلای پێشەوا ئەبو بەکردا رەزای خوای لێ بێ، پێی فـەرموو: ئـەی (حنظلـة) ئـەوە چیتە؟ (حنظلة) فەرمووی: ئەی پێشەوا ئـەبو بـەکر دەترسـم (حنظلـة) دوورِوو بـێ، کاتێ کە لەخزمەت پێغەمبەری خواداین صلی الله علیه وسلم باسـی ئـاگری زەخ و بەهەشـتمان بـۆ دەکـات ئـەڵێی بەچـاوی خۆمـان سـەیریان دەکـەین و وان بـە بەرچـاومانەوە، کـاتێ گەڕاینـەوە بـۆماڵـەوە سـەرقاڵ بـووین بـە مـاڵ و منـداڵ و خانەوادەوە و کار پیشەکانمانەوە زۆر لە ئامۆژگاریەکانی ئـەومان لـەبیر دەچـێتەوە، پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: سوێند بە (الله) ئێمەش هـەرواین، بـا بـڕۆین بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم، جـا رۆشـتین بـۆ خزمەتی، کە بینینی فەرمووی: (ئەی (حنظلة) ئـەوە چـیتە؟) (حنظلـة) فـەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەترسم (حنظلة) دوورِوو بێ، کـاتێ کـە لەخزمەت تۆداین باسی ئاگری زەخ و بەهەشتمان بۆ دەکات ئەڵێی بەچاوی خۆمـان سەیریان دەکەین و وان بە بەرچاومانەوە، کاتێ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە سەرقاڵ بـووین

بە ماڵ و منداڵ و خانەوادەوە و کار پیشەکانمانەوە زۆر لە ئامۆژگاریەکانی تۆمان لەبیر دەچێتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن کە لای منن لە رێگەوبان و لەسەر نوێن مەلائیکەکان تەوقەیان لەگەڵ دەکردن، بەڵام ئەی (حنظلة) ساتێ بۆ پەرستش و ساتێ بۆ ژیان و گوزەران و ساتێکیش بۆ پشوودان).

٢٥١٥ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کەسێ لەئێوە باوەڕی تەواوی نییە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسوڵمانەکەی پێی خۆش نەبێت).

٢٥١٦ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا لَيْثُ بْنُ سَعْدٍ، وَابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ قَيْسِ بْنِ الْحَجَّاجِ (ح) وحَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا لَيْثُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسُ بْنُ الحَجَّاجِ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ، عَنْ حَنَشٍ الصَّنْعَانِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا، فَقَالَ: يَا غُلاَمُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ.

هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

رۆژێ لەپشکۆی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سوار بوو بووم، فەرمووی: (ئەی غولاّم کوڕی شیرینم با چەند وتەیەکی گرنگت فێربکەم: ماف و سنورەکانی خوای گەورە بپارێزە ئەوەی فەرمانی پێ کردووە بەپێی توانا جێبەجێی بکە، ئەوەشی قەدەغەیکردووە لێی دوور بکەوەرەوە، خوای گەورەش لە و خراپە بەلاّو کارەساتەکانی دونیا دەتپارێزێ، هەرچی داوا دەکەی هەر لە خوای گەورەی داوا بکە و هەر لەو بپاڕێرەوە، داوای یارمەتی و کۆمەکی هەر لە خوا بکە، بزانە هەرچی گەل و دروستکراوانی خوا هەیە کۆببنەوە سودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆی بۆی نوسیووی، وە هەرچی گەل و دروستکراوانی خوا هەیە کۆببنەوە زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆی بۆی نوسیووی، هەرچی تەقدیرات هەیە خوای گەورە بڕیاری لەسەرداوە لە (لوح المحفوظ)دا ئیتر هیچی تر نانوسرێت).

٦٠ - بَابٌ

٢٥١٧ - (حسن) حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ أَبِي قُرَّةَ السَّدُوسِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ أَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ، أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟ قَالَ: اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ قَالَ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ: قَالَ يَحْيَى: وَهَذَا عِنْدِي حَدِيثٌ مُنْكَرٌ. وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە موغیرەی قوڕەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێ بێ بوو دەیفەرموو: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وشترەکەم ببەستمەوەو پشت بە

خوای گەورە ببەستم یان بەرەڵای بکەم و پشت بە خوای گەورە ببەستم، فەرمووی: (وشترەکەم ببەسەرەوە ئەوکاتە پشت بە خوای گەورە ببەستە).

٢٥١٨ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى الأَنْصَارِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ أَبِي الحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: مَا حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ، فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الكَذِبَ رِيبَةٌ وَفِي الحَدِيثِ قِصَّةٌ. وَأَبُو الحَوْرَاءِ السَّعْدِيُّ اسْمُهُ: رَبِيعَةُ بْنُ شَيْبَانَ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ بُرَيْدٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەبو حەورائی سەعدیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بە حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلیم ڕەزای خوایان لێ بێ وت: چیت لەبەرکردووە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم لەبەرکردووە: (واز لەوە بهێنە کە دەتخاتە گومانەوە، بۆ شتێك کە ناتخاتە گومانەوە، چونکە بێگومان ڕاستگۆیی دڵنیاییە، درۆ و دەلەسەش دوودڵییە).

٢٥١٩ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ الطَّائِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي الوَزِيرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ الْمَخْرَمِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نُبَيْهٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: ذُكِرَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعِبَادَةٍ وَاجْتِهَادٍ، وَذُكِرَ عِنْدَهُ آخَرُ بِرِعَةٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يُعْدَلُ بِالرِّعَةِ. وَعَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ هُوَ مِنْ وَلَدِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، وَهُوَ مَدَنِيٌّ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەت

پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم باسی پەرستش و تێکۆشان و خۆماندووکردنی پیاوێ کرا، هەروەها باسی پیاوێکی تر کرا کە خاوەن وەرع و خۆپارێزە لە گوناهو تاوان، فەرمووی: (پەرستش و تێکۆشان و هیچ کردارێکی چاکە بەراورد ناکرێ بە وەرع و خۆپارێزی لە گوناهو تاوان، بەڵکو وەرع گەورەترین خێر و چاکەیە).

٢٥٢٠ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، وَأَبُو زُرْعَةَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، قَالُوا: أَخْبَرَنَا قَبِيصَةُ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ مِقْلاَصٍ الصَّيْرَفِيِّ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ أَكَلَ طَيِّبًا، وَعَمِلَ فِي سُنَّةٍ، وَأَمِنَ النَّاسُ بَوَائِقَهُ دَخَلَ الجَنَّةَ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ هَذَا اليَوْمَ فِي النَّاسِ لَكَثِيرٌ، قَالَ: وَسَيَكُونُ فِي قُرُونٍ بَعْدِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ. حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوَهُ وَسَأَلْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَلَمْ يَعْرِفْهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ إِسْرَائِيلَ وَلَمْ يَعْرِفْ اسْمَ أَبِي بِشْرٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس خواردنی پاك و حەڵاڵ بخوات، کار بە سوننەت بکات، خەڵك لە بەدکاری و زوڵم و ستەم و غەش و زیانی پارێزراوبن ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە)، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەوانە ئەمڕۆ لەناو خەڵکدا زۆرن کە ئەوە کردەوەیانە، فەرمووی: (لەدوای منیش لەسەردەم و چەرخەکانی تردا هەر دەبن).

٢٥٢١ - (**حسن**) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي مَرْحُومٍ عَبْدِ الرَّحِيمِ بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ

أَنَسٍ الجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، وَأَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَنْكَحَ لِلَّهِ، فَقَدْ اسْتَكْمَلَ إِيمَانَهُ. هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی ئەنەسی جوهەنیەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەخشین و نەبەخشین و ڕێگری و خۆشەویستی و رق و کینە و هاوسەرگیری لەپێناوی خوادا بێت و لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێ ئەو کەسە ئیمان و باوەڕی تەواوە).

٢٥٢٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَيْبَانُ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، وَالثَّانِيَةُ عَلَى لَوْنِ أَحْسَنِ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ، لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ عَلَى كُلِّ زَوْجَةٍ سَبْعُونَ حُلَّةً يَبْدُو مُخُّ سَاقِهَا مِنْ وَرَائِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە بەوێنەی مانگی چواردەن ئەوەندە جوان و درەوشاوەن، دووەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە وەك جوانترین ئەستێرەی پرشنگدارن بە ئاسمانەوە، هەر پیاوێ دوو هاوسەری هەیە، هەر هاوسەرێکیان حەفتا پۆشاکی جوانی هەیە، مۆخی لاقیان لەدەرەوە دیارە).

# باسەکانی چۆنیەتی بەهەشت لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٣٦ - أَبْوَابُ صِفَةِ الْجَنَّةِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### دەربارەی چۆنیەتی درەختەکانی بەهەشت

### ١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ شَجَرِ الْجَنَّةِ

٢٥٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان بەهەشت درەختی وای تێدایە سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا دەڕوات).

٢٥٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الدُّورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي الجَنَّةِ شَجَرَةٌ يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا وَقَالَ: ذَلِكَ الظِّلُّ الْمَمْدُودُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان بەهەشت درەختی وای تێدایە سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا دەڕوات بێ ئەوەی بیبڕێت).وە

فەرمووی: ئەوە (الظِّلُّ الْمَمْدُودُ)ە واتە: لەژێر سێبەری بەردەوام و دوورو درێژدان.

٢٥٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ الحَسَنِ بْنِ الفُرَاتِ القَزَّازُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا فِي الجَنَّةِ شَجَرَةٌ إِلاَّ وَسَاقُهَا مِنْ ذَهَبٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ درەختێ نییە لە بەهەشتدا قەدەکەی لە ئاڵتون نەبێ).

## دەربارەی چۆنیەتی بەهەشت و نیعمەتەکانی

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الجَنَّةِ وَنَعِيمِهَا

٢٥٢٦ - (صحيح دون قوله: مِمَّ خُلِقَ الخَلْقُ) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ حَمْزَةَ الزَّيَّاتِ، عَنْ زِيَادٍ الطَّائِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ: مَا لَنَا إِذَا كُنَّا عِنْدَكَ رَقَّتْ قُلُوبُنَا، وَزَهِدْنَا فِي الدُّنْيَا، وَكُنَّا مِنْ أَهْلِ الآخِرَةِ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ فَآنَسْنَا أَهَالِينَا، وَشَمَمْنَا أَوْلاَدَنَا أَنْكَرْنَا أَنْفُسَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ أَنَّكُمْ تَكُونُونَ إِذَا خَرَجْتُمْ مِنْ عِنْدِي كُنْتُمْ عَلَى حَالِكُمْ ذَلِكَ لَزَارَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ فِي بُيُوتِكُمْ، وَلَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَجَاءَ اللَّهُ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ كَيْ يُذْنِبُوا فَيَغْفِرَ لَهُمْ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ مِمَّ خُلِقَ الخَلْقُ؟ قَالَ: مِنَ الْمَاءِ، قُلْتُ: الْجَنَّةُ مَا بِنَاؤُهَا؟ قَالَ: لَبِنَةٌ مِنْ فِضَّةٍ وَلَبِنَةٌ مِنْ ذَهَبٍ، وَمِلاَطُهَا الْمِسْكُ الأَذْفَرُ، وَحَصْبَاؤُهَا اللُّؤْلُؤُ وَاليَاقُوتُ، وَتُرْبَتُهَا الزَّعْفَرَانُ مَنْ دَخَلَهَا يَنْعَمُ وَلاَ يَبْأَسُ، وَيَخْلُدُ وَلاَ يَمُوتُ، لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ، وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ ثُمَّ قَالَ: ثَلاَثٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ، الإِمَامُ العَادِلُ، وَالصَّائِمُ حِينَ يُفْطِرُ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ يَرْفَعُهَا فَوْقَ الغَمَامِ، وَتُفَتَّحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: وَعِزَّتِي لأَنْصُرَنَّكِ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِذَاكَ القَوِيِّ وَلَيْسَ هُوَ

عِنْدِي بِمُتَّصِلٍ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ بِإِسْنَادٍ آخَرَ عَنْ أَبِي مُدِلَّةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆچی کاتێ لەخزمەت تۆداین، دڵمان نەرمە و دونیا بەکەم دەگرین و ئەهلی دوارۆژین؟ بەڵام کاتێ گەڕاینەوە بۆماڵەوە سەرقاڵ بووین بە ماڵ و منداڵ و خانەوادەوە و کار پیشەکانمانەوە زۆر لە ئامۆژگاریەکانی تۆمان لەبیر دەچێتەوە حاڵمان دەگۆڕێ و وەك ئەوە نین کە لەخزمەت تۆداین؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن کە لای منن لەناو ماڵەکانی خۆتاندا مەلائیکەکان سەردانتان دەکەن، ئەگەر ئێوە گوناهو تاوان نەکەن ئەوا خوای گەورە دروستکراوی نوێ دێنێتە کایەوە بۆ ئەوەی گوناهو تاوان بکەن و داوای لێخۆشبوون بکەن و لێیان خۆش بێ)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! دروستکراوان لەچی دروستکراون؟ فەرمووی: (لە ئاو)، وتم: ئەی بەهەشت لەچی درستکراوە؟ فەرمووی: (خشتێ لە زیو و خشتێ لە زێڕ، نێوانیان خشتەکان میسکی زۆر بۆن خۆشە، زیخ و چەوەکەی مرواری و یاقوتە، خاك و گڵ و خۆڵەکەی زەعفەرانە زەرد و نەرم و بۆنی خۆشە، هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و بێ هیوا نابێت و دەکەوێ بەسەر ناز و نیعمەتدا، هەرگیز ناخۆشێ ناخۆشی نابینێ، هەتا هەتایە بەخۆشی و شادی دەژی و نامرێ، پۆشاکەکانیان کۆن نابن و نارزێن، تافی لاویان بەسەر ناچێت و پیریش نابن)، لەپاشدا فەرمووی: (سێ کەس پاڕانەوەیان گیرادەبێت و نادرێتەدواوە، پێشەوای دادپەروەر، رۆژووەوان کاتێ کە رۆژووەکەی دەشکێنێ و بەربانگ دەکاتەوە، پاڕانەوەی ستەم لێ کراو خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە بۆ سەر هەور و دەرگای

ئاسمانەکانی بۆ دەکاتەوە، پەروەردگار دەفەرموێت: سوێند بە گەورەیی و شکۆمەنی خۆم ئەی ستەم لێ کراو سەرت دەخەم با لەپاش ماوەیەکیش بێت).

**دەربارەی چۆنیەتی ژوورەکانی بەهەشت**

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ غُرَفِ الجَنَّةِ

٢٥٢٧ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَغُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا فَقَامَ إِلَيْهِ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: هِيَ لِمَنْ أَطَابَ الكَلَامَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ، وَصَلَّى لِلَّهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ هَذَا مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ وَهُوَ كُوفِيٌّ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ القُرَشِيُّ مَدِينِيٌّ وَهُوَ أَثْبَتُ مِنْ هَذَا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەهەشت ژوورهای وەهای تێدایە لەدەرەوە ناوەوەی دەبینرێت و لەناوەوە دەرەوەی دەبینرێت). عەرەبێکی دەشتەکی هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەوە بۆ کێ دەبێت؟ فەرمووی: (بۆ ئەو کەسەی کە گوفتاری شیرینەو قسەی چاك دەکات، خواردن دەدات بە هەژاران و، زۆر بە ڕۆژوو دەبێ، لەکاتێکدا کە خەڵك خەوتوون ئەو شەونوێژ دەکات).

٢٥٢٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ أَبُو عَبْدِ الصَّمَدِ العَمِّيُّ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ الجَوْنِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ جَنَّتَيْنِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا

وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ، وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَخَيْمَةً مِنْ دُرَّةٍ مُجَوَّفَةٍ عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ لاَ يَرَوْنَ الآخَرِينَ يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو عِمْرَانَ الْجَوْنِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ حَبِيبٍ وَأَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي مُوسَى قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لاَ يُعْرَفُ اسْمُهُ وَأَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ قَيْسٍ، وَأَبُو مَالِكٍ الأَشْعَرِيُّ اسْمُهُ: سَعْدُ بْنُ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ.

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی (عبد الله)ی کوڕی قەیسەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەبەهەشتدا دوو باخی تێدایە پەرداخ و جام دەفرەکانی و ئەوەی کە تێیدایە لە زیوە، دوو باخی تری تێدایە هەیە پەرداخ و جام دەفرەکانی و ئەوەی کە تێیدایە لە زێڕە، لە باخی هەمیشەیی بەهەشتدا لەنێوان خەڵك و بینینی خوای پەروەردگاریان هیچ شتێك ڕێگر نیە جگە لە پۆشاکی شکۆمەندی خوا نەبێ).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەبەهەشتدا خێمەی تێدایە بریتیە لە مروایەکی بۆش پانیەکەی شەست میلە، لەهەموو گۆشەیە لە گۆشەکانی ئەو خێمەیەدا خێزانێکی خاوەنی ئەو چادرەی تێدایە چاویان بریوەتە هاوسەرەکەی خۆیان و دڵیان لای کەسی تر نیە، خێزانی ناو هیچ گۆشەیە چاویان لەو خێزانانەی تر نیە کە لە گۆشەکانی تری ئەو خێمەدان، پیاوی باوەڕدار بە ئارەزووی خۆی گۆشە بە گۆشە دەسوڕێتەوە بەسەر هاوسەرەکانی خۆیدا).

## دەربارەی چۆنیەتی پایەکانی بەهەشت

## ٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ دَرَجَاتِ الجَنَّةِ

٢٥٢٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ العَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَادَةَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا سەد پایەی بەرز هەیە لەنێوانی هەموو دوو پایەیە سەد ساڵە رێیە).

٢٥٣٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَأَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ الضَّبِّيُّ البَصْرِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَصَلَّى الصَّلَوَاتِ وَحَجَّ البَيْتَ، لاَ أَدْرِي أَذَكَرَ الزَّكَاةَ أَمْ لاَ، إِلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ، إِنْ هَاجَرَ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ مَكَثَ بِأَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ بِهَا قَالَ مُعَاذٌ: أَلاَ أُخْبِرُ بِهَذَا النَّاسَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ذَرِ النَّاسَ يَعْمَلُونَ فَإِنَّ فِي الجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَالفِرْدَوْسُ أَعْلَى الجَنَّةِ وَأَوْسَطُهَا، وَفَوْقَ ذَلِكَ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهَا تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ. هَكَذَا رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ وَهَذَا عِنْدِي أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ هَمَّامٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وَعَطَاءٌ، لَمْ يُدْرِكْ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، وَمُعَاذٌ قَدِيمُ الْمَوْتِ، مَاتَ فِي خِلاَفَةِ عُمَرَ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ رۆژووی رەمەزان

بگرێ و پێنج فەرزە نوێژەکانی بکات و حەج بکات، نازانم باسی زەکاتی کرد یان نا، خوای گەورە لێی خۆش دەبێ، ئیتر لەپێناوی خوا کۆشی کردبێ یان لەشوێنەدا مابێتەوە کە لێی لەدایك بووە). (معاذ)ی رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئایا ئەم هەواڵە رانەگەیەنم بە خەڵك؟ فەرمووی: (واز لەو خەڵکە بێنە با کاری خۆیان بکەن، لە بەهەشتدا سەد پایەی بەرز هەیە نێوانی هەموو دوو پایەیە هێندەی نێوانی ئاسمان و زەوییە، فیردەوس بەرزترین شوێنە و ناوەڕاستی بەهەشتە، عەرشیش لەسەرەوەیەتی، لەوێشەوە رووبارەکانی بەهەشت سەرچاوەدەگرن و هەڵدەقوڵێن، ئەگەر داواتان کرد لە خوای گەورە داوای فیردەوس بکەن).

٢٥٣١ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا هَمَّامٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَالْفِرْدَوْسُ أَعْلاَهَا دَرَجَةً وَمِنْهَا تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ الأَرْبَعَةُ، وَمِنْ فَوْقِهَا يَكُونُ العَرْشُ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، نَحْوَهُ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا سەد پایەی بەرز هەیە نێوانی هەموو دوو پایەیە هێندەی نێوانی ئاسمان و زەوییە، فیردەوس بەرزترین شوێنە لەوێشەوە چوار رووبارەکانی بەهەشت سەرچاوەدەگرن و هەڵدەقوڵێن، عەرشیش لەسەرەوەیەتی، ئەگەر داواتان کرد لە خوای گەورە داوای فیردەوس بکەن).

٢٥٣٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الْهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ، لَوْ أَنَّ الْعَالَمِينَ اجْتَمَعُوا فِي إِحْدَاهُنَّ لَوَسِعَتْهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا سەد پایە هەیە، ئەگەر هەرچی خەڵکی جیهانیان هەیە کۆببنەوە لە یەکێکیاندا جێگایان دەبێتەوە).

## دەربارەی چۆنیەتی ئافرەتانی بەهەشت

## ٥ - بَابٌ فِي صِفَةِ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ

٢٥٣٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ لَيُرَى بَيَاضُ سَاقِهَا مِنْ وَرَاءِ سَبْعِينَ حُلَّةً حَتَّى يُرَى مُخُّهَا، وَذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: (كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ) فَأَمَّا الْيَاقُوتُ فَإِنَّهُ حَجَرٌ لَوْ أَدْخَلْتَ فِيهِ سِلْكًا ثُمَّ اسْتَصْفَيْتَهُ لَأُرِيتَهُ مِنْ وَرَائِهِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتانی بەهەشت لەژێر حەفتا پۆشاکەوە سپیایی قاچیان دەبینرێت، تەنانەت مۆخی لاقیشیان دەبینرێت، لەبەر ئەمەیە خوای گەورە دەفەرموێت: (كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ). واتە: ئەوەندە ناسك و نازدار و شۆخ و شەنگ و سور و سپین ئەڵێی یاقوت و مەرجانن. یاقوت بەردێکی بەنرخە لەبەر روونی و بێگەردی ئەگەر کونی تێ بکەیت و دوزویەکی تێ بکەی لەدەرەوە دیارە.

٢٥٣٤ – **(انظر ما قبله)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ عَبِيدَةَ بْنِ حُمَيْدٍ وَهَكَذَا رَوَى جَرِيرٌ وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ وَلَمْ يَرْفَعُوهُ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، نَحْوَ حَدِيثِ أَبِي الأَحْوَصِ وَلَمْ يَرْفَعْهُ أَصْحَابُ عَطَاءٍ، وَهَذَا أَصَحُّ.

٢٥٣٥ – **(صحيح)** حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ مَرْزُوقٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ يَوْمَ القِيَامَةِ ضَوْءُ وُجُوهِهِمْ عَلَى مِثْلِ ضَوْءِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، وَالزُّمْرَةُ الثَّانِيَةُ عَلَى مِثْلِ أَحْسَنِ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ، لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ عَلَى كُلِّ زَوْجَةٍ سَبْعُونَ حُلَّةً يُرَى مُخُّ سَاقِهَا مِنْ وَرَائِهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە ڕووناکی ڕوخساریان بەوێنەی مانگی چواردەیە ئەوەندە جوان و درەوشاوەن، دووەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە وەك جوانترین ئەستێرەی پرشنگدارن بە ئاسمانەوە، هەر پیاوێ دوو هاوسەری هەیە، هەر هاوسەرێکیان حەفتا پۆشاکی جوانی هەیە، مۆخی لاقیان لەدەرەوە دیارە).

## دەربارەی چۆنیەتی جوتبوونی خەڵکی بەهەشت

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ جِمَاعِ أَهْلِ الجَنَّةِ

٢٥٣٦ - (**حسن صحيح**) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ عِمْرَانَ القَطَّانِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: يُعْطَى الْمُؤْمِنُ فِي الجَنَّةِ قُوَّةَ كَذَا وَكَذَا مِنَ الجِمَاعِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَوَ يُطِيقُ ذَلِكَ؟ قَالَ: يُعْطَى قُوَّةَ مِائَةٍ. وَفِي البَابِ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ القَطَّانِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پیاوی باوەڕدار هێز و توانای ئەوەندە و ئەوەند کەسی پێ دەدرێت بۆ جوتبوون لەگەڵ ئافرەت)، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئایا ئەوەندە توانای پێ دەدرێت؟ فەرمووی: (بەڵێ، هێز و توانای سەد پیاوی پێ دەدرێت).

## دەربارەی چۆنیەتی خەڵکی بەهەشت

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ أَهْلِ الجَنَّةِ

٢٥٣٧ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَلِجُ الجَنَّةَ صُورَتُهُمْ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ لاَ يَبْصُقُونَ فِيهَا وَلاَ يَمْخُطُونَ وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، آنِيَتُهُمْ فِيهَا الذَّهَبُ، وَأَمْشَاطُهُمْ مِنَ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، وَمَجَامِرُهُمْ مِنَ الأَلُوَّةِ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، وَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا

مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ مِنَ الحُسْنِ لاَ اخْتِلاَفَ بَيْنَهُمْ وَلاَ تَبَاغُضَ، قُلُوبُهُمْ قَلْبُ رَجُلٍ وَاحِدٍ، يُسَبِّحُونَ اللَّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَالأُلُوَّةُ: هُوَ العُودُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەرۆژی قیامەتدا یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە بەوێنەی مانگی چواردەن ئەوەندە جوان و درەوشاوەن، تف و چڵم و بەڵغەم ڕۆ ناکەن، جام و قاپ و پەرداخ و دەفرەکانیان لە زێڕە، شانەکانیان لە زێڕ و زیوە، بخوردانەکانیان دارعودی تێدا دەسوتێ، عەرەقیان بۆنی میسك دەدات، هەر پیاوێ دوو هاوسەری هەیە، هەر هاوسەرێکیان حەفتا پۆشاکی جوانی هەیە، مۆخی لاقیان لەدەرەوە دیارە ئەوەندە ساف و سپی و جوانن، جیاوازی و رق و کینەو دووبەرەکیان لەناودا نیە، دڵیان وەك دڵی کەسێکە بەیانیان و ئێواران زیکر و یادی خوا دەکەن).

٢٥٣٨ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَوْ أَنَّ مَا يُقِلُّ ظُفُرٌ مِمَّا فِي الجَنَّةِ بَدَا لَتَزَخْرَفَتْ لَهُ مَا بَيْنَ خَوَافِقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَ فَبَدَا أَسَاوِرُهُ لَطَمَسَ ضَوْءَ الشَّمْسِ كَمَا تَطْمِسُ الشَّمْسُ ضَوْءَ النُّجُومِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ بِهَذَا الإِسْنَادِ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ. وَقَدْ رَوَى يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، وَقَالَ: عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئەوەندەی نینۆکێ هەڵیبگرێ لەوەی لەبەهەشتدایە دەرکەوێت

هەرچی لەنێوان ئاسمانەكان و زەویدایە دەدرەوشێتەوە، ئەگەر پیاوێ لەخەڵكی بەهەشت دەركەوێ و بازنەكانی دەركەون رووناكی خۆر ناهێڵێت وەك چۆن خۆر رووناكی ئەستێرە ناهێڵێ).

## دەربارەی چۆنیەتی پۆشاكی خەڵكی بەهەشت

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ ثِيَابِ أَهْلِ الجَنَّةِ

٢٥٣٩ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَأَبُو هِشَامٍ الرِّفَاعِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَامِرٍ الأَحْوَلِ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَهْلُ الجَنَّةِ جُرْدٌ مُرْدٌ كُحْلٌ لاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ وَلاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خەڵكی بەهەشت جەستەیان بێ تووكە و جوان و جەحێڵ و لوسن، چاویان رێژراوە، تافی لاویان بەسەر ناچێت و پیر نابن، پۆشاكەكانیان كۆن نابن و نارزێن).

٢٥٤٠ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ أَبِي السَّمْحِ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ) قَالَ: ارْتِفَاعُهَا لَكَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ مَسِيرَةَ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ رِشْدِينَ بْنِ سَعْدٍ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي تَفْسِيرِ هَذَا الحَدِيثِ إِنَّ مَعْنَاهُ الفُرُشَ فِي الدَّرَجَاتِ، وَبَيْنَ الدَّرَجَاتِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئـەم ئایەتـە: (وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ) واتـە: راخـەری بـەرزو بڵندی لێیە. فەرموویەتی: (بەهەشت راخەری بەرزو بڵـندی لێیـە هێنـدەی مـاوەی نێوان ئاسمان و زەویـیە و دووری پێنج سەد ساڵە). هەندێ لە زانایـان لـە تەفسـیری ئەم فەرموودەدا دەڵێن: فەرشەکان لە پلکاندان نێوانپلەیە بۆ پلەیـەکی تـر هێنـدەی ماوەی نێوان ئاسمان و زەوییە.

## دەربارەی چۆنیەتی بەرهەمی خەڵکی بەهەشت

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ ثِمَارِ أَهْلِ الْجَنَّةِ

٢٥٤١ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَذَكَرَ سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى، قَالَ: يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّ الفَنَنِ مِنْهَا مِائَةَ سَنَةٍ، أَوْ يَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا مِائَةُ رَاكِبٍ، شَكَّ يَحْيَى، فِيهَا فِرَاشُ الذَّهَبِ كَأَنَّ ثَمَرَهَا الْقِلاَلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەسمای کچی پێشەوا ئەبو بـەکرەوە، لەباوکیـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، باسی (سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى)ی کـرد - کـە درەختێکـە لـە ئاسمـانی حەوتەمدایـە و نزیکی عەرشە و درەختێکی پڕ گەڵاو سێبەری ی چڕو پڕە - فەرمووی: (بەهەشت درەختی وای تێدایە سەد ساڵ سوار بە سێبەری گەڵا ناسـکەکانی و وردە لقەکانیـدا دەڕوات، یـان سـەد سـوار لەسێبەریاندا دەحەوێنـەوە، پەپولـەی زێڕینیـان پێوەیـە، بـەدەوری درەختەکانـدا دەسـوڕێنەوە و دەنیشـنەوە، بەرەکـەی دەڵێـی کۆپەڵـەی هەجەرە).

### دەربارەی چۆنیەتی باڵندەکانی بەهەشت

### ١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ طَيْرِ الجَنَّةِ

٢٥٤٢ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا الكَوْثَرُ؟ قَالَ: ذَاكَ نَهْرٌ أَعْطَانِيهِ اللَّهُ، يَعْنِي فِي الجَنَّةِ، أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ، فِيهَا طَيْرٌ أَعْنَاقُهَا كَأَعْنَاقِ الجُزُرِ قَالَ عُمَرُ: إِنَّ هَذِهِ لَنَاعِمَةٌ. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَكَلَتُهَا أَنْعَمُ مِنْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ هُوَ: ابْنُ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ الزُّهْرِيِّ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مُسْلِمٍ، قَدْ رَوَى عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی حەوزی کەوسەر چییە؟ فەرمووی: (دەریایەکە خوای گەورە لە بەهەشتدا پێم دەبەخشێت، ئاوەکەی لە شیر سپی ترە، لەهەنگوین شیرینترە، باڵندەی تێدایە ملی وەك ملی وشترە)، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەو باڵندانە لە خۆشگوزەرانیدان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بخۆرەکانیشی لەوان خۆشگوزەرانترن).

### دەربارەی چۆنیەتی ئەسپ و وڵاخە بەرزەکانی بەهەشت

### ١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ خَيْلِ الجَنَّةِ

٢٥٤٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمَسْعُودِيُّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ فِي الجَنَّةِ مِنْ خَيْلٍ؟ قَالَ: إِنِ اللَّهُ أَدْخَلَكَ الجَنَّةَ، فَلاَ تَشَاءُ أَنْ تُحْمَلَ فِيهَا عَلَى فَرَسٍ مِنْ يَاقُوتَةٍ حَمْرَاءَ يَطِيرُ

بِكَ فِي الجَنَّةِ حَيْثُ شِئْتَ إِلاَّ فَعَلَتْ قَالَ: وَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ فِي الجَنَّةِ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: فَلَمْ يَقُلْ لَهُ مَا قَالَ لِصَاحِبِهِ قَالَ: إِنْ يُدْخِلْكَ اللهُ الجَنَّةَ يَكُنْ لَكَ فِيهَا مَا اشْتَهَتْ نَفْسُكَ وَلَذَّتْ عَيْنُكَ.

حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَابِطٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ الْمَسْعُودِيِّ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەهەشتدا ئەسپ و وڵاخە بەرزە هەیە؟ فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە تۆی بردە بەهەشتەوە، ئەگەر ئارەزوو بکەی سواری ئەسپێکی باڵدار دەبی، باڵەکانی لە یاقوتی سور و ئاڵ دروستکراوە، بۆ هەرکوێ ئارەزوو بکەی لەبەهەشتدا باڵ دەگرێتەوە و دەتبات بۆ ئەو شوێنە). پیاوێکی تر پرسیاری لێ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەبەهەشتدا وشتر هەیە؟ وەك پیاوەکەی پێشووی پێ نەفەرموو، فەرمووی : (ئەگەر خوای گەورە تۆی بردە بەهەشتەوە، هەموو شتێ بەدڵی تۆیە هەرچی نەفست ئارەزوو بکات و چاوەکانت لەزەت و خۆشی لێ وەرگرن بۆت دەستەبەر دەکرێ).

٢٥٤٤ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ سَمُرَةَ الأَحْمَسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ وَاصِلٍ هُوَ ابْنُ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي سَوْرَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أُحِبُّ الخَيْلَ، أَفِي الجَنَّةِ خَيْلٌ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ أُدْخِلْتَ الجَنَّةَ أُتِيتَ بِفَرَسٍ مِنْ يَاقُوتَةٍ لَهُ جَنَاحَانِ فَحُمِلْتَ عَلَيْهِ، ثُمَّ طَارَ بِكَ حَيْثُ شِئْتَ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ، وَلاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أَيُّوبَ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو سَوْرَةَ هُوَ: ابْنُ أَخِي أَبِي أَيُّوبَ

يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ، ضَعَّفَهُ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ جِدًّا وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ، يَقُولُ: أَبُو سَوْرَةَ هَذَا مُنْكَرُ الحَدِيثِ يَرْوِي مَنَاكِيرَ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ لاَ يُتَابَعُ عَلَيْهَا.

واتە: لە ئەبو ئەیوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە دەشتەکیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، من حەزم لەسواری ئەسپ و وڵاخی بەرزەیە، ئایا لەبەهەشتدا ئەسپ و وڵاخی بەرزە هەیە؟ فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە تۆی بردە بەهەشتەوە، ئەسپێکی باڵدارت بۆ دێنن باڵەکانی لە یاقوتی سور و ناڵ دروستکراوە، سوارت دەکەن، لەپاشدا بۆ هەرکوێ ئارەزوو بکەی لەبەهەشتدا باڵ دەگرێتەوە و دەتبات بۆ ئەو شوێنە).

## دەربارەی تەمەنی خەڵکی بەهەشت

### ١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سِنِّ أَهْلِ الجَنَّةِ

٢٥٤٥ - (حسن) حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ مُحَمَّدُ بْنُ فِرَاسٍ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِمْرَانُ أَبُو العَوَّامِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَدْخُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ جُرْدًا مُرْدًا مُكَحَّلِينَ أَبْنَاءَ ثَلاَثِينَ أَوْ ثَلاَثٍ وَثَلاَثِينَ سَنَةً. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَبَعْضُ أَصْحَابِ قَتَادَةَ رَوَوْا هَذَا عَنْ قَتَادَةَ، مُرْسَلاً وَلَمْ يُسْنِدُوهُ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکی بەهەشت کە دەچنە بەهەشتەوە جەستەیان بێ تووکە و جوان و جەحێڵ و لوسن، چاویان ڕێژراوە، لە تافی لاویدان تەمەنیان سی بۆ سی و سێ ساڵە).

## دەربارەی ریزەکانی خەڵکی بەهەشت

## ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صَفِّ أَهْلِ الجَنَّةِ

٢٥٤٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ يَزِيدَ الطَّحَّانُ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ ضِرَارِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَهْلُ الجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ ثَمَانُونَ مِنْهَا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ وَأَرْبَعُونَ مِنْ سَائِرِ الأُمَمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْسَلاً، وَمِنْهُمْ مَنْ قَالَ: عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ. وَحَدِيثُ أَبِي سِنَانٍ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ حَسَنٌ وَأَبُو سِنَانٍ اسْمُهُ: ضِرَارُ بْنُ مُرَّةَ، وَأَبُو سِنَانٍ الشَّيْبَانِيُّ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ سِنَانٍ وَهُوَ بَصْرِيٌّ، وَأَبُو سِنَانٍ الشَّامِيُّ اسْمُهُ: عِيسَى بْنُ سِنَانٍ هُوَ القَسْمَلِيُّ.

واتە: لە بورەیدەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکی بەهەشت سەد و بیست ریزن هەشتا ریزیان لە خەڵکانی ئوممەتی منن واتە ئەوەندە زۆرن، ئەوانی تریش لە خەڵکانی ئوممەتانی ترن).

٢٥٤٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ يُحَدِّثُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الجَنَّةِ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ، إِنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، مَا أَنْتُمْ فِي الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ

فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە دەوارێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، پێی فەرمووین: (ئایا رازی دەبن ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (ئایا رازی دەبن ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (ئایا رازی دەبن ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن؟) بێگومان جگە لە کەسی موسوڵمان هیچ کەسێکی تر ناچێتە بەهەشتەوە، ئێوەش لەچاو ئەو خەڵکەی تردا کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن وەك تاڵێ مووی سپی وان بە پێستی گایەکی ڕەشەوە، یان وەك تاڵێ مووی ڕەش وان بە پێستی گایەکی سوورەوە).

## دەربارەی چۆنیەتی دەرگاکانی بەهەشت

١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ أَبْوَابِ الجَنَّةِ

٢٥٤٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ الصَّبَّاحِ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَى القَزَّازُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَابُ أُمَّتِي الَّذِي يَدْخُلُونَ مِنْهُ الجَنَّةَ عَرْضُهُ مَسِيرَةُ الرَّاكِبِ الْمُجَوِّدِ ثَلَاثًا، ثُمَّ إِنَّهُمْ لَيُضْغَطُونَ عَلَيْهِ حَتَّى تَكَادَ مَنَاكِبُهُمْ تَزُولُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ. سَأَلْتُ مُحَمَّدًا، عَنْ هَذَا الحَدِيثِ فَلَمْ يَعْرِفْهُ، وقَالَ: لِخَالِدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ مَنَاكِيرُ عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ.

واتە: لە سالمی کوڕی (عبد الله)وە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:

(ئەو دەرگایەی کە ئوممەتم لێیەوە دەچنەژوورەوە بۆ بەهەشت سێ رۆژە رێیە بە رۆشتنی ئەسپی رەسەنی چاپوك و ئازا، لەپاشدا لەبەر قەرەباڵغی بە شێوەیە دەچنەژوورەوە خەریکە شانیان لەجێ بچێ ئەوەندە شان شانێن دەکەن).

## دەربارەی چۆنیەتی بازاڕی بەهەشت

## ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي سُوقِ الجَنَّةِ

٢٥٤٩ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ حَبِيبِ بْنِ أَبِي العِشْرِينَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَسَّانُ بْنُ عَطِيَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ لَقِيَ أَبَا هُرَيْرَةَ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ فِي سُوقِ الجَنَّةِ، فَقَالَ سَعِيدٌ: أَفِيهَا سُوقٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ إِذَا دَخَلُوهَا نَزَلُوا فِيهَا بِفَضْلِ أَعْمَالِهِمْ، ثُمَّ يُؤْذَنُ فِي مِقْدَارِ يَوْمِ الجُمُعَةِ مِنْ أَيَّامِ الدُّنْيَا فَيَزُورُونَ رَبَّهُمْ، وَيُبْرِزُ لَهُمْ عَرْشَهُ وَيَتَبَدَّى لَهُمْ فِي رَوْضَةٍ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ، فَتُوضَعُ لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ وَمَنَابِرُ مِنْ لُؤْلُؤٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ يَاقُوتٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ زَبَرْجَدٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ ذَهَبٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ فِضَّةٍ، وَيَجْلِسُ أَدْنَاهُمْ وَمَا فِيهِمْ مِنْ دَنِيٍّ عَلَى كُثْبَانِ الْمِسْكِ وَالكَافُورِ، مَا يَرَوْنَ أَنَّ أَصْحَابَ الكَرَاسِيِّ بِأَفْضَلَ مِنْهُمْ مَجْلِسًا. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ وَهَلْ نَرَى رَبَّنَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: هَلْ تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالقَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ؟ قُلْنَا: لاَ. قَالَ: كَذَلِكَ لاَ تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ وَلاَ يَبْقَى فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ رَجُلٌ إِلاَّ حَاضَرَهُ اللَّهُ مُحَاضَرَةً حَتَّى يَقُولَ لِلرَّجُلِ مِنْهُمْ: يَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ أَتَذْكُرُ يَوْمَ قُلْتَ: كَذَا وَكَذَا؟ فَيُذَكِّرُهُ بِبَعْضِ غَدْرَاتِهِ فِي الدُّنْيَا، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَفَلَمْ تَغْفِرْ لِي؟ فَيَقُولُ: بَلَى، فَبِسَعَةُ مَغْفِرَتِي بَلَغْتَ مَنْزِلَتَكَ هَذِهِ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ غَشِيَتْهُمْ سَحَابَةٌ مِنْ فَوْقِهِمْ فَأَمْطَرَتْ عَلَيْهِمْ طِيبًا لَمْ يَجِدُوا مِثْلَ رِيحِهِ شَيْئًا قَطُّ،وَيَقُولُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى: قُومُوا إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لَكُمْ مِنَ الكَرَامَةِ فَخُذُوا

مَا اشْتَهَيْتُمْ، فَنَأْتِي سُوقًا قَدْ حَفَّتْ بِهِ الْمَلاَئِكَةُ، فِيهِ مَا لَمْ تَنْظُرِ الْعُيُونُ إِلَى مِثْلِهِ، وَلَمْ تَسْمَعِ الآذَانُ، وَلَمْ يَخْطُرْ عَلَى الْقُلُوبِ فَيُحْمَلُ إِلَيْنَا مَا اشْتَهَيْنَا، لَيْسَ يُبَاعُ فِيهَا وَلاَ يُشْتَرَى، وَفِي ذَلِكَ السُّوقِ يَلْقَى أَهْلُ الْجَنَّةِ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، قَالَ: فَيُقْبِلُ الرَّجُلُ ذُو الْمَنْزِلَةِ الْمُرْتَفِعَةِ فَيَلْقَى مَنْ هُوَ دُونَهُ وَمَا فِيهِمْ دَنِيٌّ فَيَرُوعُهُ مَا يَرَى عَلَيْهِ مِنَ اللِّبَاسِ، فَمَا يَنْقَضِي آخِرُ حَدِيثِهِ حَتَّى يَتَخَيَّلَ عَلَيْهِ مَا هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَحْزَنَ فِيهَا، ثُمَّ نَنْصَرِفُ إِلَى مَنَازِلِنَا، فَيَتَلَقَّانَا أَزْوَاجُنَا فَيَقُلْنَ مَرْحَبًا وَأَهْلاً، لَقَدْ جِئْتَ وَإِنَّ بِكَ مِنَ الْجَمَالِ أَفْضَلَ مِمَّا فَارَقْتَنَا عَلَيْهِ، فَيَقُولُ: إِنَّا جَالَسْنَا الْيَوْمَ رَبَّنَا الْجَبَّارَ، وَيَحِقُّنَا أَنْ نَنْقَلِبَ بِمِثْلِ مَا انْقَلَبْنَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ وَقَدْ رَوَى سُوَيْدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، شَيْئًا مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە دەگێڕنەوە، کە گەشتووە بە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ، ئەبو هورەیرە فەرمووی: داوا دەکەم لە خوای گەورە منیش و تۆش لەبازاڕی بەهەشت کۆبکاتەوە، سەعید وتی: بۆچی بەهەشت بازاڕی تێدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی ڕاگەیاندم و فەرمووی: (کاتێ خەڵکە بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە بەپێی زۆر و کەمی کردەوە چاکەکانیان پایەی بەرز یان پایەی نزم وەردەگرن، لەرۆژی هەینی دا خوای پەروەردگاریان ڕێگەیان پێ دەدات سەردانی بکەن، بە ئەندازەی ڕۆژەکانی دونیا کاتیان لێ دەڕوات، لە باخێ لە باخەکانی بەهەشتدا خوای گەورە بەبێ پەردە خۆی نیشان دەردەخات بۆیان و دەیبینن، مینبەریان بۆ ئامادەکراوە، هەندێکیان لەسەر مینبەری نوور دادەنیشن، هەندێکیان لەسەر مینبەری مرواری دادەنیشن، هەندێکیان لەسەر مینبەری یاقوت دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زوبەرجەد دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زێڕ دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زیو دادەنیشن، پلە هەرە نزمەکانیان لەسەر تەپۆلکەی میسك و کافور دادەنیشن، وا گومان نابەن کە خاوەن مینبەرەکان لەوان چاکتر بن

و بە بەشی خۆیان رازین). ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئایا لە بینینی خۆر و مانگی چواردەدا گومانتان هەیە؟) وتمان: نەخێر، فەرمووی: (دەی بەو شێوەیە بەڕوون و ئاشكرا پەروەردگارتان دەبینن و هیچ شك و گومانێكتان نامێنێ، هیچ یەكێ لە ئامادەبووانی ئەو كۆڕ و دانیشتنە نیە ئیللا خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ دەكات و پێی دەفەرموێت: ئەی فلانی كوڕی فلان، فلانە ڕۆژ و فلانە ڕۆژت لەبیر دێ چیت دەوت؟ هەندێ لە بێ پەیمانی و گوناهی خۆی وەبیر دێنێتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەی تۆ لێم خۆش نەبووی؟ دەفەرموێت: بەڵێ بە ڕەحمەتی بێ سنور و فراوانی خۆم نەبوایە تۆ نەدەگەیشتیتە ئەم پایە بەرز و مەزنە كە چاوت بەمن بكەوێت، ئیتر لەسەر ئەو حاڵەتەن لەپڕ پەڵە هەورێ لەسەرەوە دایان دەپۆشێ بۆن بەرامەیەكی وا خۆش دەبارێنێ بەسەریاندا هەرگیز بۆنی وا خۆشیان نەدیبێ، خوای خاوەن شكۆ و پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ئادەی هەستن بچن بەدەم ئەو ڕێز و ناز و نیعمەتانەوە كە بۆم ئامادەكردوون هەرچی ئارەزوو دەكەن بیبەن بۆ خۆتان، جا دەچین بۆ بازاڕێ مەلائیكە لەهەموو لایەكەوە دەورەیان داوە، بازاڕەكە شتی وای تێدایە نە بەچاو بینراوە، نە بەگوێ بیستراوە، نەهاتووە بە دڵی هیچ كەسێكدا، جا حەزمان لەچی بێ هەڵی دەگرن بۆمان و دەیبەنەوە بۆناو كۆشك و تەلارەكانمان، كڕین و فرۆشتنی تێدا نیە، خەڵك لەو بازاڕەدا دەگەن بەیەك، فەرمووی: وا ڕێك دەكەوێ پیاوی خاوەن پایەی بەرز دەگات بە پیاوی لەخۆی خوارتر كە چاویان بەیەك دەكەوێ لەبەر جوانی و كەشخەیی جل و بەرگەكەی تاس دەیباتەوە بەڵام پێش ئەوەی خەیاڵەكەی تەواو ببێ لەبەر ئەوەی دڵی لەخۆی دانەمێنێ تەماشا دەكات جل و بەرگەكەی خۆی لەهی ئەو جوانترە، ئەمەش لەبەرئەوەیە نابێ كەس لە بەهەشتدا خەم و پەژارەی هەبێ، ئینجا دەچینەوە بۆ ماڵەوە هاوسەرەكانمان دێن بە پیرمانەوە و

دەڵێن: مەرحەبات لێ بێ و بەخێر بێیتەوە لەجاران جوانتر بووی، ئەویش دەڵێ: ئەمڕۆ چاومان بە پەروەردگارمان كەوتووە لەبەرئەوە هەقی خۆیەتی جوانتربووین).

٢٥٥٠ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، وَهَنَّادٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَسُوقًا مَا فِيهَا شِرَاءٌ وَلاَ بَيْعٌ إِلاَّ الصُّوَرَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، فَإِذَا اشْتَهَى الرَّجُلُ صُورَةً دَخَلَ فِيهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە بەهەشتدا بازاڕێ هەیە كڕین و فرۆشتنی تێدا نیە، جگە لە وێنە و پەیكەری ژن و پیاو، هەركەسێ حەزی لەهەر پەیكەرێ ببێ دەچێتە ناوی ڕێك دەقی ئەو پەیكەرە دەگرێ و ڕەنگ و ڕواڵەتی وەك ئەوی لێ دێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی بینینی پەروەردگار

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رُؤْيَةِ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى

٢٥٥١ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ البَجَلِيِّ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَظَرَ إِلَى القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ سَتُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّكُمْ فَتَرَوْنَهُ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا القَمَرَ لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنْ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلاَةٍ قَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا، ثُمَّ قَرَأَ: (وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ). هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جەریری كوڕی (عبد الله) بەجەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە،

کە فەرموویەتی: شەوێ لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، مانگی چواردە بوو، تەماشایەکی مانگی کردوو فەرمووی: (چۆن ئێستا ئەو مانگی چواردەیە بە ئاسانی دەبینن لە قیامەتدا ئاوا خوای خۆتان دەبینن و لە بینینیدا توشی هیچ کێشە و زەحمەتێ نابن، دەی بە نومێدی شادبوون بەو بەهرە گەورەیە تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و عەسر بن و مەیان فەوتێنن. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ).سورة طه: ١٣٠.

٢٥٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ نَادَى مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِدًا، قَالُوا: أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا وَيُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ؟ قَالُوا: بَلَى، فَيُكْشَفُ الْحِجَابُ، قَالَ: فَوَاللهِ مَا أَعْطَاهُمْ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا أَسْنَدَهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَرَفَعَهُ. وَرَوَى سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، وَحَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَوْلَهُ.

واتە: لە صوهەیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ). واتە: کاتێك بەهەشتیەکان سەرجەم دەچنە بەهەشت، خوا تەبارك و تعالی پێیان دەفەرموێت: ئەرێ شتێکی ترتان دەوێ بۆتان زیاد بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: چی ماوە تا پێمان بدەیت، ئەوەتانێ رووت سپی کردووین و لەناو بەهەشتدا داتناوین و لە ئاگری دۆزەخ رزگارت کردووین! جا خوا پەردەی نێوانی خۆی و بەندەکانی هەڵ دەماڵێ و بەندەکان بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ئیتر هەرگیز شتی وا خۆش و خۆشەویست لەوەو پێش خەڵات نەکراوە پێیان، وەك ئەوە

بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان بکەن).

٢٥٥٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قَوْلِهِ: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وَزِيَادَةٌ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ نَادَى مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِدًا، قَالُوا: أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا وَيُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ وَيُدْخِلْنَا الجَنَّةَ؟ قَالُوا: بَلَى، فَيُكْشَفُ الحِجَابُ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا أَعْطَاهُمْ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ إِنَّمَا أَسْنَدَهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَرَفَعَهُ. وَرَوَى سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، وَحَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، قَوْلَهُ.

واتە: لە صوهەیبەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وَزِيَادَةٌ). واتە: بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن، پاداشتی زۆر چاك و بەهەشت هەیە، وە زیادە لەوەش. فەرمووی: کاتیٚ ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە جارچییە جاڕ دەدات: ئەی خەڵکی بەهەشت ئێوە وادەیەکتان هەیە لەلای خوا شتێکی زیادەتان ماوە بۆتان جێبەجیٚ بکات، ئەوانیش دەڵێن: چی ماوە تا پێمان بدات، ئایا ڕووی سپی نەکردووین و لەناو بەهەشتدا داینەناوین و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری نەکردووین! دەڵێن: بەڵیٚ، جا خوای پەروەردگار پەردەی نێوانی خۆی و بەندەکانی هەڵ دەماڵیٚ و بەندەکان بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ئیتر هەرگیز شتی وا خۆش و خۆشەویست لەوەو پێش خەڵات نەکراوە پێیان، وەك ئەوە بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان بکەن).

## باسێکی تر لەو بارەوە

١٧ - بَابٌ مِنْهُ

٢٥٥٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي شَبَابَةُ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً لَمَنْ يَنْظُرُ إِلَى جِنَانِهِ وَأَزْوَاجِهِ وَنَعِيمِهِ وَخَدَمِهِ وَسُرُرِهِ مَسِيرَةَ أَلْفِ سَنَةٍ، وَأَكْرَمَهُمْ عَلَى اللهِ مَنْ يَنْظُرُ إِلَى وَجْهِهِ غَدْوَةً وَعَشِيَّةً، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ). وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، مَرْفُوعًا وَرَوَاهُ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبْجَرَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، مَوْقُوفًا وَرَوَى عُبَيْدُ اللهِ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَوْلَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ حَدَّثَنَا بِذَلِكَ أَبُو كُرَيْبٍ مُحَمَّدُ بْنُ العَلَاءِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ ثُوَيْرٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە (ثوير)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ بوو دەیفەرموو: (بەڕاستی نزمترین پلەی ئەهلی بەهەشت بۆ کەسێ سەیری باخ و باخاتەکانی و هاوسەرەکانی و نازو نیعمەتەکانی و خزمەتکارەکانی و لە منداڵان و ڕاخەرەکانی ماوەی هەزار ساڵە، بەڕێزترینتان و ئەوەتان بەزرترین پایەی هەیە لای خوا ئەو کەسەیە بەیانیان و ئێواران تەماشای خوای گەورە دەکات)، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ سورة القيامة: ٢٢ - ٢٣. واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن، تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

٢٥٥٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَرِيفٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ نُوحٍ الحِمَّانِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتُضَامُونَ فِي رُؤْيَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، وَتُضَامُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَإِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ القَمَرَ لَيْلَةَ البَدْرِ لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَهَكَذَا رَوَى يَحْيَى بْنُ عِيسَى الرَّمْلِيُّ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَوَى عَبْدُ اللهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَحَدِيثُ ابْنِ إِدْرِيسَ، عَنِ الأَعْمَشِ، غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَحَدِيثُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَحُّ وَهَكَذَا رَوَاهُ سُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ مِثْلُ هَذَا الحَدِيثِ وَهُوَ حَدِيثٌ صَحِيحٌ أَيْضًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا گومانتان هەیە لەبینینی مانگی چواردە؟ وە ئایا گومانتان هەیە لەبینینی خۆر؟ وتیان: نەخێر، هیچ گومانمان نیە، فەرمووی: (دەی لە قیامەتدا ئاوا خوای خۆتان دەبینن و لە بینینیدا توشی هیچ زەحمەتێ نابن).

١٨ - بَابٌ

٢٥٥٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لأَهْلِ الجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: مَا لَنَا لاَ نَرْضَى

وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالُوا: أَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ أَبَدًا. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای بالادەست و خاوەن شکۆ بە ئەهلی بەهەشت دەفەرموێت: (ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەوانیش بەیەك دەنگ دەڵێن: بفەرموو ئەی پەروەردگارمان، ئێمە ملکەچ و گوێڕایەڵی تۆین هەمیشە ئێمە ئامادەین بۆ جێ بەجێکردنی فەرمانەکانت، سەرچاوەی گشت خێرو خۆشی و بەهرەیەك لە دەستی تۆدایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا رازین بە بەشی خۆتان لە بەهشتدا؟ دەڵێن: ئەی بۆ رازی نین، لەم بەشە باشە کە تۆ داوتە بە ئێمە بە هیچ دروستکراوێکی ترت نەداوە دەبێ لەمە باشتر هەبێ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: من لەوە باشترتان پێ دەدەم؟ دەڵێن: چ شتێ لەوە باشترە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: (شایستەی خۆشنودی و رەزامەندی خۆمتان دەکەم، لەمەولا هەرگیز لێتان زویر نابم و نارەحەتیم).

## دەربارەی بینینی ئەهلی بەهەشت لە ژوورەکانیاندا

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرَائِي أَهْلِ الجَنَّةِ فِي الغُرَفِ

٢٥٥٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ فِي الغُرْفَةِ كَمَا يَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الشَّرْقِيَّ أَوِ الْكَوْكَبَ الْغَرْبِيَّ الْغَارِبَ فِي الأُفُقِ أَوِ الطَّالِعَ فِي تَفَاضُلِ الدَّرَجَاتِ،

فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أُولَئِكَ النَّبِيُّونَ؟ قَالَ: بَلَى، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ وَأَقْوَامٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەهلی بەهەشت خەڵکی ژوورەکان دەبینن وەك چۆن ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسۆدا دەبینن لە ڕۆژهەڵات یان لە ڕۆژئاوادا بەپێی پلەو پایەیان). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوانە پێغەمبەرانن؟ فەرموویەتی: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە کەسانێکن باوەڕیان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی و بە پەیامبەران و بە ڕاستیان زانیون).

## مانەوەی خەڵکی بەهەشت و دۆزەخ بە هەمیشەیی لەناویاندا

### ٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خُلُودِ أَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ

٢٥٥٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ القِيَامَةِ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَطَّلِعُ عَلَيْهِمْ رَبُّ العَالَمِينَ، فَيَقُولُ: أَلاَ يَتْبَعُ كُلُّ إِنْسَانٍ مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، فَيُمَثَّلُ لِصَاحِبِ الصَّلِيبِ صَلِيبُهُ، وَلِصَاحِبِ التَّصَاوِيرِ تَصَاوِيرُهُ، وَلِصَاحِبِ النَّارِ نَارُهُ، فَيَتْبَعُونَ مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، وَيَبْقَى الْمُسْلِمُونَ فَيَطَّلِعُ عَلَيْهِمْ رَبُّ العَالَمِينَ، فَيَقُولُ: أَلاَ تَتَّبِعُونَ النَّاسَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، اللَّهُ رَبُّنَا، وَهَذَا مَكَانُنَا حَتَّى نَرَى رَبَّنَا وَهُوَ يَأْمُرُهُمْ وَيُثَبِّتُهُمْ، ثُمَّ يَتَوَارَى ثُمَّ يَطَّلِعُ فَيَقُولُ: أَلاَ تَتَّبِعُونَ النَّاسَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ اللَّهُ رَبُّنَا، وَهَذَا مَكَانُنَا حَتَّى نَرَى رَبَّنَا وَهُوَ يَأْمُرُهُمْ وَيُثَبِّتُهُمْ قَالُوا: وَهَلْ نَرَاهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ؟ قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَإِنَّكُمْ لاَ تُضَارُّونَ فِي

رُؤْيَتِهِ تِلْكَ السَّاعَةَ، ثُمَّ يَتَوَارَى ثُمَّ يَطَّلِعُ فَيُعَرِّفُهُمْ نَفْسَهُ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّبِعُونِي، فَيَقُومُ الْمُسْلِمُونَ وَيُوضَعُ الصِّرَاطُ، فَيَمُرُّونَ عَلَيْهِ مِثْلَ جِيَادِ الخَيْلِ وَالرِّكَابِ، وَقَوْلُهُمْ عَلَيْهِ سَلِّمْ سَلِّمْ، وَيَبْقَى أَهْلُ النَّارِ فَيُطْرَحُ مِنْهُمْ فِيهَا فَوْجٌ، ثُمَّ يُقَالُ: هَلْ امْتَلأْتِ؟ فَتَقُولُ: (هَلْ مِنْ مَزِيدٍ) ثُمَّ يُطْرَحُ فِيهَا فَوْجٌ، فَيُقَالُ: هَلْ امْتَلأْتِ؟ فَتَقُولُ: (هَلْ مِنْ مَزِيدٍ)، حَتَّى إِذَا أُوعِبُوا فِيهَا وَضَعَ الرَّحْمَنُ قَدَمَهُ فِيهَا وَأَزْوَى بَعْضَهَا إِلَى بَعْضٍ، ثُمَّ قَالَ: قَطْ، قَالَتْ: قَطْ قَطْ، فَإِذَا أَدْخَلَ اللَّهُ أَهْلَ الجَنَّةِ الجَنَّةَ وَأَهْلَ النَّارِ النَّارَ، قَالَ: أُتِيَ بِالمَوْتِ مُلَبَّبًا، فَيُوقَفُ عَلَى السُّورِ الَّذِي بَيْنَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَطَّلِعُونَ خَائِفِينَ، ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَطَّلِعُونَ مُسْتَبْشِرِينَ يَرْجُونَ الشَّفَاعَةَ، فَيُقَالُ لأَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ: قَدْ عَرَفْنَاهُ، هُوَ الْمَوْتُ الَّذِي وُكِّلَ بِنَا، فَيُضْجَعُ فَيُذْبَحُ ذَبْحًا عَلَى السُّورِ الَّذِي بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ خُلُودٌ لاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ لاَ مَوْتَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رِوَايَاتٌ كَثِيرَةٌ مِثْلُ هَذَا مَا يُذْكَرُ فِيهِ أَمْرُ الرُّؤْيَةِ أَنَّ النَّاسَ يَرَوْنَ رَبَّهُمْ وَذِكْرُ القَدَمِ وَمَا أَشْبَهَ هَذِهِ الأَشْيَاءَ. وَالمذْهَبُ فِي هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ الأَئِمَّةِ مِثْلِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَابْنِ عُيَيْنَةَ، وَوَكِيعٍ وَغَيْرِهِمْ أَنَّهُمْ رَوَوْا هَذِهِ الأَشْيَاءَ، ثُمَّ قَالُوا: تُرْوَى هَذِهِ الأَحَادِيثُ وَنُؤْمِنُ بِهَا، وَلاَ يُقَالُ: كَيْفَ؟ وَهَذَا الَّذِي اخْتَارَهُ أَهْلُ الحَدِيثِ أَنْ يَرْوُوا هَذِهِ الأَشْيَاءُ كَمَا جَاءَتْ وَيُؤْمَنُ بِهَا وَلاَ تُفَسَّرُ وَلاَ تُتَوَهَّمُ وَلاَ يُقَالُ: كَيْفَ، وَهَذَا أَمْرُ أَهْلِ العِلْمِ الَّذِي اخْتَارُوهُ وَذَهَبُوا إِلَيْهِ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ فِي الحَدِيثِ: فَيُعَرِّفُهُمْ نَفْسَهُ يَعْنِي يَتَجَلَّى لَهُمْ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە سەرجەم خەڵك لە دەشتاییەکی فراواندا کۆدەکاتەوە، لەپاشدا پەروەردگاری جیهانیان تەماشایان دەکات و دەفەرمووێت: ئاگاداربن با هەموو کەسێ شوێنی**

پەرستراوەکەی بکەوێت، ئیتر خاچ پەرست وێنەی خاچەکەی بۆ دەکێشرێت و خاوەن پەیکەر و وێنەکان وێنەی پەیکەرەکانیان بۆ دەکێشرێت، ئاگر پەرست وێنەی ئاگرەکەی بۆ دەکێشرێت، جا شوێنی پەرستراوەکانیان دەکەون، موسوڵمانان دەمێننەوە، پەروەردگاری جیهانیان تەماشایان دەکات و دەفەرمووێت: ئایا شوێن خەڵك ناکەون؟ دەڵێن: پەنا دەگرین بە تۆ، پەنا دەگرین بە تۆ، خوای گەورە پەروەردگارمانە، ئەمە شوێنمانە هەتا پەروەردگارمان دەبینین، ئەویش فەرمانیان پێ دەکات و جێگیریان دەکات، دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئایا دەیبینین؟ فەرمووی: (ئایا گومانتان هەیە لەبینینی مانگی چواردە؟) وتیان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هیچ گومانمان نیە، فەرمووی: (دەی لەو کات و ساتەدا ئاوا خوای خۆتان دەبینن و لە بینینیدا توشی هیچ زەحمەتێ نابن، لەپاشدا دیار نامێنێ، ئینجا دەردەکەوێتەوە، زانستێکی براوە دەخاتە دڵیانەوە بەدڵنیایەوە دەزانن ئەوە پەروەردگاریانە، پاشان دەفەرمووێت: من پەروەردگارتانم شوێنی فەرمانەکانم بکەونیتر موسوڵمانان هەڵەسن پردی سیرات دادەنرێ و دەپەڕنەوە بۆ بەهەشت وەك ئەسپ و وشتری خێرا، پەیامبەران و فروستادەکان وتەیان لەسەر پردەکە ئەمەیە دەڵێن: خوایە سەلامەتمان بکە، خوایە سەلامەتمان بکە، جا ئەهلی دۆزەخ دەمێننەوە و سەرەی ئەوانە کۆمەڵێکیان فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە، جا دەوترێت: ئایا پڕبووی؟ ئەویش دەڵێت: ئاخۆ زیاتریش هەیە؟ تا ئەو کاتەی هەموویان کۆدەبنەوە لە دۆزەخدا، خوای گەورە پێی تێ دەخات — شێوە و چۆنیەتیەکەی دەگێڕینەوە بۆ لای خوا — ئەوکاتە دۆزەخ لە هەیبەتی ئەوەدا دەچێتەوە یەك، دۆزەخ دەڵێ: خوایە بەسمە بەسمە، پڕ بووم و جێی کەسم نەماوە، کاتێك خوای گەورە بەهەشتیەکان دەخاتە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکانیش دەخاتە دۆزەخەوە، مردن دەهێنرێت لەسەر دیواری نێوان بەهەشت

و دۆزەخدا رادەوەستێنرێت، جا دەوترێت: ئەی ئەهلی بەهەشت ئەوانیش بە ترسەوە دەڕوانن، پاشان دەوترێت: ئەی ئەهلی دۆزەخ ئەوانیش بە دڵخۆشیەوە بە هیوای شەفاعەتەوە دەڕوانن بێنە دەرەوە لە دۆزەخ، جا بە هەردوو لایان دەوترێت: ئایا دەزانن ئەمە دەناسن، هەردوو لایان دەڵێن: بەڵێ دەیناسین ئەوە مردنە پێی سپێردراوین، جا رادەکێشرێت و لەسەر دیوارەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەردەبڕرێت، جا دەوترێت: ئەی بەهەشتیەکان ئیتر لە بەهەشتدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە و مردن نییە، ئەی دۆزەخیەکان ئیتر لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە و مردن نییە).

٢٥٥٨ - (صحيح دون قوله: فَلَوْ أَنَّ أَحَدًا) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ مَرْزُوقٍ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، يَرْفَعُهُ، قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ أُتِيَ بِالمَوْتِ كَالكَبْشِ الأَمْلَحِ، فَيُوقَفُ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُذْبَحُ وَهُمْ يَنْظُرُونَ، فَلَوْ أَنَّ أَحَدًا مَاتَ فَرَحًا لَمَاتَ أَهْلُ الجَنَّةِ، وَلَوْ أَنَّ أَحَدًا مَاتَ حُزْنًا لَمَاتَ أَهْلُ النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (لە قیامەتدا کاتێك خوای گەورە بەهەشتیەکان دەخاتە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکانیش دەخاتە دۆزەخەوە، مردن لەشێوەی بەرانێکی شاخداردا دەهێنرێت لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەوەستێنرێت، جا سەردەبڕرێت و ئەوانیش تەماشای دەکەن، ئەگەر کەس لەخۆشیاندا بمردایە ئەوا ئەهلی بەهەشت لەخۆشی و شادیدا دەمردن، هەروەها ئەگەر کەس لەخەم و پەژارەدا بمردایە ئەوا ئەهلی دۆزەخ لەخەم و پەژارەدا دەمردن).

## ٢١ - بَابُ مَا جَاءَ حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمكَارِهِ وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ

٢٥٥٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، وَثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

**واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەهەشت بە ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە و بە ڕەنج و تێکۆشان دەورەدراوە، ئاگری دۆزەخیش بە ئارەزووەکان دەورەدراوە).**

٢٥٦٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الجَنَّةَ وَالنَّارَ أَرْسَلَ جِبْرِيلَ إِلَى الجَنَّةِ فَقَالَ: انْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَجَاءَهَا وَنَظَرَ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعَدَّ اللَّهُ لأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَوَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالمكَارِهِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَانْظُرْ إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالمكَارِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خِفْتُ أَنْ لاَ يَدْخُلَهَا أَحَدٌ، قَالَ: اذْهَبْ إِلَى النَّارِ فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا، فَإِذَا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضًا، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا، فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە خوای پەروەردگار**

بەهەشت و دۆزەخی دروستکرد، جبریلی نارد بۆ بەهەشت، فەرمووی: برۆ سەیری بەهەشت بکە سەیری ئەوەش بکە بۆ بەندە چاکەکانم ئامادکردووە، جبریل دەڕوات سەیر دەکات، فەرمووی: دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و دەڵێ: بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ هەرکەس هەوڵ و تەقەلای بۆ بدات ئیللا دەچێتە ناویەوە، فەرمانی پێ دەکات بە ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە و بە رەنج و تێکۆشان دەورەدەدرێت، خوای گەورە بە جبریل دەفەرموێت: بگەڕێرەوە بۆ بەهەشت، سەیری بکە سەیری ئەوەش بکە بۆ بەندە چاکەکانم ئامادکردووە، جبریل دەڕوات سەیر دەکات بە ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە و بە رەنج و تێکۆشان دەورەدراوە، دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و دەڵێ: بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ دەترسم کەس نەچێتە ناویەوە، خوای گەورە بە جبریل دەفەرموێت: برۆ سەیری دۆزەخ بکە سەیری ئەوەش بکە بۆ ئەهلی دۆزەخم ئامادکردووە، جبریل دەڕوات سەیر دەکات هەندێکی کەوتوەتە سەر هەندێکی تری، دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و دەڵێ: بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ هەرکەس بیبیستێ و خۆی بپارێزێ ناچێتە ناویەوە، فەرمانی پێ دەکات بە ئارەزووەکان دەورەدەدرێت، دەفەرموێت: بگەڕێرەوە بۆ لای، دەڕوات سەیر دەکات بە ئارزووەکان دەورەدراوە، دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و دەڵێ: بە گەورەیی و شکۆمەندی تۆ دەترسم کەس رزگاری نەبێ لێی و نەچێتە ناویەوە).

## دەربارەی مشت و مڕی بەهەشت و دۆزەخ

## ٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي احْتِجَاجِ الجَنَّةِ وَالنَّارِ

٢٥٦١ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: احْتَجَّتِ الجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ الجَنَّةُ: يَدْخُلُنِي الضُّعَفَاءُ وَالمسَاكِينُ، وَقَالَتِ النَّارُ:

يَدْخُلُنِي الجَبَّارُونَ وَالمتَكَبِّرُونَ، فَقَالَ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي أَنْتَقِمُ بِكِ مِمَّنْ شِئْتُ، وَقَالَ لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ شِئْتُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەهەشت و دۆزەخ بوو بە مشت و مڕیان، بەهەشت وتی: بێ دەسەلات و لاواز و هەژارەکان دێنە ناوم، دۆزەخ وتی: منیش خۆ بەزلزان و مل هوڕە ستەمکارەکان دێنە ناوم، خوای گەورە بە ئاگری فەرموو: تۆ سزاو ئازار و ئەشکەنجەی منی تۆڵەت پێ دەکەمەوە بۆ هەرکەس بمەوێت، بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ ڕەحمەت و میهرەبانی منی بۆ هەرکەس بمەوێت بە چوونە ناو تۆ ڕەحمی پێ دەکەم).

## دەربارەی لای خواروی پلەی خەڵکی بەهەشت

## ٢٣ - بَابُ مَا جَاءَ مَا لأَدْنَى أَهْلِ الجَنَّةِ مِنَ الكَرَامَةِ

٢٥٦٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا رِشْدِينُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَدْنَى أَهْلِ الجَنَّةِ الَّذِي لَهُ ثَمَانُونَ أَلْفَ خَادِمٍ وَاثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ زَوْجَةً، وَتُنْصَبُ لَهُ قُبَّةٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَزَبَرْجَدٍ وَيَاقُوتٍ كَمَا بَيْنَ الجَابِيَةِ إِلَىٰ صَنْعَاءَ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ مِنْ صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ يُرَدُّونَ بَنِي ثَلاَثِينَ فِي الجَنَّةِ لاَ يَزِيدُونَ عَلَيْهَا أَبَدًا، وَكَذَلِكَ أَهْلُ النَّارِ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ عَلَيْهِمُ التِّيجَانَ، إِنَّ أَدْنَى لُؤْلُؤَةٍ مِنْهَا لَتُضِيءُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمغْرِبِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ رِشْدِينَ.

واتــە: لــە ئــەبو ســەعیدی خودریــەوە رەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (لای خـوارووی پلەی خەڵکی بەهەشت هەشتا نۆکەر و حەفتاو دوو هاوسەری هەیە، قوبەیـەکی بـۆ دادەنێن لە مرواری و شیلان و زەبەرجەد هێندەی ماوەی نێـوان جابیـە بـۆ سـەنعای وڵاتی یەمەن دەبێ).

بــە هــەمان ســەنەد لــە پێغەمبــەرەوە صــلی الله علیــە وســلم هــاتووە، کــە فەرموویەتی: (هەرکەس لە خەڵکی بەهەشت بمرێت ئـیتر تەمـەنی گـەورە بـێ یـان بچوك دەگەڕێنرێتەوە بۆ تەمەنی سی ساڵان هـەرگیز لـەو تەمەنـەش زیـاد ناکـات، هەروەها خەڵکی ئاگری دۆزەخیش بە هەمان شێوە).

هەروەها بە هەمان سەنەد لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیـە وسـلم هـاتووە، کـە فەرموویەتی: (خەڵکی بەهەشـت تاجیـان بەسـەرەوەیە بچـوکترین مـرواری تاجەکـە نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا رووناك دەکاتەوە).

٢٥٦٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا بُنْدَارٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ عَامِرٍ الأَحْوَلِ، عَنْ أَبِي الصِّدِّيقِ النَّاجِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُؤْمِنُ إِذَا اشْتَهَى الوَلَدَ فِي الجَنَّةِ كَانَ حَمْلُهُ وَوَضْعُهُ وَسِنُّهُ فِي سَاعَةٍ كَمَا يَشْتَهِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فِي الجَنَّةِ جِمَاعٌ وَلاَ يَكُونُ وَلَدٌ هَكَذَا رُوِيَ عَنْ طَاوُسٍ، وَمُجَاهِدٍ، وَإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ وقَالَ مُحَمَّدٌ، قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، فِي حَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا اشْتَهَى الْمُؤْمِنُ الوَلَدَ فِي الجَنَّةِ كَانَ فِي سَاعَةٍ وَاحِدَةٍ كَمَا يَشْتَهِي وَلَكِنْ لاَ يَشْتَهِي قَالَ مُحَمَّدٌ: وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي رَزِينٍ العُقَيْلِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ لاَ يَكُونُ لَهُمْ فِيهَا وَلَدٌ، وَأَبُو الصِّدِّيقِ النَّاجِيِّ اسْمُهُ: بَكْرُ بْنُ عَمْرٍو وَيُقَالُ: بَكْرُ بْنُ قَيْسٍ أَيْضًا.

فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، لأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللهِ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الزَّكَاةِ وَالصَّلاَةِ، وَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: فَوَاللهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ أَنَّ اللهَ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَقُّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَهَكَذَا رَوَى شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَرَوَى عِمْرَانُ القَطَّانُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَهُوَ حَدِيثٌ خَطَأٌ وَقَدْ خُولِفَ عِمْرَانُ فِي رِوَايَتِهِ عَنْ مَعْمَرٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دنیای بەجێ هێشت و لەدوای ئەو پێشەوا ئەبوبەکر خوای لێ رازی بێ بوو بە جێنشینی، کۆمەڵێ عەرەبی دەشتەکی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، پێشەوا ئەبوبەکر خوای لێ رازی بێ بڕیاریدا لەگەڵیان بجەنگێت، پێشەوا عومەری کوڕی (خَطّابِ) خوای لێ رازی بێ فەرمووی: چۆن دەجەنگی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا؟ لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی: (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا دەڵێن: (لا إله إلا الله)، جا هەرکەسێك بیڵێت ئەوە ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بەحەقی خۆی، لێپرسینەوەیان لەلای خوای گەورەیە؟!. جا ئەبوبەکر فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە دەجەنگم دژ بەوانەی نوێژو زەکات لەیەك جیادەکەنەوە، لە راستیدا زەکات حەق و مافی ماڵ و سامانە، سوێند بێت بە خوای گەورە ئەگەر ئەو حەبلەی کە وشتری پێ دەبەستنەوە پێم نەدەن کە لەوەو پێش دەیاندا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەوە

لەدژیان دەجەنگم لەسەر نەدانی، جا عومەر فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە هەرکە خوای گەورە دڵی ئەبوبەکری بۆ جەنگین ڕێنموونی کرد ئیتر منیش زانیم کە ئەبوبەکر ڕاستەو لەسەر حەقە.

٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
أُمِرْتُ بِقِتَالِهِمْ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ

٢٦٠٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَعْقُوبَ الطَّالِقَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنْ يَسْتَقْبِلُوا قِبْلَتَنَا وَيَأْكُلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَأَنْ يُصَلُّوا صَلاَتَنَا، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ حُرِّمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا، لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ. وَفِي البَابِ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَقَدْ رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، نَحْوَ هَذَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: (أشهد أن لا إله إلا الله، و أن محمدا رسول الله)، ڕودەکەنە قیبلەکەمان و، لە گۆشتی سەربڕاوەکانمان دەخۆن و، ئەو نوێژانە دەکەن کە فەرزن لەسەر موسوڵمانان بە ڕێکوپێکی، ئەگەر ئەوانە ئەوەیان کرد خوێن وماڵیان دەپارێزن بەحەقی ئیسلام نەبێت، ئەوەی بۆ موسوڵمانان هەیە بۆ ئەوانیش هەیە لە مافەکان و ئەرکەکان).

## دەربارەی ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە

### ٣ - بَابُ مَا جَاءَ بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ

٢٦٠٩ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ سُعَيْرِ بْنِ الخِمْسِ التَّمِيمِيِّ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ، شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ، وَحَجِّ البَيْتِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ هَذَا، وَسُعَيْرُ بْنُ الخِمْسِ ثِقَةٌ عِنْدَ أَهْلِ الحَدِيثِ.
حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ الجُمَحِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ الْمَخْزُومِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئیسلام لەسەر ئەم پێنجە بنیات نراوە: شایەتومان هێنان بەوەی جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، موحەممەد پێغەمبەری خوایەو، ئەنجامدانی پێنج نوێژەی فەرز و، زەکات دەرکردن و، ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان).

## جبریل چۆن وەسفی ئیسلام و ئیمانی کرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَصْفِ جِبْرِيلَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الإِيمَانَ وَالإِسْلاَمَ

٢٦١٠ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ الخُزَاعِيُّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ كَهْمَسِ بْنِ الحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ، قَالَ: أَوَّلُ مَنْ تَكَلَّمَ فِي القَدَرِ مَعْبَدٌ الجُهَنِيُّ، قَالَ: فَخَرَجْتُ أَنَا وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحِمْيَرِيُّ حَتَّى أَتَيْنَا الْمَدِينَةَ، فَقُلْنَا: لَوْ لَقِينَا رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْنَاهُ عَمَّا أَحْدَثَ هَؤُلاَءِ القَوْمُ، قَالَ: فَلَقِينَاهُ يَعْنِي عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، وَهُوَ خَارِجٌ مِنَ الْمَسْجِدِ قَالَ: فَاكْتَنَفْتُهُ أَنَا وَصَاحِبِي قَالَ: فَظَنَنْتُ أَنَّ صَاحِبِي سَيَكِلُ الكَلاَمَ إِلَيَّ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ قَوْمًا يَقْرَءُونَ القُرْآنَ وَيَتَقَفَّرُونَ العِلْمَ، وَيَزْعُمُونَ أَنْ لاَ قَدَرَ وَأَنَّ الأَمْرَ أُنُفٌ، قَالَ: فَإِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي مِنْهُمْ بَرِيءٌ وَأَنَّهُمْ مِنِّي بُرَآءُ، وَالَّذِي يَحْلِفُ بِهِ عَبْدُ اللهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا قُبِلَ ذَلِكَ مِنْهُ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، قَالَ: ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُ فَقَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَاءَ رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ حَتَّى أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَلْزَقَ رُكْبَتَهُ بِرُكْبَتِهِ ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ، وَالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، قَالَ: فَمَا الإِسْلاَمُ؟ قَالَ: شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَحَجُّ البَيْتِ وَصَوْمُ رَمَضَانَ. قَالَ: فَمَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ، فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ: فِي كُلِّ ذَلِكَ يَقُولُ لَهُ: صَدَقْتَ، قَالَ: فَتَعَجَّبْنَا مِنْهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ، قَالَ: فَمَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، قَالَ: فَمَا أَمَارَتُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الحُفَاةَ العُرَاةَ العَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ قَالَ عُمَرُ:

فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ بِثَلاَثٍ، فَقَالَ: يَا عُمَرُ هَلْ تَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟ ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ أَمْرَ دِينِكُمْ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا كَهْمَسُ بْنُ الحَسَنِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ، عَنْ كَهْمَسٍ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. وَفِي البَابِ عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ نَحْوُ هَذَا عَنْ عُمَرَ. وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّحِيحُ هُوَ ابْنُ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە یەحیای کوڕی یەعمەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: یەکەم کەسێ کە ئینکاری قەدەری کردو دەربارەی قەدەر دوا مەعبەدی جوهەنی بوو، لە بەصرە، فەرمووی: من و حومەیدی کوڕی (عبد الرحمن)ی حیمیەری دەرچوین بۆ مەدینە، وتمان خۆزگە توشی یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبووین دەربارەی قەدەریەکان — مەعبەد و هاوڕێکانی - پرسیارمان لێ دەکرد کەچی دەڵێن، خوای گەورە سەرکەوتوی کردین و بۆی ڕێکخستین لەوکاتەدا (عبد الله)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ئەیویست بچێتە ناو مزگەوتەوە، من و هاوڕێکەم ئەملاو لامان لێگرت، یەکێکمان لای راستەوەو ئەوی تریشمان لای چەپەوە، وام زانی هاوڕێکەم قسەکردن بەمن دەسپێرێت، بۆیە وتم: ئەی باوکی (عبد الرحمن) لەلای ئێمە کۆمەڵێك سەریان هەڵداوە قورئان دەخوێنن و عەودالّی خوێندنن و هەولّی کۆکردنەوەی زانست ئەدەن، کەچی ئینکاری قەدەر دەکەن و دەڵێن: قەدەر نیەو، کاروبار هەتا ڕونەدات کەس نایزانێ و کاتێ خوا بە کردەوەکان دەزانێ کە ڕوودەدات، (عبد الله)ی کوڕی عومەر وتی: ئەگەر گەیشتی بەوانە پێیان رابگەیەنە کە من لەوانە بەریم، ئەوانیش

لە من بەرین، بەو (الله)یە کە (عبد الله)ی کوڕی عومەر سوێندی پێ دەخوات، ئەگەر هەر یەکێ لەوانە بەقەد کێوی ئوحود زێڕ و تەڵای هەبێت و ببەخشێ لەڕێی خوای گەورەدا خوا لێی وەرناگرێت، هەتا باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت، لەپاشدا وتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ بۆی باس کردم وتی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبوین، کاتێ زانیمان پیاوێك دەرکەوت پۆشاکی سپی بلورین بوو، موو رەشی تۆخ بوو، ماندوێتی رێگای پێوە نەدەبینرا، کەس لە ئێمە نەیدەناسی، هاتەپێشەوە هەتا لەبەرامبەر پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشت و هەردوو ئەژنۆی نا بە هەردو ئەژنۆیەوەو، هەردوو دەستی نایە سەر هەردوو رانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و وتی: ئەی موحەممەد ئیسلام چیە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئیسلام ئەوەیە کە شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، نوێژ بکەیت و، زەکات بدەیت و، رۆژووی مانگی رەمەزان بگریت و، ئەگەر توانای مادی و مەعنەویت هەبوو حەجی ماڵی خوا بکەیت). وتی: راست دەکەیت، ئێمە لامان سەیر بوو کە پرسیاری لێ دەکردو دەیوت راست دەکەیت، وتی: ئەی ئیمان چیە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئیمان ئەوەیە کە باوەڕ بهێنی بە خوای گەورەو بە مەلائیکەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و بە رۆژی قیامەت و بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕیەوە). وتی: راست دەکەیت، وتی: ئەی (ئیحسان)چاکە چیە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەیە بەشێوەیە خوای گەورە بپەرستی وەك ئەوەی لەبەرچاوتەو دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینێت). وتی: راست دەکەیت، وتی: چ کاتێ ئەم جیهانە کۆتایی دێت و قیامەت بەرپادەبێ؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پرسیارلێکراو

زاناتر نیە پێی لەپرسیارکەر). وتی: ڕاست دەکەیت، وتی: ئەی نیشانەکانی چین؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەیە کە منداڵ بە چاوی نۆکەر و کارەکەر تەماشای دایك و باوکی خۆیان بکەن، یان ئافرەتی کۆیلە وەك گەورەکەی خۆی لێ بێت، پێ پەتی و ڕەش و ڕوت و ڕەجاڵ و شوان و گاوان ببن بە خاوەن موڵك و کۆشك و تەلاری لێ ڕابکێشن و فیز و دەعیەی پێوە بکەن). پێشەوا عومەر وتی: لەپاشدا کابرا دەرچوو، منیش ماوەیە مات و بێدەنگ بووم، ئینجا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەی عومەر، دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو؟). وتم: نەخێر، خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (ئەوە جبریل بوو هاتە ناوتان کاروباری دینەکەتان فێربکات).

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەرائز دەدرێتە پاڵ ئیمان

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِضَافَةِ الفَرَائِضِ إِلَى الإِيمَانِ

٢٦١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ الْمُهَلَّبِيُّ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ القَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: إِنَّا هَذَا الحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ وَلَسْنَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي أَشْهُرِ الحَرَامِ، فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذُهُ عَنْكَ وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا، فَقَالَ: آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، الْإِيمَانِ بِاللَّهِ، ثُمَّ فَسَّرَهَا لَهُمْ، شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو جَمْرَةَ الضُّبَعِيُّ اسْمُهُ: نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، أَيْضًا وَزَادَ فِيهِ أَتَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ؟ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي

رَسُولُ اللهِ وَذَكَرَ الحَدِيثَ سَمِعْتُ قُتَيْبَةَ بْنَ سَعِيدٍ، يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ مِثْلَ هَؤُلاَءِ الفُقَهَاءِ الأَشْرَافِ الأَرْبَعَةِ: مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَاللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ، وَعَبَّادِ بْنِ عَبَّادٍ الْمُهَلَّبِيِّ، وَعَبْدِ الوَهَّابِ الثَّقَفِيِّ.
قَالَ قُتَيْبَةُ: كُنَّا نَرْضَى أَنْ نَرْجِعَ مِنْ عِنْدِ عَبَّادٍ كُلَّ يَوْمٍ بِحَدِيثَيْنِ وَعَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ هُوَ مِنْ وَلَدِ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: نوێنەری (عَبْد الْقَيْس) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم تیرەیە لەهۆزی ڕەبیعەن، لەنێوان ئێمەو تۆدا كافرەكانی (مُضَر) هەن بۆیە بە ئاسانی ناتوانین بگەینە خزمەتت مەگەر لە مانگەكانی حەرام دا ئەو چوار مانگەی كە جەنگ تیایاندا حەرامەو كافرەكان جەنگمان لەگەڵ ناكەن، لەبەرئەوە شتێكمان فێربكە دەستی پێوە بگرین و خزمان و خەڵكی دەوروبەرمانی بۆ بانگ بكەین، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فەرمانتان پێ دەكەم بە چوار شت، وە چوار شتیشتان لێ قەدەغەدەكەم: (باوەڕ بە خوای گەورەو شایەتیدان بەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله). واتە: باوەڕ و ئیسلام یەك شتن نەیوت: دوو بەشن بەڵكو یەك بەشن، موسەددەد راوی فەرمودەكە وتی: (باوەڕ بە خوای گەورە) لەپاشدا راڤەی كرد بۆیان و فەرمووی: شایەتومان: كە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە لەلایەن خواوە رەوانەكراوە، نوێژكردن و، زەكات دەركردن و، پێنج یەك لە دەستكەوتی جەنگی دەربكەن).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کامڵ بوونی ئیمان و زیاد و کەمکردنی

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِكْمَالِ الإِيمَانِ وَزِيَادَتِهِ وَنُقْصَانِهِ

٢٦١٢ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ أَكْمَلِ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَأَلْطَفُهُمْ بِأَهْلِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَلاَ نَعْرِفُ لأَبِي قِلاَبَةَ سَمَاعًا مِنْ عَائِشَةَ. وَقَدْ رَوَى أَبُو قِلاَبَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ، رَضِيعِ لِعَائِشَةَ عَنْ عَائِشَةَ، غَيْرَ هَذَا الحَدِيثِ وَأَبُو قِلاَبَةَ اسْمُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدٍ الجَرْمِيُّ. حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: ذَكَرَ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ، أَبَا قِلاَبَةَ فَقَالَ: كَانَ وَاللهِ مِنَ الفُقَهَاءِ ذَوِي الأَلْبَابِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (تەواترینی ئیمان هی ئەو کەسەتانە کە ئاکار و ڕەوشتی جوانە و نەرمونیان تر و چاکترینە بۆ خانەوادەکەی).

٢٦١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللهِ هُرَيْمُ بْنُ مِسْعَرٍ الأَزْدِيُّ التِّرْمِذِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ النَّاسَ فَوَعَظَهُمْ ثُمَّ قَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنَّكُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ فَقَالَتْ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لِكَثْرَةِ لَعْنِكُنَّ، يَعْنِي وَكُفْرِكُنَّ العَشِيرَ. قَالَ: وَمَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَغْلَبَ لِذَوِي الأَلْبَابِ، وَذَوِي الرَّأْيِ مِنْكُنَّ، قَالَتْ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِهَا وَعَقْلِهَا، قَالَ: شَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ مِنْكُنَّ بِشَهَادَةِ رَجُلٍ، وَنُقْصَانُ دِينِكُنَّ، الحَيْضَةُ، تَمْكُثُ إِحْدَاكُنَّ الثَّلاَثَ وَالأَرْبَعَ لاَ تُصَلِّي. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری خوێندەوە بۆ خەڵك و ئامۆژگاری کردن، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر بکەن و ببەخشن لە پێناوی خوادا چونکە زۆرترینی خەڵکانی ئاگرن)، یەکێ لە ئافرەتەکان وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (لەبەرئەوەی زۆر نەفرین دەکەن و ناشکوری بەرامبەر بە هاوسەرەکانتان دەردەبڕن، من کەسانێکم نەدیوە وەك ئێوە ئەقڵ و هۆش و دینی نوقسان و ناتەواو بێ لەگەڵ ئەوەشدا زاڵ بێ بەسەر کەسی ئاقڵ و هۆشمەنددا). یەکێ لە ئافرەتەکان وتی: ئەقڵ و هۆش و دینی نوقسانی و ناتەواوی چیە؟ فەرمووی: (شایەتی دوو ئافرەت بەرامبەر بە شایەتی یەك پیاوە ئەمە نوقسانی ئەقڵ و هۆشی، یەکێ لەوان دەکەوێتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە سێ شەو سێ رۆژ یان چوار شەو چوا رۆژ نوێژ ناکات و رۆژوو ناگرێت لە مانگی رەمەزاندا ئەمەش نوقسانی دینەکەی).

٢٦١٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ بَابًا، فَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَأَرْفَعُهَا قَوْلُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَهَكَذَا رَوَى سُهَيْلُ بْنُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَرَوَى عُمَارَةُ بْنُ غَزِيَّةَ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الإِيمَانُ أَرْبَعَةٌ وَسِتُّونَ بَابًا، حَدَّثَنَا بِذَلِكَ قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیمانهێنان حەفتاو ئەوەندە لقە: خوارترینی لادانی زیان و ئازارێکە لەسەر رێگا، چڵەپۆپەی وتەی: (لاَ إِلَـهَ إِلا اللّه)یە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی شەرم و شکۆ لە باوەڕەوەیە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ

٢٦١٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، وَأَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ، قَالاَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِرَجُلٍ وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الحَيَاءِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ قَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، فِي حَدِيثِهِ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ رَجُلاً يَعِظُ أَخَاهُ فِي الحَيَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای پیاوێکدا لەبارەی شەرم و شکۆوە ئامۆژگاری برایەکی موسوڵمانی دەکرد، پێی فەرموو: (شەرم و شکۆ لە باوەڕەوەیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێزی نوێژ

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي حُرْمَةِ الصَّلاَةِ

٢٦١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُعَاذٍ الصَّنْعَانِيُّ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ أَبِي النَّجُودِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنِ النَّارِ، قَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، تَعْبُدُ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ البَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الخَيْرِ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ قَالَ: ثُمَّ تَلاَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ)، حَتَّى بَلَغَ (يَعْمَلُونَ) ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ، وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ،

قَالَ: رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الجِهَادُ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا نَبِيَّ اللهِ، فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ قَالَ: كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم، جارێ لە نزیکیەوە ڕێمان دەکرد و دەڕۆیشتین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کاروکردەوەیەکم پێ بڵێ ئەگەر کردم پێی بچمە بەهەشتەوە و لە ئاگری دۆزەخیش دوورم بخاتەوە، فەرمووی: (دەربارەی کارێکی زۆر گەورەو شکۆمەند پرسیارت لێ کردم، هەرچەندە ئاسانە بۆ کەسێ کە خوای گەورە خۆی بۆی ئاسان بکات: خوا بپەرستە و هاوبەشی بۆ دامەنێ، پێنج نوێژەی فەرزەکە ئەنجام بدە، زەکاتی ماڵ و سامانەکەت دەربکە، مانگی ڕەمەزان بەرۆژووبە، حەجی ماڵی خوا بکە ئەگەر توانای مادی و مەعنەویت هەبوو). لەپاشدا فەرمووی: (ئایا بەشەکانی خێرت پێ پیشان بدەم؟ ڕۆژوو قەڵغانە دەتپارێزێ لە تاوان، خێر و سەدەقەش گوناهو تاوان دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، هەروەها نوێژی کەسێ لە نیوەی شەودا). فەرمووی: لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: **(تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (١٦) فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)** سورة السجدة: ١٦ – ١٧. واتە: تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوار و نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داوون دەبەخشن، ئینجا هیچ کەس نازانێ چی

شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشتدا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن، ئەم پاداشتە دەدرێنەوە بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردویانە.

لەپاشدا فەرمووی: (بنەمای هەموو کارێکی باش و کۆڵەکەو چڵەپۆپەیت پێ بڵێم)، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! فەرمووی: (بنەمای هەموو کارێکی باش ئیسلامە، کۆڵەکەکەی نوێژە، چڵەپۆپەی جیهاد و تێکۆشانە لەرێی خوا، لەپاشدا فەرمووی: (شیرازەی هەموو ئەمانەشت پێ بڵێم)، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! سەری زمانی خۆی گرت و فەرمووی: (زمانی خۆت بگرە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەین موحاسەبە دەکرێین و سزا دەدرێن و تۆڵەمان لێ دەسەنرێت؟ فەرمووی: (ئەی (معاذ) دایکت رۆڵە رۆت بۆ بکات ئەی چی ئەو خەڵکە لە ئاگری دۆزەخدا لەسەر روخساریان دەگەوزێنێ جگە لەدروێنەی داسی زمانیان).

٢٦١٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ أَبِي السَّمْحِ، عَنْ أَبِي الْهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَتَعَاهَدُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالإِيمَانِ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ) الآيَةَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ حَسَنٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان دی مزگەوتی دروستکردوو خزمەتی مزگەوتی کرد شایەتی بۆ بدەن کە ئیماندارە، چونکە بێگومان خوای گەورە دەفەرمووێت: (**إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ**). سورة التوبة: ١٨.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی تەرکی نوێژ

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الصَّلاَةِ

٢٦١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَ الكُفْرِ وَالإِيمَانِ تَرْكُ الصَّلاَةِ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێوانی کوفر و ئیمان وازهێنانە لە نوێژکردن).

٢٦١٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَسْبَاطُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ، وَقَالَ: بَيْنَ العَبْدِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ أَوِ الكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو سُفْيَانَ اسْمُهُ: طَلْحَةُ بْنُ نَافِعٍ.

واتە: لە ئەعمەشەوە بە هەمان سەنەد فەرموودەی پێشوو هاتووە، وە فەرمووی: (نێوانی بەندە و نێوانی هاوبەش بۆ خوا دانان و کوفر وازهێنانە لە نوێژکردن).

٢٦٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بَيْنَ العَبْدِ وَبَيْنَ الكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو الزُّبَيْرِ اسْمُهُ: مُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ تَدْرُسَ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلیٰ الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نێوانی بەندە و نێوانی کوفر وازهێنانە لە نوێژکردن).

٢٦٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، وَيُوسُفُ بْنُ عِيسَى، قَالاَ: حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ (ح) وحَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ، وَمَحْمُودُ بْنُ

غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ أَبِيهِ (ح) وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ الحَسَنِ الشَّقِيقِيُّ، وَمَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحَسَنِ بْنِ شَقِيقٍ، عَنِ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

واتـە: لـە (عبـد الله)ی کـوڕی بورەیـدەوە، لـە باوکیـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (بەڵێن و پەیمانی نێوانی ئێمەو ئەوان واتـە بـێ بڕوایـان نوێژکردنـە، ئـەوەی تـەرکی بکات ئەوە بێ باوەڕە).

٢٦٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ العُقَيْلِيِّ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَرَوْنَ شَيْئًا مِنَ الأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلاَةِ. سَمِعْتُ أَبَا مُصْعَبٍ الْمَدَنِيَّ، يَقُولُ: مَنْ قَالَ: الْإِيمَانُ قَوْلٌ يُسْتَتَابُ، فَإِنْ تَابَ وَإِلاَّ ضُرِبَتْ عُنُقُهُ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی شەقیقی عوقەیلی دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خـوا صلی الله علیه وسلم وازهێنانیان لە هیچ کارێ بە کوفر دانەناوە جگە لە نوێـژ. بـۆ خۆم گوێم لە ئەبو موصعەبی مەدەنی بوو دەیفەرموو: هەرکەس وتی: ئیمـان بـەس وتەیە دەبێ تەوبە بکات، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئـەوە باشـە، ئەگـەرنا دەدرێـت لـە گەردنی.

١٠ - بَابٌ

٢٦٢٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ الهَادِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ،

أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە عەباسەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بۆ خۆی لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (شیرینی ئیمانی چەشتووە ئەو کەسەی ڕازی بێ بەوەی خوای گەورە پەروەردگاری بێ و ئیسلام دینی بێ و موحەممەد صلی الله علیه وسلم پێغەمبەری بێ).

٢٦٢٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ طَعْمَ الإِيمَانِ، مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تێدا بێ شیرینی ئیمان دەچێژێ، خواو پێغەمبەری لەهەموو شتێ زیاتر بەلاوە خۆشەویست بێت، هەرکەسێکی خۆش بوێت لەبەر خوا خۆشی بوێت، لەدوای ئەوەی کە خوای گەورە هیدایەتی داوە بۆ سەر دینی ئیسلام، پێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێبازی کوفر و بێ باوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێی بدەنە ناو ئاگرەوە).

## دەربارەی زیناکەر کاتێ کە زینا دەکات باوەڕی نیە

## ١١ - بَابُ مَا جَاءَ لاَ يَزْنِي الزَّانِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ

٢٦٢٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَكِنَّ التَّوْبَةَ مَعْرُوضَةٌ.

وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى. حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا زَنَى الْعَبْدُ خَرَجَ مِنْهُ الْإِيمَانُ فَكَانَ فَوْقَ رَأْسِهِ كَالظُّلَّةِ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ ذَلِكَ الْعَمَلِ عَادَ إِلَيْهِ الْإِيمَانُ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، أَنَّهُ قَالَ فِي هَذَا: خَرَجَ مِنَ الْإِيمَانِ إِلَى الْإِسْلاَمِ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ فِي الزِّنَا وَالسَّرِقَةِ: مَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَأُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ فَهُوَ كَفَّارَةُ ذَنْبِهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَ اللهُ عَلَيْهِ فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ. رَوَى ذَلِكَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، وَخُزَيْمَةُ بْنُ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زیناکار کاتی زیناکردن ئیمانی نیە، دز کاتی دزیکردن ئیمانی نیە، شەرابخۆر کاتی شەرابخواردنەوە ئیمانی نیە، دەرگای تەوبە کراوەیە بۆی ئەگەر تەوبەی کرد خوای گەورە لێی قبوڵ دەکات).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە بەندەیە زینا دەکات

ئیمانی لێ دەردەچێت، وەك سێبەرێ بە راسەریەوە رادەوەستێ، کاتێ کە لەو کارە دەرچوو ئیمانەکەی بۆ دەگەڕێتەوە).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی زیناکردن و دزیکردن فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەو کارە بکات داری حەدی لێ دەدرێت، ئەوەش کەفارەتی تاوانەکەیەتی، ئەگەر خوای گەورە بۆی پۆشی و ئاشکرا نەبوو، لەرۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار ئەگەر ویستی سزاو ئەشکەنجەی دەدات، یان ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت).

٢٦٢٦ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ أَبِي السَّفَرِ وَاسْمُهُ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الهَمْدَانِيُّ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيِّ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ أَصَابَ حَدًّا فَعُجِّلَ عُقُوبَتَهُ فِي الدُّنْيَا فَاللَّهُ أَعْدَلُ مِنْ أَنْ يُثَنِّيَ عَلَى عَبْدِهِ العُقُوبَةَ فِي الآخِرَةِ، وَمَنْ أَصَابَ حَدًّا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَفَا عَنْهُ فَاللَّهُ أَكْرَمُ مِنْ أَنْ يَعُودَ فِي شَيْءٍ قَدْ عَفَا عَنْهُ. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَهَذَا قَوْلُ أَهْلِ العِلْمِ لاَ نَعْلَمُ أَحَدًا كَفَّرَ أَحَدًا بِالزِّنَا أَوِ السَّرِقَةِ وَشُرْبِ الخَمْرِ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ تاوانێکی گەورەی کردوو لەدونیا لەسەری سزا بدرێت خوای گەورە لەوە دادگەرترە لە قیامەتدا سزای بدات، وە هەرکەسێ تاوانێکی گەورەی کردوو لەدونیا خوای گەورە بۆی پۆشی و لێی خۆش بوو، خوای گەورە لەوە بەرێزترە لە شتێ خۆش بێ و پەشیمان بێتەوە).

## موسوڵمان ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان لەدەست و زمانی پارێزراوبن

١٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الْمُسْلِمَ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ

٢٦٢٧ - **(حسن صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنِ القَعْقَاعِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالمؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَيُرْوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سُئِلَ أَيُّ الْمُسْلِمِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ جَابِرٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (موسوڵمان ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان سەلامەت و پارێزراوبن لەدەست و لەزمانی، باوەڕداریش ئەو کەسەیە خەڵك بە ئەمین و سەرڕاستی بزانن لەسەر خوێن و ماڵیان).**

٢٦٢٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا بِذَلِكَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الجَوْهَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ أَيُّ الْمُسْلِمِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

**واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی کێ چاکترین موسوڵمانە؟ فەرمووی: (ئەو کەسەیە موسوڵمانان سەلامەت بن لەدەست و لەزمانی).**

## ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێ کرد جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە

### ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الإِسْلاَمَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا

٢٦٢٩ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الإِسْلاَمَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَجَابِرٍ، وَأَنَسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَأَبُو الأَحْوَصِ اسْمُهُ: عَوْفُ بْنُ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ الجُشَمِيُّ. تَفَرَّدَ بِهِ حَفْصٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئیسلام بە غەریبی و نامۆیی دەستی پێ کرد و جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە، خۆشبەختی بۆ نامۆکان).

٢٦٣٠ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفِ بْنِ زَيْدِ بْنِ مِلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الدِّينَ لَيَأْرِزُ إِلَى الحِجَازِ كَمَا تَأْرِزُ الحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا، وَلَيَعْقِلَنَّ الدِّينُ مِنَ الحِجَازِ مَعْقِلَ الأُرْوِيَّةِ مِنْ رَأْسِ الجَبَلِ، إِنَّ الدِّينَ بَدَأَ غَرِيبًا وَيَرْجِعُ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ الَّذِينَ يُصْلِحُونَ مَا أَفْسَدَ النَّاسُ مِنْ بَعْدِي مِنْ سُنَّتِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دین دەگەڕێتەوە بۆ خاکی حیجاز واتە مەککەو مەدینەو دەوروبەری وەك چۆن مار دەگەڕێتەوە بۆ کونەکەی خۆی، دین پتەو دامەزراو دەبێت وەك سەنگەری سەر کێو یان وەك بزنە کێوی چۆن لە کێو نایەتەخوارەوە، دین بە غەریبی و نامۆیی دەستی پێ کرد و

جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە، خۆشبەختی بۆ نامۆکان ئەوانەی کە چاکسازی ئەوە دەکەن کە خەڵك تێکیان داوە لە سوننەتی من لەدوای من).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشانەکانی دووڕوو

### ١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي عَلاَمَةِ الْمُنَافِقِ

٢٦٣١ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنِ العَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ، إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ العَلاَءِ وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَنَسٍ، وَجَابِرٍ. حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو سُهَيْلٍ هُوَ: عَمُّ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَاسْمُهُ: نَافِعُ بْنُ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ الأَصْبَحِيُّ الخَوْلاَنِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نیشانەکانی کەسی دووڕوو سیانن: کە قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنیدا بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکات و بێ وەعد بێ، ئەگەر سپاردەیەکی درایە دەست ناپاکی لێ بکات).

٢٦٣٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا وَإِنْ كَانَتْ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ فِيهِ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا، مَنْ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ

أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُرَّةَ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ نِفَاقُ العَمَلِ، وَإِنَّمَا كَانَ نِفَاقُ التَّكْذِيبِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَكَذَا رُوِيَ عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ، شَيْءٌ مِنْ هَذَا أَنَّهُ قَالَ: النِّفَاقُ نِفَاقَانِ: نِفَاقُ العَمَلِ، وَنِفَاقُ التَّكْذِيبِ.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس ئەم چوار سیفەتەی تێدا بێ ئەوە کەسێکی دووڕووی تەواوە، ئەگەر یەکێکیانی تێدا بێ ئەوە خاوەنی بەشێ لەدووڕوویی تێدا هەتا وازی لێ دەهێنێ: کاتێ کە قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنیدا بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکات و بێ وەعد بێ، ئەگەر تووشی کێشەیە بوو دەمەقاڵە بکات لەهەق لابدات، ئەگەر پەیمانیدا پەیمانەکەی بشکێنێ).

٢٦٣٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ عَلِيّ بْنِ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنْ أَبِي النُّعْمَانِ، عَنْ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا وَعَدَ الرَّجُلُ وَيَنْوِي أَنْ يَفِيَ بِهِ فَلَمْ يَفِ بِهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَلَيْسَ إِسْنَادُهُ بِالقَوِيِّ، عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى ثِقَةٌ، وَلاَ يُعْرَفُ أَبُو النُّعْمَانِ وَلاَ أَبُو وَقَّاصٍ وَهُمَا مَجْهُولاَنِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ بەڵێنێکیدا نیازی هەبێ بیباتەسەر و جێبەجێی بکات بۆی نەگونجا بیباتەسەر بەهانەیەکی شەرعی هەبوو ئەوە گوناهی ناگات).

## دەربارەی جنێودان بە باوەڕدار لەڕێ دەرچوونە

### ١٥ - بَابُ مَا جَاءَ سِبَابُ الْمُؤْمِنِ فُسُوقٌ

٢٦٣٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ بَزِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الحَكِيمِ بْنُ مَنْصُورٍ الوَاسِطِيُّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قِتَالُ الْمُسْلِمِ أَخَاهُ كُفْرٌ، وَسِبَابُهُ فُسُوقٌ. وَفِي البَابِ عَنْ سَعْدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ. حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ.

**واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (موسوڵمان بەرامەر بە برا موسوڵمانەکەی بجەنگێ بێ باوەڕییە، جنێوپێدانیشی لەڕێ دەرچوونە).**

٢٦٣٥ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَمَعْنَى هَذَا الْحَدِيثِ: قِتَالُهُ كُفْرٌ لَيْسَ بِهِ كُفْرًا مِثْلَ الارْتِدَادِ عَنِ الإِسْلَامِ، وَالْحُجَّةُ فِي ذَلِكَ مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قُتِلَ مُتَعَمَّدًا فَأَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ بِالْخِيَارِ إِنْ شَاءُوا قَتَلُوا وَإِنْ شَاءُوا عَفَوْا، وَلَوْ كَانَ الْقَتْلُ كُفْرًا لَوَجَبَ الْقَتْلُ وَلَمْ يَصِحَّ الْعَفْوُ، وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَطَاوُسٍ، وَعَطَاءٍ، وَغَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ قَالُوا: كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ، وَفُسُوقٌ دُونَ فُسُوقٍ[1].

---

[1] وقع هنا في بعض النسخ زيادة: - قال بشار: لم أجد لها أصلاً في النسخ والشروح التي بين أيدينا، ولاذكرها المزي في "التحفة"، فحذفناها. - وهذا الكلام لايوجد في النسخة الخطية للكروخي (ق / ١٧٣ / ب).

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جنێودان بە موسوڵمان لەڕێ دەرچوونە، جەنگ لەگەڵ کردنیشی بێ باوەڕییە).

## دەربارەی کەسێ برا موسوڵمانەکەی تەکفیر بکات

## ١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ رَمَى أَخَاهُ بِكُفْرٍ

٢٦٣٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، عَنْ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ عَلَى العَبْدِ نَذْرٌ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَلاَعِنُ الْمُؤْمِنِ كَقَاتِلِهِ، وَمَنْ قَذَفَ مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَاتِلِهِ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عَذَّبَهُ اللَّهُ بِمَا قَتَلَ بِهِ نَفْسَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (ثابت)ی کوڕی (ضحاك)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ (نذر)ی شتێ بکات و نەیبێ ئەوە (نذر)ەکەی دانامەزرێت - وەك ئەوەی بڵێ ئەگەر چاك بوومەوە لەم نەخۆشیەم بەندەی فلانە کەس ئازاد بێت - ، نەفرەت کردن لەباوەڕدار وەك کوشتنیەتی، هەرکەسێ بەشتێ خۆی بکوژێت لەرۆژی قیامەتدا خوا بەو شتە سزای دەداتەوە).

٢٦٣٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لأَخِيهِ كَافِرٌ فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَمَعْنَى قَوْلِهِ بَاءَ: يَعْنِي أَقَرَّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بە براکەی بڵێ: ئەی کافر ئەوە یەکێکیان دەگرێتەوە، ئەگەر براکەی کافر بوو ئەوە هیچی لەسەر نیە، خۆ ئەگەر کافر نەبوو ئەوا خۆی پێی کافر دەبێ).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێ بمرێ و شایەتومان بهێنێ

## ١٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَمُوتُ وَهُوَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ

٢٦٣٨ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، عَنِ الصُّنَابِحِيِّ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: مَهْلاً، لِمَ تَبْكِي؟ فَوَاللَّهِ لَئِنِ اسْتُشْهِدْتُ لأَشْهَدَنَّ لَكَ، وَلَئِنْ شُفِّعْتُ لأَشْفَعَنَّ لَكَ، وَلَئِنِ اسْتَطَعْتُ لأَنْفَعَنَّكَ، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ مَا مِنْ حَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَكُمْ فِيهِ خَيْرٌ إِلاَّ حَدَّثْتُكُمُوهُ إِلاَّ حَدِيثًا وَاحِدًا، وَسَوْفَ أُحَدِّثُكُمُوهُ الْيَوْمَ وَقَدْ أُحِيطَ بِنَفْسِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، وَعَلِيٍّ، وَطَلْحَةَ، وَجَابِرٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ. سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي عُمَرَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عُيَيْنَةَ، يَقُولُ: مُحَمَّدُ بْنُ عَجْلاَنَ كَانَ ثِقَةً مَأْمُونًا فِي الحَدِيثِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَالصُّنَابِحِيُّ هُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عُسَيْلَةَ أَبُو عَبْدِ اللهِ وَقَدْ رُوِيَ عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الجَنَّةَ، فَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ هَذَا فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ قَبْلَ نُزُولِ الفَرَائِضِ وَالأَمْرِ وَالنَّهْيِ. وَوَجْهُ هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ أَهْلَ التَّوْحِيدِ سَيَدْخُلُونَ الجَنَّةَ، وَإِنْ عُذِّبُوا بِالنَّارِ بِذُنُوبِهِمْ فَإِنَّهُمْ لاَ يُخَلَّدُونَ فِي النَّارِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَعِمْرَانَ بْنِ

حُصَيْنٍ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: سَيَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ مِنْ أَهْلِ التَّوْحِيدِ وَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ هَكَذَا رُوِيَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ، وَغَيْرِ وَاحِدٍ مِنَ التَّابِعِينَ. ناقصفِي تَفْسِيرِ هَذِهِ الآيَةِ (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ) قَالُوا: إِذَا أُخْرِجَ أَهْلُ التَّوْحِيدِ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُوا الْجَنَّةَ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ.

واتە: سونابیحی دەڵێ عوبادەی کوڕی صامیت ڕەزای خوای لێ بێ لەسەرەمەرگدا بوو چووم بۆ سەردانی دەستم کردە گریان، فەرمووی: هێواش بە مۆڵەتم بدە، بۆچی دەگریت؟ سوێند بە (الله) ئەگەر لە قیامەتدا داوای شایەتیم لێ بکرێ، شایەتیت بۆ دەدەم، ئەگەر خوای گەورە تکا و شەفاعەتم قبوڵ بکات تکات بۆ دەکەم، ئەوەندەی لەتوانامدا بێ سودت پێ بگەیەنم دریغی ناکەم، لەپاشدا فەرمووی: سوێند بە (الله)، هەر فەرموودەکم بیستبێ لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم خێری ئێوەی تێدا بێ گێڕاومەتەوە بۆتان جگە لە یەك فەرموودە نەبێ، ئەمڕۆ ئەویشتان بۆ دەگێڕمەوە، چونکە مردن لێم نزیك بۆتەوە، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بوو دەیفەرموو: (ئەوەی شایەتومان بهێنێ و بڵێ: جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم ئەوە خوای گەورە ئاگری لەسەر حەرام دەکات واتە نایخاتە ناو ئاگرەوە).

لەو بارەوە پرسیار کرا لە پێشەوا زوهری فەرمووی: ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەوە بووە، لەپێش دابەزینی فەرزەکان و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەوە بووە.

ئەبو عیسا (ترمذی) دەڵێ: لەڕووی فەرموودەکەوە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە: بێگومان خەڵکانی یەکتاپەرست دەچنە بەهەشتەوە، هەرچەندە سزاش بدرێن

بە ئاگری دۆزەخ لەبەر تاوانەکانیان، بە هەتا هەتایی نامێننەوە لە ئاگردا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خەڵکانێکی یەکتاپەرست لە ئاگری دۆزەخ دێنەدەرەوە و دەچنە بەهەشتەوە).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە: (**رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ**). فەرموویەتی: (کاتێ خەڵکانێکی یەکتاپەرست لە ئاگری دۆزەخ دێنەدەرەوە و دەچنە بەهەشتەوە، کافرەکان ئاوات دەخوازن کە موسوڵمان بوونایە).

٢٦٣٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، عَنْ لَيْثِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَامِرُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَعَافِرِيِّ ثُمَّ الْحُبُلِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الخَلاَئِقِ يَوْمَ القِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ البَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ؟ فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، فَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ اليَوْمَ، فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: احْضُرْ وَزْنَكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ مَا هَذِهِ البِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ، فَقَالَ: إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ، قَالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كَفَّةٍ وَالبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ البِطَاقَةُ، فَلاَ يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللهِ شَيْءٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ يَحْيَى، بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَالْبِطَاقَةُ: الْقِطْعَةُ.

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا پیاوێك لە

مُوسَى، يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: هُوَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ وَالعُمَرِيُّ هُوَ عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ مِنْ وَلَدِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ.

واتە: ریوایەتێ لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە: (نزیکە خەڵك سواری وشترەکانیان بن و سەفەر بکەن بۆ وڵاتان و دەوروبەر بۆ فێربوونی زانست وەك چۆن بە وشتر دەڕۆن بۆ غەزا بەو شێوەیە بە خێرایی سەفەر بکەن، بەڵام زانایەکیان دەستنەکەوێ زانستی شەرعی لێ وەرگرن زاناتر بێ لە زانای شاری مەدینە). - ئەمە لەسەردەمی هاوەڵاندا بووە ئەگینا دواتر زانایان لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان بڵاوبوونەوە بە وڵاتان و دەوروبەردا -. پرسیاریان کرد لە عویەینە دەربارەی زانای شاری مەدینە، فەرمووی: پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەسە.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی زانا بەسەر خواپەرستدا

### ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الفِقْهِ عَلَى العِبَادَةِ

٢٦٨١ - (موضوع) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ جَنَاحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَقِيهٌ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطَانِ مِنْ أَلْفِ عَابِدٍ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَلاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ مِنْ حَدِيثِ الوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بوونی زانایە قورستر و توندترە لەسەر شەیتان لە هەزار خواپەرست، چونکە کەسی زانا فەرمان دەکات بە خەڵك چاکە بکەن و بەرپەرچی فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان دەداتەوە).

٢٦٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ خِدَاشٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الوَاسِطِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، عَنْ قَيْسِ بْنِ كَثِيرٍ، قَالَ: قَدِمَ رَجُلٌ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَهُوَ بِدِمَشْقَ فَقَالَ: مَا أَقْدَمَكَ يَا أَخِي؟ فَقَالَ: حَدِيثٌ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: أَمَا جِئْتَ لِحَاجَةٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: أَمَا قَدِمْتَ لِتِجَارَةٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: مَا جِئْتُ إِلاَّ فِي طَلَبِ هَذَا الحَدِيثِ؟ قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَبْتَغِي فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ، وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضَاءً لِطَالِبِ العِلْمِ، وَإِنَّ العَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ حَتَّى الحِيتَانُ فِي الْمَاءِ، وَفَضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ، كَفَضْلِ القَمَرِ عَلَى سَائِرِ الكَوَاكِبِ، إِنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا العِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ. وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَاصِمِ بْنِ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، وَلَيْسَ هُوَ عِنْدِي بِمُتَّصِلٍ هَكَذَا حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ خِدَاشٍ بِهَذَا الإِسْنَادِ. وَإِنَّمَا يُرْوَى هَذَا الحَدِيثُ عَنْ عَاصِمِ بْنِ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ جَمِيلٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مَحْمُودِ بْنِ خِدَاشٍ، وَرَأْيُ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ هَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە قەیسی كوڕی (كَثِير)ەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پیاوێ لە مەدینەوە هات بۆ دیمەشق بۆلای ئەبو (درداء) رەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: براكەم بۆچی هاتویت؟ وتی: بۆ فەرمودەیەك هاتوم كە پێم گەیشتوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم گێڕاوتەتەوە، فەرمووی: بۆ ئیش و كار و پێویستی خۆت نەهاتویت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی بۆ بازرگانی نەهاتویت؟ وتی: نەخێر، بەس بۆ ئەو فەرموودەیە هاتووم، ئەبو (درداء) رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو:

(هەر كەسێك رێگایەك بگرێتەبەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ئەوا خوای گەورە رێگەیە لە رێگاكانی بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، مەلائیكەكان باڵیان رادەخەن بۆ ئەو كەسەی دەگەڕێت بە دوای زانستی شەرعیدا لەبەر ئەوەی رازین بەوەی بۆی دەگەڕێن، هەموو ئەوانەی كە لە ئاسمانەكان و زەویدان داوای لێ خۆشبوون دەكەن بۆ شەرع زانەكان تەنانەت ماسیش لە دەریادا، گەورەیی و چاكێتی شەرع زان بە سەر بەندەی خوا پەرستدا وەك چاكێتی و جوانی مانگ وایە بە سەر هەموو ئەستێرەكانەوە، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و درهەمیان بە میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵكو تەنها زانستی شەرعیان بەجێ هێشتووە، جا هەركەسێ بەدەستی خات ئەوا بەشێكی زۆری بەدەست خستووە).

٢٦٨٣ - **(ضعيف)** حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنِ ابْنِ أَشْوَعَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ سَلَمَةَ الجُعْفِيِّ، قَالَ: قَالَ يَزِيدُ بْنُ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ سَمِعْتُ مِنْكَ حَدِيثًا كَثِيرًا أَخَافُ أَنْ يُنْسِيَنِي أَوَّلَهُ آخِرُهُ، فَحَدِّثْنِي بِكَلِمَةٍ تَكُونُ جِمَاعًا قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ فِيمَا تَعْلَمُ. هَذَا حَدِيثٌ لَيْسَ إِسْنَادُهُ بِمُتَّصِلٍ، وَهُوَ عِنْدِي مُرْسَلٌ، وَلَمْ يُدْرِكْ عِنْدِي ابْنُ أَشْوَعَ يَزِيدَ بْنَ سَلَمَةَ وَابْنُ أَشْوَعَ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ أَشْوَعَ.

واتە: لە یەزیدی كوڕی سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، من فەرمودەی زۆرم لەتۆ بیستووە ئەترسم سەرەتای كۆتاییەكەیم لەبیر بەرێ بۆیە شتێكم پێ بڵێ كورت و پڕ مانا بێ، فەرمووی: (لە خوا بترسە لەو شتەدا كە دەیزانی واتە ئەوەی رێگری لێ كراوە لێی دووركەویتەوە، ئەوەشی فەرمانی پێكراوە بە پێی توانا پێی هەستی).

٢٦٨٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ أَيُّوبَ العَامِرِيُّ، عَنْ عَوْفٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

خَصْلَتَانِ لاَ تَجْتَمِعَانِ فِي مُنَافِقٍ، حُسْنُ سَمْتٍ، وَلاَ فِقْهٌ فِي الدِّينِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَلاَ نَعْرِفُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ حَدِيثِ عَوْفٍ، إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ هَذَا الشَّيْخِ خَلَفِ بْنِ أَيُّوبَ العَامِرِيِّ، وَلَمْ أَرَ أَحَدًا يَرْوِي عَنْهُ غَيْرَ مُحَمَّدِ بْنِ العَلاَءِ، وَلاَ أَدْرِي كَيْفَ هُوَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەم دوو شتە لە دووڕوودا کۆنابنەوە: رەوشت بەرزی و ئاکاری جوان و حاڵی بوون لەدین).

٢٦٨٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ رَجَاءٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ جَمِيلٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ، قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا عَابِدٌ وَالآخَرُ عَالِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرَضِينَ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخَيْرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ سَمِعْتُ أَبَا عَمَّارٍ الحُسَيْنَ بْنَ حُرَيْثٍ الخُزَاعِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ الفُضَيْلَ بْنَ عِيَاضٍ، يَقُولُ: عَالِمٌ عَامِلٌ مُعَلِّمٌ يُدْعَى كَبِيرًا فِي مَلَكُوتِ السَّمَوَاتِ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باسی دوو کەس کرا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یەکێرکیان شەرعزان و ئەوی تریان بەندەی خواپەرست، فەرمووی: (فەزڵی شەرعزان بەسەر بەندەی خواپەرستدا وەك وەك فەزڵی من وایە بەسەر هەر یەکێ لەئێوەدا). لەپاشدا فەرمووی (خواو مەلائیکەکانی و خەڵکانی ئاسمانەکان و زەوی بە جنۆکە و ئادەمیزاد و ئاژەڵەکانەوە تەنانەت مێروولەش لە کونەکەیدا و ماسیش لە دەریادا داوای لێ خۆشبوون دەکەن بۆ ئەوانەی خەڵك فێری خێر و چاکە دەکەن).

٢٦٨٦ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ الشَّيْبَانِيُّ البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ دَرَّاجٍ، عَنْ أَبِي الهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَنْ يَشْبَعَ الْمُؤْمِنُ مِنْ خَيْرٍ يَسْمَعُهُ حَتَّى يَكُونَ مُنْتَهَاهُ الجَنَّةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كەسی باوەڕدار لە زانستی شەرعی تێر ناخوات هەتا دەچێتە بەهەشتەوە).

٢٦٨٧ - (**ضعيف جدا**) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُمَرَ بْنِ الوَلِيدِ الكِنْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الفَضْلِ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الكَلِمَةُ الحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ، فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ الْفَضْلِ الْمَخْزُومِيُّ يُضَعَّفُ فِي الحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (حیكمەت و حاڵی بوون لەدین ونبووی باوەڕدارە، لەهەركوێ دۆزیەوە ئەو شایەنترە پێ ).

# باسی ئادابەکان لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم

## ٤٠ - أَبْوَابُ الاِسْتِئْذَانِ وَالآدَابِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

### ئەوەی هاتووە دەربارەی بڵاوکردنەوەی سڵاو

١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي إِفْشَاءِ السَّلاَمِ

٢٦٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا أَنْتُمْ فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، وَشُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَالبَرَاءِ، وَأَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوێند بە (الله) کە نەفسی منی بە دەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ نیشان بدەم ئەگەر جێبەجێتان کرد یەکترتان خۆش بوێت؟ سڵاو لەناو خۆتاندا بڵاو بکەنەوە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فەزڵی سڵاوکردن

٢ - بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ السَّلاَمِ

٢٦٨٩ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَالحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْجَرِيرِيُّ الْبَلْخِيُّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ الضُّبَعِيِّ، عَنْ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَشْرٌ ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عِشْرُونَ. ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثُونَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأَبِي سَعِيدٍ، وَسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم، وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەڵامی دایەوەو، دانیشت، فەرمووی: (دە چاکەی بۆ نوسرا)، یەکێکی تر هات و وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) وەڵامی دایەوەو، دانیشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیست چاکەی بۆ نوسرا)، یەکێکی تر هات و وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، وەڵامی دایەوەو، دانیشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سی چاکەی بۆ نوسرا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە

٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاسْتِئْذَانِ ثَلَاثَةً

٢٦٩٠ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: اسْتَأْذَنَ أَبُو مُوسَى عَلَى عُمَرَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ؟ قَالَ عُمَرُ: وَاحِدَةٌ، ثُمَّ سَكَتَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ؟ قَالَ عُمَرُ: ثِنْتَانِ، ثُمَّ سَكَتَ سَاعَةً فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ؟ فَقَالَ عُمَرُ: ثَلَاثٌ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ عُمَرُ لِلْبَوَّابِ: مَا صَنَعَ؟ قَالَ: رَجَعَ، قَالَ: عَلَيَّ بِهِ، فَلَمَّا جَاءَهُ، قَالَ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتَ؟ قَالَ: السُّنَّةُ، قَالَ: آلسُّنَّةُ؟ وَاللَّهِ لَتَأْتِيَنِّي عَلَى هَذَا بِبُرْهَانٍ أَوْ بِبَيِّنَةٍ أَوْ لَأَفْعَلَنَّ بِكَ، قَالَ: فَأَتَانَا وَنَحْنُ رُفْقَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَلَسْتُمْ أَعْلَمَ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الِاسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ، وَإِلَّا فَارْجِعْ فَجَعَلَ القَوْمُ يُمَازِحُونَهُ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي إِلَيْهِ فَقُلْتُ: فَمَا أَصَابَكَ فِي هَذَا مِنَ العُقُوبَةِ فَأَنَا شَرِيكُكَ. قَالَ: فَأَتَى عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ عُمَرُ: مَا كُنْتُ عَلِمْتُ بِهَذَا. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَأُمِّ طَارِقٍ مَوْلَاةِ سَعْدٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالجُرَيْرِيُّ اسْمُهُ: سَعِيدُ بْنُ إِيَاسٍ يُكْنَى أَبَا مَسْعُودٍ، وَقَدْ رَوَى هَذَا غَيْرُهُ أَيْضًا عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، وَأَبُو نَضْرَةَ العَبْدِيُّ اسْمُهُ: الْمُنْذِرُ بْنُ مَالِكِ بْنِ قُطْعَةَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەبو موسا ڕەزای خوای لێ بێ داوای مۆڵەتی کرد چوونەژوورەوەی کرد لە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، بێمەژوورەوە؟ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوە یەك، لەپاشدا ماوەیەك وەستا فەرمووی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، بێمەژوورەوە؟ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوە دوو، ئینجا ماوەیەکی تر وەستا فەرمووی: (السَّلَامُ

عَلَيْكُمْ)، بێمەژوورەوە؟ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: ئەوە سێ، لەپاشدا گەڕایەوە، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بە دەرگاوانەکەی فەرموو: چی کرد؟ وتی: گەڕایەوە، بۆم بێنن، کاتێ هات، فەرمووی: ئەوە بۆچی لەدوای سێ جارەکە گەڕایتەوە؟ ئەبو موسا فەرمووی: سوننەتە، ئەویش فەرمووی: سوننەتە، سوێند بە (الله) یان ئەوەتا بەڵگە و شایەت دێنی لەسەر ئەمە یان ئەوەتا سزات دەدەم، ئێمە کۆمەڵێ لە ئەنصار بووین ئەبو موسا هات بۆلامان فەرمووی: ئەی کۆمەڵە ئەنصار ئایا ئێوە زاناتر نین بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ مەگەر نەیفەرموو: (مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر مۆڵەتیان پێدای بچۆژوورەوە ئەگینا بگەڕێرەوە)، خەڵکەکە پێکەنین و گاڵتەیان پێ دەکرد، ئەبو سەعید فەرمووی: سەرم بەرزکردەوە بۆی و وتم: هەرچی سزایەکی دای لەسەر ئەوە من شەریك و هاوەڵی تۆم، فەرمووی: چوون بۆ خزمەت پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند، ئەویش فەرمووی: من ئەمەم نەزانیوە.

٢٦٩١ - (ضعيف الإسناد منكر المتن) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ يُونُسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو زُمَيْلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثًا فَأَذِنَ لِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَأَبُو زُمَيْلٍ اسْمُهُ: سِمَاكٌ الحَنَفِيُّ. وَإِنَّمَا أَنْكَرَ عُمَرُ عِنْدَنَا عَلَى أَبِي مُوسَى حَيْثُ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: الِاسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِذَا أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ. وَقَدْ كَانَ عُمَرُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثًا فَأَذِنَ لَهُ وَلَمْ يَكُنْ عَلِمَ هَذَا الَّذِي رَوَاهُ أَبُو مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی:

سێ جار داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەم کرد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، مۆڵەتی پێدام. بێگومان کاتێ ئەبو موسا ئەم فەرموودەی گێڕایەوە: (مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر مۆڵەتیان پێدای بچۆژوورەوە ئەگینا بگەڕێرەوە). پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ ئینکاری کرد. بێگومان پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ سێ جار داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم، ئەویش مۆڵەتی پێدا، بەلام ئەوەی نەزانی کە ئەبو موسا گێڕایەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر مۆڵەتیان پێدای بچۆژوورەوە ئەگینا بگەڕێرەوە).

## دەربارەی چۆنیەتی وەلامدانەوە سلاو

### ٤ - بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ رَدُّ السَّلاَمِ

٢٦٩٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ نُمَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَصَلَّى ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَذَكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَرَوَى يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، هَذَا عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، فَقَالَ: عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ: فَسَلَّمَ عَلَيْهِ وَقَالَ: وَعَلَيْكَ وَحَدِيثُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ هاتە مزگەوت نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە لایەکی مزگەوتەکەوە دانیشتبوو، لەپاشدا هات سلاوی کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەتۆش). بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد). جا راوی فەرموودەکەی بەدرێژی گێڕایەوە..

## ئەوەی هاتووە دەربارەی گەیاندنی سڵاو

٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَبْلِيغِ السَّلاَمِ

٢٦٩٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُنْذِرِ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ، حَدَّثَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا: إِنَّ جِبْرِيلَ يُقْرِئُكِ السَّلاَمَ، قَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي نُمَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، أَيْضًا، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (جبریل سڵاوی لێ دەکردی)، ئەویش فەرمووی: (وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ).

## دەربارەی فەزڵی ئەو کەسەی لەپێشدا سڵاو دەکات

٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ

٢٦٩٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا قُرَّانُ بْنُ تَمَّامٍ الأَسَدِيُّ، عَنْ أَبِي فَرْوَةَ يَزِيدَ بْنِ سِنَانٍ، عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ الرَّجُلاَنِ يَلْتَقِيَانِ أَيُّهُمَا يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ؟ فَقَالَ: أَوْلاَهُمَا بِاللَّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. قَالَ مُحَمَّدٌ: أَبُو فَرْوَةَ الرَّهَاوِيُّ مُقَارِبُ الحَدِيثِ إِلاَّ أَنَّ ابْنَهُ مُحَمَّدَ بْنَ يَزِيدَ يَرْوِي عَنْهُ مَنَاكِيرَ.

واتە: لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دوو کەس بە یەك گەیشتن کامیان لەپێشدا سڵاو بکات؟ فەرمووی: (کامیان لە ڕەحمەتی خواوە نزیك بوو، یان کامیان شایەنتر بوو بەچاودێری خوای گەورە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردن بەدەست باش نیە

٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ إِشَارَةِ اليَدِ بِالسَّلاَمِ

٢٦٩٥ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِغَيْرِنَا، لاَ تَشَبَّهُوا بِاليَهُودِ وَلاَ بِالنَّصَارَى، فَإِنَّ تَسْلِيمَ اليَهُودِ الإِشَارَةُ بِالأَصَابِعِ، وَتَسْلِيمَ النَّصَارَى الإِشَارَةُ بِالأَكُفِّ. هَذَا حَدِيثٌ إِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ وَرَوَى ابْنُ الْمُبَارَكِ، هَذَا الحَدِيثَ عَنِ ابْنِ لَهِيعَةَ، فَلَمْ يَرْفَعْهُ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بە غەیری ئێمە خۆی بچوێنێ ئەوە شوێنکەوتەی سوننەت و ڕێبازی ئێمە نیە، خۆتان مەچوێنن بە جولەکەو گاورەکان، جولەکە بە پەنجە سڵاو دەکەن و گاورەکانیش بەدەست).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردن لە منداڵ

٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عَلَى الصِّبْيَانِ

٢٦٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو الخَطَّابِ زِيَادُ بْنُ يَحْيَى البَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَتَّابٍ سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَيَّارٍ، قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ ثَابِتٌ: كُنْتُ مَعَ أَنَسٍ، فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ أَنَسٌ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ ثَابِتٍ، وَرُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَنَسٍ.

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە سەییارەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لەگەڵ (ثابت)ی بونانی دەرۆشتم کاتێ بەلای منداڵاندا تێ دەپەڕی سڵاوی لێ دەکردن. (ثابت) وتی: لەگەڵ ئەنەس بووم رەزای خوای لێ بێ، بەلای منداڵاندا تێ دەپەڕی سڵاوی لێ دەکردن. ئەنەس رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووم بەلای منداڵاندا تێ دەپەڕی سڵاوی لێ دەکردن.

## سەبارەت بە سڵاوکردن لە ئافرەتان.

٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عَلَى النِّسَاءِ

٢٦٩٧ - (**صحيح: الا الإلواء باليد**) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الحَمِيدِ بْنُ بَهْرَامَ، أَنَّهُ سَمِعَ شَهْرَ بْنَ حَوْشَبٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَسْمَاءَ بِنْتَ يَزِيدَ، تُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا وَعُصْبَةٌ مِنَ النِّسَاءِ قُعُودٌ، فَأَلْوَى بِيَدِهِ بِالتَّسْلِيمِ وَأَشَارَ عَبْدُ الحَمِيدِ بِيَدِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لاَ بَأْسَ بِحَدِيثِ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ بَهْرَامَ عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ وقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: شَهْرٌ حَسَنُ الحَدِيثِ وَقَوَّى أَمْرَهُ وقَالَ: إِنَّمَا تَكَلَّمَ فِيهِ ابْنُ عَوْنٍ ثُمَّ رَوَى عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي زَيْنَبَ، عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، قَالَ: إِنَّ شَهْرًا نَزَكُوهُ قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ النَّضْرُ: نَزَكُوهُ أَيْ طَعَنُوا فِيهِ وَإِنَّمَا طَعَنُوا فِيهِ لأَنَّهُ وَلِيَ أَمْرَ السُّلْطَانِ.

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ لە مزگەوت لەگەڵ کۆمەڵێ ژندا دانیشتبووین پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلاماندا

تێ پەڕی بەدەستی سڵاوی لێ کردین.

## سەبارەت بە سڵاو کردنی کاتی چونەوە بۆماڵەوە

١٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ

٢٦٩٨ - (ضعيف) حَدَّثَنَا أَبُو حَاتِمٍ البَصْرِيُّ الأَنْصَارِيُّ مُسْلِمُ بْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا بُنَيَّ إِذَا دَخَلْتَ عَلَى أَهْلِكَ فَسَلِّمْ يَكُونُ بَرَكَةً عَلَيْكَ وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (کوڕی خۆم کاتێ کە چویتەوە بۆ ماڵەوە سڵاویان لێ بکە، ئەوە دەبێتە فەڕ و بەرەکەت بۆ خۆت و بۆ خانەوادەکەشت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاو کردن لەپێش قسەکردن

١١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّلاَمِ قَبْلَ الكَلاَمِ

٢٦٩٩ - (حسن) حَدَّثَنَا الفَضْلُ بْنُ الصَّبَّاحِ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ زَكَرِيَّا، عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَاذَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: السَّلاَمُ قَبْلَ الكَلاَمِ. وَبِهَذَا الإِسْنَادِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لاَ تَدْعُوا أَحَدًا إِلَى الطَّعَامِ حَتَّى يُسَلِّمَ. هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. سَمِعْتُ مُحَمَّدًا، يَقُولُ: عَنْبَسَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ ذَاهِبٌ وَمُحَمَّدُ بْنُ زَاذَانَ مُنْكَرُ الحَدِيثِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سڵاوکردن لەپێش قسەکردنەوەیە). هەروەها فەرموویەتی: (هەر کەسێ سڵاو نەکات خولکی مەکەن بۆ سەر سفرە و خوانتان).

**سەبارەت بە سڵاوکردن لە ئەهلی (ذمة).**

١٢ – بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عَلَى أَهْلِ الذِّمَّةِ

٢٧٠٠ – (**صحيح**) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ تَبْدَأُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى بِالسَّلاَمِ، وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئێوە لەپێشدا سڵاومەکەن لە جولەکەو گاورەکان، کاتێ لەڕێگایەکدا پێیان گەیشتن خۆتان لە چەقی ڕێگاکەوە بڕۆن و ڕێگەیان بۆ چۆڵ مەکەن ناچاریان بکەن بۆ ئەوەی لەتەنگەبەری ڕێگەکەوە بڕۆن).

٢٧٠١ – (**صحيح**) حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمَخْزُومِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: إِنَّ رَهْطًا مِنَ اليَهُودِ دَخَلُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عَلَيْكُمْ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: بَلْ عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: قَدْ

قُلْتُ عَلَيْكُمْ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي بَصْرَةَ الغِفَارِيِّ، وَابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسٍ، وَأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الجُهَنِيِّ. حَدِيثُ عَائِشَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واته: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کۆمەڵێ لە جولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتیان: مردن بۆ تۆ، فەرمووی: (مردن بۆ ئێوە). عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: مردن بۆ ئێوە و نەفرەتیشتان لێ بێ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی عائیشە خوای گەورە خۆی نەرمونیانە و نەرمونیانیشی پێخۆشە لە هەموو کاروبارێکدا). عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: گوێت لێ نەبوو چیان وت؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بێگومان منیش فەرمووم: مردن بۆ ئێوە).

## دەربارەی سڵاوکردن لە کۆمەڵێ موسوڵمان و غەیرە موسوڵمانی تێدا بێ

## ١٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّلَامِ عَلَى مَجْلِسٍ فِيهِ الْمُسْلِمُونَ وَغَيْرُهُمْ

٢٧٠٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَرَّ بِمَجْلِسٍ وَفِيهِ أَخْلَاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واته: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەلای کۆڕ و کۆمەڵێکدا تێپەڕی تێکەڵ بوو لە موسوڵمانان و جولەکە سڵاوی لێ کردن.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردنی سوار لە پیادە

### ١٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَسْلِيمِ الرَّاكِبِ عَلَى الْمَاشِي

٢٧٠٣ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالماشِي عَلَى القَاعِدِ، وَالقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ، وَزَادَ ابْنُ الْمُثَنَّى فِي حَدِيثِهِ، وَيُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الكَبِيرِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. وقَالَ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ، وَيُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ، وَعَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ: إِنَّ الحَسَنَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با سوار سڵاو بکات لە پیادە، پیادەش سڵاو بکات لەوەی دانیشتووە، کەم سڵاو بکات لە زۆر، بچوکیش سڵاو بکات لە گەورە).**

٢٧٠٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَىٰ الكَبِيرِ، وَالمارُّ عَلَى القَاعِدِ، وَالقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ. وَهَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با بچوک سڵاو بکات لە گەورە، ئەوەی کە تێ دەپەڕێ سڵاو بکات لەوەی دانیشتووە، کەمیش سڵاو بکات لە زۆر).**

٢٧٠٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو هَانِئٍ اسْمُهُ حُمَيْدُ بْنُ هَانِئٍ الخَوْلاَنِيُّ، عَنْ أَبِي عَلِيٍّ الجَنْبِيِّ، عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسَلِّمُ الفَارِسُ عَلَى الْمَاشِي، وَالمَاشِي عَلَى القَائِمِ، وَالقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو عَلِيٍّ الجَنْبِيُّ اسْمُهُ: عَمْرُو بْنُ مَالِكٍ.

واتە: لە (فضالة)ی کوڕی عوبەیدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با سوار سڵاو بکات لە پیادە، پیادەش سڵاو بکات لەوەی کە وەستاوە یان دانیشتووە، کەمیش سڵاو بکات لە زۆر).

## دەربارەی سڵاوکردن لەکاتی هەستان و دانیشتندا

١٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عِنْدَ القِيَامِ وَعِنْدَ القُعُودِ

٢٧٠٦ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى مَجْلِسٍ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يَجْلِسَ فَلْيَجْلِسْ، ثُمَّ إِذَا قَامَ فَلْيُسَلِّمْ فَلَيْسَتِ الأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الآخِرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الحَدِيثُ أَيْضًا عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان گەیشتە نێو کۆڕ و کۆمەڵێك با سڵاو بکات، کاتێ ویستی هەستێ و بڕوات با سڵاو بکات، چونکە سڵاوی یەکەم لەدووەم باشتر نیە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەت وەرگرتن ڕووبەڕووی ماڵ

١٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاسْتِئْذَانِ قُبَالَةَ البَيْتِ

٢٧٠٧ - (ضعيف) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كَشَفَ سِتْرًا فَأَدْخَلَ بَصَرَهُ فِي البَيْتِ قَبْلَ أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ فَرَأَى عَوْرَةَ أَهْلِهِ فَقَدْ أَتَى حَدًّا لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ، لَوْ أَنَّهُ حِينَ أَدْخَلَ بَصَرَهُ اسْتَقْبَلَهُ رَجُلٌ فَفَقَأَ عَيْنَيْهِ مَا عَيَّرْتُ عَلَيْهِ، وَإِنْ مَرَّ الرَّجُلُ عَلَى بَابٍ لاَ سِتْرَ لَهُ غَيْرِ مُغْلَقٍ فَنَظَرَ فَلاَ خَطِيئَةَ عَلَيْهِ، إِنَّمَا الخَطِيئَةُ عَلَى أَهْلِ البَيْتِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ لَهِيعَةَ.
وَأَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ.

**واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ پێش ئەوەی مۆڵەتی بدەن پەردەی ماڵێ لابدات و چاو بگێڕێ بەناو ماڵداو تەماشای عەورەتیان بکات ئەوە گوناهێکی گەورەی وای کردووە شایەنی حەددە، بەشێوەیە ئەگەر پیاوێ شتێ بکات بەناوچاویدا و چاوی دەربێنێ و کوێری بکات لێی ناگرم و بە تاوانباری دانانێم، ئەگەر کەسێ دای بە بەردەم دەرگایەکدا دەرگاکە دانەخرابوو پەردەشی نەبوو سەیری ناوماڵەکەی کرد ئەوە گوناهەکەی لەئەستۆی خاوەن ماڵەکەیە).**

## کەسێ بەبێ مۆڵەت سەیری ماڵێ بکات

### ١٧ - بَابُ مَنْ اطَّلَعَ فِي دَارِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ

٢٧٠٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَانَ فِي بَيْتِهِ فَاطَّلَعَ عَلَيْهِ رَجُلٌ فَأَهْوَى إِلَيْهِ بِمِشْقَصٍ فَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵەوە بوو، پیاوێ سەیری ناوماڵەکەی دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سەرە ڕمێکەوە بۆی هەستا بە ماتە مات بۆی چوو تا لەپڕ بیکات بە چاویدا، بەڵام پیاوەکە کشایە دواوە.

٢٧٠٩ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ، أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ جُحْرٍ فِي حُجْرَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِدْرَاةٌ يَحُكُّ بِهَا رَأْسَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الإِسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ البَصَرِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە درزی دەرگاکەی ماڵی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سەیری دەکرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شانەیەکی ئاسنی بەدەستەوە بوو، سەری خۆی پێ دادەهێنا، بە پیاوەکەی فەرموو: (ئەگەر دەمزانی تەماشای ناوەوە دەکەی ئەم شانەیەم دەکرد بە ناوچاوتا، لەڕاستیدا مۆڵەت وەرگرتن لەپێناوی تەماشاکردندا دانراوە).

## دەربارەی سلاوکردن لەپێش مۆڵەت وەرگرتن

### ١٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ قَبْلَ الاِسْتِئْذَانِ

٢٧١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ صَفْوَانَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ كَلَدَةَ بْنَ حَنْبَلٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ بَعَثَهُ بِلَبَنٍ وَلِبَأٍ وَضَغَابِيسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَعْلَى الوَادِي، قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ وَلَمْ أُسَلِّمْ وَلَمْ أَسْتَأْذِنْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ارْجِعْ فَقُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ؟ وَذَلِكَ بَعْدَ مَا أَسْلَمَ صَفْوَانُ.

قَالَ عَمْرٌو: وَأَخْبَرَنِي بِهَذَا الحَدِيثِ أُمَيَّةُ بْنُ صَفْوَانَ، عَنْ كَلَدَةَ بْنِ حَنْبَلٍ، وَلَمْ يَقُلْ سَمِعْتُهُ مِنْ كَلَدَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ جُرَيْجٍ وَرَوَاهُ أَبُو عَاصِمٍ، أَيْضًا عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، مِثْلَ هَذَا. وَضَغَابِيسُ: هُوَ حَشِيشٌ يُؤْكَلُ.

واتە: صەفوانی کوڕی ئومەیە دوای ئەوەی کە موسوڵمان بوو بە کەلدەی کوڕی حەنبەلدا هەندێ شیر و فرۆ و خەیاری بچوکی نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەسەر شیوەبەرزەکەی مەککەوە بوو، کەلدە وتی: چوومەژوورەوە بۆ لای نە سلاوم کرد نە مۆڵەتیشم وەرگرت، فەرمووی: (بگەڕێرەوە بلێ سلاوی خواتان لێ بێ، مۆڵەتم دەدەن بێمەژوورەوە؟).

٢٧١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ: أَنَا أَنَا كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر

صلی الله علیه وسلم قەرزێکی لەلای باوکم بوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ، دام لەدەرگا داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەم کرد، فەرمووی: (ئەوە کێ یە؟) وتم: منم، فەرمووی: (منم منم) وەك بڵێی پێی ناخۆش بێت - دەبێ بوترێت من فلان کەسم -.

## دەربارەی نەهی کردن لەوەی کەسێ بەبێ ئاگادارکردنەوە بەشەودا بێتەوە و بدات لەدەرگای ماڵەوەیان

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ طُرُوقِ الرَّجُلِ أَهْلَهُ لَيْلاً

٢٧١٢ - (صحيح) أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ نُبَيْحٍ العَنَزِيِّ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَاهُمْ أَنْ يَطْرُقُوا النِّسَاءَ لَيْلاً. وَفِي البَابِ عَنْ أَنَسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ جَابِرٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَهَاهُمْ أَنْ يَطْرُقُوا النِّسَاءَ لَيْلاً، قَالَ: فَطَرَقَ رَجُلاَنِ بَعْدَ نَهْيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی کەسێ بەبێ ئاگادارکردنەوە بەشەودا بێتەوە و بدات لەدەرگای ماڵەوەیان.

لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی کەسێ بەبێ ئاگادارکردنەوە بەشەودا بێتەوە و بدات لەدەرگای ماڵەوەیان. ئیبنو عەباس فەرمووی: لەدوای ئەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی لێ کرد، دوو پیاو

شەو هاتنەوە دایان لە دەرگای ماڵەوەیان، هەریەکەیان بینی کەسێ لەگەڵ ژنەکەیدایە.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردن

٢٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَتْرِيبِ الكِتَابِ

٢٧١٣ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، عَنْ حَمْزَةَ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا كَتَبَ أَحَدُكُمْ كِتَابًا فَلْيُتَرِّبْهُ فَإِنَّهُ أَنْجَحُ لِلْحَاجَةِ. هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، لاَ نَعْرِفُهُ عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَحَمْزَةُ هُوَ عِنْدِي: ابْنُ عَمْرٍو النَّصِيبِيُّ وَهُوَ ضَعِيفٌ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە جابیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە نامەیەکی نووسی خۆڵاوی بکات، چونکە ئەوە باشە بۆ جێبەجێکردنی پێویستی).

٢١ - بَابٌ

٢٧١٤ - (موضوع) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الحَارِثِ، عَنْ عَنْبَسَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَاذَانَ، عَنْ أُمِّ سَعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ يَدَيْهِ كَاتِبٌ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: ضَعِ القَلَمَ عَلَى أُذُنِكَ فَإِنَّهُ أَذْكَرُ لِلْمُمْلِي. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَهُوَ إِسْنَادٌ ضَعِيفٌ، وَعَنْبَسَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمُحَمَّدُ بْنُ زَاذَانَ يُضَعَّفَانِ فِي الحَدِيثِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نووسەرێ لەبەردەستیدا بوو، بۆ خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (قەڵەکە لەسەر گوێت دابنێ چونکە ئەوە باشە بۆ بیرکردنەوە و داڕشتنی نامەکە بەجوانی).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی فێربوونی زمانی سوریانی

٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ السُّرْيَانِيَّةِ

٢٧١٥ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَتَعَلَّمَ لَهُ كَلِمَاتٍ مِنْ كِتَابِ يَهُودَ قَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابٍ قَالَ: فَمَا مَرَّ بِي نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى تَعَلَّمْتُهُ لَهُ قَالَ: فَلَمَّا تَعَلَّمْتُهُ كَانَ إِذَا كَتَبَ إِلَى يَهُودَ كَتَبْتُ إِلَيْهِمْ، وَإِذَا كَتَبُوا إِلَيْهِ قَرَأْتُ لَهُ كِتَابَهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ هَذَا الوَجْهِ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رَوَاهُ الأَعْمَشُ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَتَعَلَّمَ السُّرْيَانِيَّةَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردم کە فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی جولەکە ببم، منیش فێری زمانی جولەکە بووم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەمین نیم لە جولەکەکان نامەم بۆ بنوسن بۆ جولەکەکان یان نامەی جولەکەکانم بەڕاستی بۆ بخوێننەوە دەترسم شتێکی بۆ زیادو کەم بکەن)، ماوەی نیو مانگ تێ نەپەڕی بە باشی فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی جولەکە بووم و بەدڵنیاییەوە لێی تێ دەگەیشتم، ئەگەر بیویستایە نامە بنێرێ بۆ جولەکەکان من بۆم دەنوسی، هەروەها ئەگەر نامەشی بۆ بهاتایە لەلایەن جولەکەکانەوە ئەوا من بۆم دەخوێندەوە.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردم کە فێری سوریانی ببم.

### دەربارەی نامە ناردن بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەران

### ٢٣ - بَابٌ فِي مُكَاتَبَةِ الْمُشْرِكِينَ

٢٧١٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ حَمَّادٍ الْبَصْرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ قَبْلَ مَوْتِهِ إِلَى كِسْرَى وَإِلَى قَيْصَرَ وَإِلَى النَّجَاشِيِّ وَإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ وَلَيْسَ بِالنَّجَاشِيِّ الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپێش وەفات کردنی نامەیٚ نارد بۆ کیسرا و قەیصەر و نەجاشی ئەوەیان نا کە موسوڵمان بوو کاتێ کە مرد نوێژی مردووی بە غائیبی لەسەر کرد، هەروەها نامەی نارد بۆ هەموو کاربەدەست و کردن بۆ لای خوا.

### دەربارەی چۆن نامەی دەنووسی بۆ خەڵکانی هاوبەش بۆ خوا دانەر

### ٢٤ - بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ يُكْتَبُ إِلَى أَهْلِ الشِّرْكِ

٢٧١٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، وَكَانُوا تُجَّارًا بِالشَّامِ فَأَتَوْهُ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُرِئَ، فَإِذَا فِيهِ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ السَّلَامُ عَلَى مَنْ اتَّبَعَ الْهُدَى أَمَّا بَعْدُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو سُفْيَانَ اسْمُهُ: صَخْرُ بْنُ حَرْبٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە هیرەقل پاشای ڕۆمەکان ناردی بەدوای ئەبو سوفیاندا لەگەڵ چەند پیاوێکی قورەیشیدا بوو کە بازرگان بوون لەشام، جا هێنایان بۆ لای، راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، وتی: لەپاشدا داوای نامەکەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم کرد بۆی خوێنرایەوە، نوسرابوو: ( (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە موحەممەدی بەندەی خواو پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بۆ هیرەقل گەورە و پاشای ڕۆم، سڵاو لەو کەسەی شوێن هیدایەت کەوتوە، لەدوایدا: ...).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆر کردنی نامەکان

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي خَتْمِ الكِتَابَ

٢٧١٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: لَمَّا أَرَادَ نَبِيُّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى العَجَمِ قِيلَ لَهُ: إِنَّ العَجَمَ لاَ يَقْبَلُونَ إِلاَّ كِتَابًا عَلَيْهِ خَاتَمٌ فَاصْطَنَعَ خَاتَمًا، قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي كَفِّهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ویستی نامە بنوسێ بۆ پاشاە دەسەڵاتدای عەجەمەکان، پێی وترا: عەجەمەکان نامەیە مۆر نەکرابێ وەری ناگرن و قبوڵی ناکەن، بۆیە ئەویش مۆرێکی دروست کرد بۆ خۆی، وتی: وەك ئەوەی ئێستا بەچاوی خۆم سەیری بریسکەی ئەو مۆرە بکەم کە لەدەستی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی سلاوکردن

٢٦ – بَابُ كَيْفَ السَّلاَمُ

٢٧١٩ – (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، قَالَ: حَدَّثَنَا ثَابِتٌ البُنَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ، قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَصَاحِبَانِ لِي قَدْ ذَهَبَتْ أَسْمَاعُنَا وَأَبْصَارُنَا مِنَ الجَهْدِ، فَجَعَلْنَا نَعْرِضُ أَنْفُسَنَا عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَيْسَ أَحَدٌ يَقْبَلُنَا، فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَتَى بِنَا أَهْلَهُ، فَإِذَا ثَلاَثَةُ أَعْنُزٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: احْتَلِبُوا هَذَا اللَّبَنَ بَيْنَنَا، فَكُنَّا نَحْتَلِبُهُ، فَيَشْرَبُ كُلُّ إِنْسَانٍ نَصِيبَهُ، وَنَرْفَعُ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَصِيبَهُ، فَيَجِيءُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اللَّيْلِ فَيُسَلِّمُ تَسْلِيمًا، لاَ يُوقِظُ النَّائِمَ وَيُسْمِعُ اليَقْظَانَ، ثُمَّ يَأْتِي الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي ثُمَّ يَأْتِي شَرَابَهُ فَيَشْرَبُهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من و دوو هاوڕێی ترم وەك بڵێ لە ماندویەتی و برسێتی و تینوێتیدا نە دەمانبینی و نە نە دەمانبیست چووین بۆ ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆمان نیشاندان، هیچ کەسێ لەوان میوانداریان نەکردین خۆشیان نەدار بوون، ڕۆشتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەگەڵ خۆی بردینیەوە بۆ ماڵەوە، سێ بزنی لێ بوو، فەرمووی: (هەرسێ بزنەکە بدۆشن و شیرەکەی دابەش بکەن لەنێوانماندا)، ئیتر هەرکەسەو بەشی خۆمان دۆشی و خواردمانەوە و بەشەکەی ئەویشمان هەلگرت بۆی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە شەو دەهاتەوە بە هێواشی سلاوی دەکرد بەشێوەیە ئەوەی کە خەوتوو بوو خەبەری نەدەبووەوە، ئەوەشی کە بە خەبەر بوو گوێی لە سلاوەکەی بوو، لەپاشدا دەچوو بۆ نوێژگاکەی شەونوێژی دەکرد و ئینجا دەچوو بۆ لای بەشە شیرەکەی خۆی و دەیخواردەوە.

## دەربارەی سڵاوكردن لەكەسێ میز بكات كەراهەتی هەیە

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّسْلِيمِ عَلَى مَنْ يَبُولُ

٢٧٢٠ - (حسن صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، وَنَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبُولُ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السَّلاَمَ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى النَّيْسَابُورِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الضَّحَّاكِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ نَحْوَهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلْقَمَةَ ابْنِ الفَغْوَاءِ، وَجَابِرٍ، وَالبَرَاءِ، وَالمهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم میزی دەكرد پیاوێ سڵاوی لێ كرد وەڵامی سڵاوەكەی نەدایەوە.

## دەربارەی سەرەتا بوترێت: (عليك السلام) كەراهەتی هەیە

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَقُولَ عَلَيْكَ السَّلاَمُ مُبْتَدِئًا

٢٧٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ قَوْمِهِ قَالَ: طَلَبْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ أَقْدِرْ عَلَيْهِ فَجَلَسْتُ، فَإِذَا نَفَرٌ هُوَ فِيهِمْ وَلاَ أَعْرِفُهُ وَهُوَ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَامَ مَعَهُ بَعْضُهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ قُلْتُ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللهِ، عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللهِ، عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَيِّتِ، إِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَيِّتِ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيَّ فَقَالَ: إِذَا لَقِيَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ فَلْيَقُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ، وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ أَبُو غِفَارٍ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ، عَنْ أَبِي جُرَيٍّ جَابِرِ بْنِ سُلَيْمٍ الهُجَيْمِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ الحَدِيثَ وَأَبُو تَمِيمَةَ اسْمُهُ: طَرِيفُ بْنُ مُجَالِدٍ.

واتە: لە ئەبو تەمیمەی هوجەیمیەوە، لە پیاوێکی هۆزەکەیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەدەناسی بۆی گەڕام نەم توانی پێی بگەم، دیم کەسێ لەناو چەند کەسێکدا بوو ئاشتەوایی دەکرد لەنێوانیاندا، کاتێ کە لێ بوویەوە هەستا هەندێ کەسی لەگەڵ بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە دیم ئەوە سێ جار وتم: (عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللهِ)، ئەویش سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (بێگومان سڵاوکردن لە مردوو بەو شێوەیەیە دەکرێت)، لەپاشدا رووی تێ کردم و فەرمووی: (کاتێ کەسێ گەیشت بە برا موسوڵمانەکەی بڵێ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)، لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه رەدی دامەوەو فەرمووی: (وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ، وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ، وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ).

٢٧٢٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا بِذَلِكَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ أَبِي غِفَارٍ الْمُثَنَّى بْنِ سَعِيدٍ الطَّائِيِّ، عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الهُجَيْمِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سُلَيْمٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ فَقَالَ: لاَ تَقُلْ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ، وَلَكِنْ قُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَذَكَرَ قِصَّةً طَوِيلَةً. وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ پیاوێ پێشنوێژی لە ماڵ و لە دەسەڵاتی کەسێکی تردا نەکات، وە دانەنیشێت لەسەر فەرشەکەی بە بێ پرس و مۆڵەتی خۆی). - لەریوایەتی تردا هاتووە کە خاوەن ماڵ لەپێشترە بۆ پێشنوێژیکردن، (تَكْرِمَتِهِ) ئەو فەرشەیە کەلەسەری دادەنیشێت و تایبەتە بەخۆیەوە -.

## خاوەن وڵاخ لەپێشترە کە لەپێشەوە سواری وڵاخەکەی خۆی ببێت

٢٥ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الرَّجُلَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِهِ

٢٧٧٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الحُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي بُرَيْدَةَ، يَقُولُ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ وَمَعَهُ حِمَارٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ارْكَبْ، وَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لأَنْتَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِكَ، إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ لِي قَالَ: قَدْ جَعَلْتُهُ لَكَ، قَالَ: فَرَكِبَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي البَابِ عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ.

واتە: لە ئەبو بورەیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەپێ دەرۆیشت پیاوێ هات گوێدرێژێکی پێ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سواربە - خۆی چووە دواوە بۆ ئەوەی لەپاشکۆی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم سواربێت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (نابێ تۆ لەپێشتری کە لەپێشەوە سوار بێت هەتا من، مەگەر خۆت بیبەخشی بە من). ئەویش وتی: ئەوا بەخشیم بەتۆ، جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەپێشەوە سوار بوو.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەتی قاڵی ڕاخستن

٢٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي اتِّخَاذِ الأَنْمَاطِ

٢٧٧٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ لَكُمْ أَنْمَاطٌ؟ قُلْتُ: وَأَنَّى تَكُونُ لَنَا أَنْمَاطٌ قَالَ: أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ لَكُمْ أَنْمَاطٌ قَالَ: فَأَنَا أَقُولُ لاِمْرَأَتِي أَخِّرِي عَنِّي أَنْمَاطَكِ فَتَقُولُ: أَلَمْ يَقُلِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهَا سَتَكُونُ لَكُمْ أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: فَأَدَعُهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئایا قاڵیتان هەیە؟) وتم: قاڵیمان لەكوێ بوو، فەرمووی: (دەی ڕۆژێ دێ قاڵیتان دەبێ)، جابیر وتی: بە هاوسەرەكەم دەڵێم: ئەم قاڵیانە بۆ من ڕامەخەو لایبە، ئەویش دەڵێ: ئەی مەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەیفەرموو: (ڕۆژێ دێ قاڵیتان دەبێ؟)، جابیر وتی: ئیتر منیش وازدەهێنم.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سێ كەس سواری وڵاخێ بن

٢٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي رُكُوبِ ثَلاَثَةٍ عَلَى دَابَّةٍ

٢٧٧٥ - **(حسن)** حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الْعَنْبَرِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ هُوَ الْجُرَشِيُّ الْيَمَامِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَقَدْ قُدْتُ نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ عَلَى بَغْلَتِهِ الشَّهْبَاءِ حَتَّى أَدْخَلْتُهُ حُجْرَةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هَذَا قُدَّامُهُ، وَهَذَا خَلْفُهُ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

واتە: لە ئیاسی كوڕی سەلەمەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە،

کە فەرموویەتی: بۆ خۆم جڵەوی هێسترە بۆری پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم رادەکێشا هەتا بردمە هۆدەکەی خۆی حەسەن و حوسەین لەبەرکۆی و پشتکۆیەوە سواربووبوون.

### ئەوەی هاتووە دەربارەی سەیرکردنی لەناکاو

٢٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي نَظْرَةِ الْفُجَاءَةِ

٢٧٧٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نَظْرَةِ الفُجَاءَةِ فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَأَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرٍو اسْمُهُ هَرِمٌ.

واتە: لە جەریری کوڕی (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی سەیرکردنی کوتوپڕ لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمانی پێ کردم چاوی خۆم بگرم.

٢٧٧٧ - (حسن) حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، رَفَعَهُ قَالَ: يَا عَلِيُّ لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ شَرِيكٍ.

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێشەوا عەلی فەرموو: (ئەی عەلی، تەماشا لەسەر تەماشا مەکە، چونکە یەکەم تەماشا هی خۆتە لەبەرئەوە لەناکاو بووە، بەڵام دووەم تەماشا هی تۆ نیە لەبەر ئەوە گوناهە).

## ئەوەی هاتووە دەربارە

### ٢٩ – بَابُ مَا جَاءَ فِي احْتِجَابِ النِّسَاءِ مِنَ الرِّجَالِ

٢٧٧٨ – **(ضعيف)** حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ نَبْهَانَ، مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَيْمُونَةَ قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عِنْدَهُ أَقْبَلَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَدَخَلَ عَلَيْهِ وَذَلِكَ بَعْدَ مَا أُمِرْنَا بِالحِجَابِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: احْتَجِبَا مِنْهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلَيْسَ هُوَ أَعْمَى لاَ يُبْصِرُنَا وَلاَ يَعْرِفُنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَفَعَمْيَاوَانِ أَنْتُمَا أَلَسْتُمَا تُبْصِرَانِهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، كە فەرموویەتی: مـن لەخزمەت پیٚغەمبـەری خـوادا بـووم صلى الله عليـه وسلم، لەوكاتـەدا مەیمونـەی هاوسەریشی لیٚ بوو، ئیبنو مەكتوم كە پیـاویٚكی كـویٚر بـوو هـات پیٚشـوازیمان لـیٚ كرد، ئەمەش لەپاش ئەوەوە بوو كە فەرمانمان پیٚ كرابوو بـە بالاپۆشـی، پیٚغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم فـەرمووی: (پەردەدادەنـەوەو خۆتـان داپۆشـن)، وتم: ئـەی پیٚغەمبەری خوا! ئەوە كـویٚرە ئیٚمـە نـابینیٚ و نامـان ناسـیٚ؟ پیٚغەمبـەر صـلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئیٚوە كویٚرن و ئەو نابینن؟!).**

## دەربارەی قەدەغەكردنی چوون بۆ لای ئافرەتان بەبیٚ مۆڵەتی میٚردەكەنیان

### ٣٠ – بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الدُّخُولِ عَلَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِإِذْنِ الأَزْوَاجِ

٢٧٧٩ – **(صحيح)** حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ مَوْلَى عَمْرِو بْنِ العَاصِ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ العَاصِ، أَرْسَلَهُ إِلَى عَلِيٍّ يَسْتَأْذِنُهُ عَلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ فَأَذِنَ لَهُ حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ سَأَلَ الْمَوْلَى عَمْرَو

بْنَ العَاصِ عَنْ ذَلِكَ. فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا أَنْ نَدْخُلَ عَلَى النِّسَاءِ بِغَيْرِ إِذْنِ أَزْوَاجِهِنَّ. وَفِي البَابِ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، وَجَابِرٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە بەندەیەكی عەمری كوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، كە عەمر ڕەزای خوای لێ بێ ناردویەتی بۆ خزمەت پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بۆ ئەوەی مۆڵەتی بدات بچێتە خزمەت ئەسمائی كچی عومەیس، ئەویش مۆڵەتی پێدا هەتا كارەكەی خۆی جێبەجێ كرد، بەندەكەی لەوبارەوە لێی پرسی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم قەدەغەی كردووە لێمان بچین بۆ لای ئافرەتان بەبێ مۆڵەتی مێردەكەنیان.

### هۆشیاریدان سەبارەت بە فیتنەی ئافرەتان

### ٣١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي تَحْذِيرِ فِتْنَةِ النِّسَاءِ

٢٧٨٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَسَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِي النَّاسِ فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَى هَذَا الحَدِيثَ غَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الثِّقَاتِ عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا قَالَ: عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ. وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ غَيْرُ الْمُعْتَمِرِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: لە عەمری كوڕی نوفەیلەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (لەپاش خۆم هیچ تاقیكرنەوەیەكم بەجێ نەهێشتووە هێندەی ئافرەتان زیانبەخشتر بێ بۆ پیاوان).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دانانی گوڵێ موو

### ٣٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ اتِّخَاذِ الْقُصَّةِ

٢٧٨١ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ، بِالْمَدِينَةِ يَخْطُبُ يَقُولُ: أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ؟ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْ هَذِهِ الْقُصَّةِ وَيَقُولُ: إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَهَا نِسَاؤُهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ مُعَاوِيَةَ.

واتە: لە حومەیدی كوڕی (عبد الرحمن)ەوە دەگێڕنەوە، كە گوێی لە موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان بوو رەزای خوای لێ بێ لەسەر مینبەری مەدینە لەساڵی حەج دا پارچەیە مووی لە دەستی پاسەوانەكەی وەرگت دەیوت: ئەی خەڵكی مەدینە زاناكانتان لە كوێن؟ من بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستوە رێگەی شتی وەهای نەداوەو دەیفەرموو: (نەوەی ئیسرائیل لەكاتێكدا سەریان تێدا چوو كە ژنەكانیان ئەم كارانەیان ئەنجام دەدا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی دەم و چاو هەڵگرتن و خاڵ كوتان

### ٣٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوَاصِلَةِ وَالْمُسْتَوْصِلَةِ وَالْوَاشِمَةِ وَالْمُسْتَوْشِمَةِ

٢٧٨٢ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ مُبْتَغِيَاتٍ لِلْحُسْنِ مُغَيِّرَاتٍ خَلْقَ اللهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَقَدْ رَوَاهُ شُعْبَةُ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ عَنْ مَنْصُورٍ.

واتە: لە (عبد الله)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی کردوە لە خاڵ کوت و خاڵ بۆ کوتراو، هەروەها نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانە برۆ باریك دەکەنەوە بۆ ئافرەتی تر و ئەو ئافرەتانەش برۆیان بۆ باریك دەکرێتەوە، لەگەڵ ئەوانەی داوای جوانکاری دەکەن و جوانی دروستکراوی خوای گەورە دەگۆڕن.

٢٧٨٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ قَالَ نَافِعٌ: الْوَشْمُ فِي اللِّثَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَائِشَةَ، وَمَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ يَحْيَى قَوْلَ نَافِعٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو ژنەی قژ دەخاتە سەر قژی کەسێکی تر، هەروەها نەفرەتی کردوە لەو ژنەش کە قژ دەداتە دەم قژی خۆی).

## دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَشَبِّهَاتِ بِالرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ

٢٧٨٤ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، وَهَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُتَشَبِّهَاتِ بِالرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ وَالمتَشَبِّهِينَ بِالنِّسَاءِ مِنَ الرِّجَالِ.
هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەفرەتی كردوە لەو ئافرەتانەی كە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان، هەروەها نەفرەتیشی كردوە لەو پیاوانەی كە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

٢٧٨٥ - حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، وَأَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالمتَرَجِّلاَتِ مِنَ النِّسَاءِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەفرەتی كردووە لە پیاوانی سەر ژنانی و لەو ئافرەتانەی كە خۆیان دچوێنن بە پیاوان و لاسایی ئەوان دەكەنەوە.

## ئافرەت بۆنی خۆش لەخۆی بدات و لەماڵ بچێتەدەرەوە كەراهەتی هەیە

## ٣٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ خُرُوجِ الْمَرْأَةِ مُتَعَطِّرَةً

٢٧٨٦ - (حسن) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ القَطَّانُ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُمَارَةَ الحَنَفِيِّ، عَنْ غُنَيْمِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: كُلُّ عَيْنٍ زَانِيَةٌ، وَالمرْأَةُ إِذَا اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ بِالمجْلِسِ فَهِيَ كَذَا وَكَذَا يَعْنِي زَانِيَةً. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو موساوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەموو چاوێ سەیری نامەحرەمی پێ بكرێت زیناكارە، هەر ئافرەتێ بۆنی خۆش لەخۆی بدات و بەلای كۆڕ و كۆمەڵی پیاواندا تێپەڕێت ئەوە هۆكاری زینای چاوە).

## دەربارەی چۆنیەتی بۆنی خۆشی ئافرەتان و پیاوان

٣٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي طِيبِ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ

٢٧٨٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الحَفَرِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ.

حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنِ الطُّفَاوِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ إِلاَّ أَنَّ الطُّفَاوِيَّ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ فِي هَذَا الحَدِيثِ وَلاَ نَعْرِفُ اسْمَهُ، وَحَدِيثُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ أَتَمُّ وَأَطْوَلُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بۆنی خۆش پیاوان كە بەكاری بهێن ئەوەیە بۆنی هەبێ و رەنگی نەبێ — وەك میسك و عەنبەر - ، بەڵام بۆنی خۆشی ئافرەتان كە بەكاری بهێن ئەوەیە رەنگی هەبێ و بۆنی نەبێ — وەك زەعفەران -).

٢٧٨٨ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ الحَنَفِيُّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ خَيْرَ طِيبِ الرَّجُلِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَخَيْرَ طِيبِ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ، وَنَهَى عَنْ مِيثَرَةِ الأُرْجُوَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (چاکترین بۆنێ کە پیاوان بەکاری بهێنن ئەوەیە بۆنی هەبێ و ڕەنگی نەبێ، بەڵام چاکترین بۆنێ کە ئافرەتان بەکاری بهێنن ئەوەیە ڕەنگی هەبێ و بۆنی نەبێ، وە سەرزینی ئاوریشمینی قەدەغەکردووە).

## دەربارەی ڕەتکردنەوەی بۆنی خۆش کەراهەتی هەیە

٣٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ رَدِّ الطِّيبِ

٢٧٨٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ، وَقَالَ أَنَسٌ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (ثمامة)ی کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێ بۆنی خۆشی ڕەتنەدەکردەوە بەڵکو وەری دەگرت و لەخۆی دەدا، فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆنی خۆشی ڕەتنەدەکردەوە.

٢٧٩٠ - (حسن) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ثَلاَثٌ لاَ تُرَدُّ: الوَسَائِدُ، وَالدُّهْنُ، وَاللَّبَنُ الدُّهْنُ: يَعْنِي بِهِ الطِّيبَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مُسْلِمٍ هُوَ ابْنُ جُنْدُبٍ وَهُوَ مَدِينِيٌّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (سێ شت رەتناكرێنەوە: سەرین و رۆن و شیر، ئەو رۆنەی بۆنی خۆشی پێوەیە.

٢٧٩١ - (ضعيف) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَلِيفَةَ أَبُو عُبَيْدِ اللهِ الْبَصْرِيُّ، وَعَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ حَجَّاجٍ الصَّوَّافِ، عَنْ حَنَانٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أُعْطِيَ أَحَدُكُمُ الرَّيْحَانَ فَلاَ يَرُدَّهُ فَإِنَّهُ خَرَجَ مِنَ الجَنَّةِ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ، وَلاَ نَعْرِفُ حَنَانًا إِلاَّ فِي هَذَا الحَدِيثِ، وَأَبُو عُثْمَانَ النَّهْدِيُّ اسْمُهُ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُلٍّ، وَقَدْ أَدْرَكَ زَمَنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَرَهُ وَلَمْ يَسْمَعْ مِنْهُ.

واتە: لە ئەبو (عثمان)ی نەهدیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر رێحانەیان دا بە یەكێ لە ئێوە رەتی مەكەنەوە چونكە ئەسڵەكەی لەبەهەشتەوە دەرچووە).

## دەربارەی نابێت پیاو پیاو یان ژن و ژن پێستیان بەریەك بکەوێ

۳۸ – بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ مُبَاشَرَةِ الرِّجَالِ الرِّجَالَ وَالمرْأَةِ الْمَرْأَةَ

۲۷۹۲ – (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ حَتَّى تَصِفَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە (عبد الله)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نابێت ژن خۆی بنوسێنێ بە ئافرەتێکی ترەوە و سەرنجی بدات لەپاشدا باسی لەش و لار و جوانی ئەو ئافرەتە بکات بۆ مێردەکەی بەشێوەیە وەك ئەوەی کە مێردەکەی لەبەرچاوی بێ و سەیری بکات).

۲۷۹۳ – (صحيح) حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ حُبَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي الضَّحَّاكُ بْنُ عُثْمَانَ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ تَنْظُرُ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با پیاو سەیری عەورەتی پیاو نەکات، هەروەها با ئافرەتیش سەیری عەورەتی ئافرەت نەکات، با پیاو بە رووتی خۆی نەنوسێنێ بە پیاوێکی ترەوە لەژێر پۆشاکێکدا یان لەناو نوێنی خەوتندا، هەروەها با ئافرەتیش بە رووتی خۆی نەنوسێنێ بە ئافرەتێکی ترەوە لەژێر پۆشاکێکدا یان لەناو نوێنی خەوتندا).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پاراستنی شەرمگە

٣٩ – بَابُ مَا جَاءَ فِي حِفْظِ العَوْرَةِ

٢٧٩٤ – (حسن) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ، وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ عَوْرَاتُنَا مَا نَأْتِي مِنْهَا وَمَا نَذَرُ؟ قَالَ: احْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلاَّ مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِذَا كَانَ القَوْمُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ؟ قَالَ: إِنْ اسْتَطَعْتَ أَنْ لاَ يَرَاهَا أَحَدٌ فَلاَ تُرِيَنَّهَا، قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ إِذَا كَانَ أَحَدُنَا خَالِيًا؟ قَالَ: فَاللهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَا مِنْهُ مِنَ النَّاسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باوکم لە باپیرمەوە گێڕایەوە بۆم فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەرمگاکانمان کامەی دەرخەین و کامەی داپۆشین؟ فەرمووی: (عەورەتی خۆت لە هەموو کەسێك داپۆشە جگە لە هاوسەرەکەت و ئەو کەنیزەی کە بوویتە خاوەنی). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەی ئەگەر پیاوێ لەگەڵ پیاوێکی تردا بوو؟ لەریوایەتێکی تردا وتی: وتم ئەی ئەگەر خەڵکەکە زۆربوون و چوو بوون بەناو یەکتردا چۆن؟ فەرمووی: (هەتا دەتوانی با کەس عەورەتت نەبینێ). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەی ئەگەر یەکێکمان خۆی بە تەنها بوو شوێنەکە چۆڵ بوو چۆن؟ فەرمووی: (خوای گەورە لە هەموو کەسێکی تر شیاوترە کە شەرم و شکۆی لێ بکرێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕان شەرمگەیە

٤٠ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الفَخِذَ عَوْرَةٌ

٢٧٩٥ - (صحيح) حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ زُرْعَةَ بْنِ مُسْلِمِ بْنِ جَرْهَدٍ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ جَدِّهِ جَرْهَدٍ، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِجَرْهَدٍ فِي الْمَسْجِدِ وَقَدْ انْكَشَفَ فَخِذُهُ فَقَالَ: إِنَّ الفَخِذَ عَوْرَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ مَا أَرَى إِسْنَادَهُ بِمُتَّصِلٍ.

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوت دای بەلای جەرهەدی ئەسلەمیدا ڕانی دەرخستبوو، فەرمووی: (بێگومان ڕان (عەورەت)شەرمگەیە).

٢٧٩٦ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: الْفَخِذُ عَوْرَةٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕان (عەورەت)شەرمگەیە).

٢٧٩٧ - (صحيح) حَدَّثَنَا وَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَرْهَدٍ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الفَخِذُ عَوْرَةٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَمُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَحْشٍ. وَلِعَبْدِ اللهِ بْنِ جَحْشٍ صُحْبَةٌ وَلِابْنِهِ مُحَمَّدٍ صُحْبَةٌ.

واتە: لە جەرهەدی ئەسلەمیەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ڕان (عەورەت)شەرمگەیە).

٢٧٩٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الْخَلاَّلُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ جَرْهَدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ وَهُوَ كَاشِفٌ عَنْ فَخِذِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: غَطِّ فَخِذَكَ فَإِنَّهَا مِنَ العَوْرَةِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

**واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای جەرهەدی ئەسلەمیدا ڕانی دەرخستبوو، فەرمووی: (ڕانت داپۆشە چونكە بێگومان ڕان (عەورەت)شەرمگەیە).**

## **ئەوەی هاتووە دەربارەی پاك و خاوێنی**

٤١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّظَافَةِ

٢٧٩٩ - **(ضعيف لكن قوله: إن الله جواد الخ صحيح)** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ إِلْيَاسَ، وَيُقَالُ ابْنُ إِيَاسٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ أَبِي حَسَّانَ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ يُحِبُّ الطَّيِّبَ، نَظِيفٌ يُحِبُّ النَّظَافَةَ، كَرِيمٌ يُحِبُّ الكَرَمَ، جَوَادٌ يُحِبُّ الجُودَ، فَنَظِّفُوا، أُرَاهُ قَالَ، أَفْنِيَتَكُمْ وَلاَ تَشَبَّهُوا بِاليَهُودِ قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِمُهَاجِرِ بْنِ مِسْمَارٍ، فَقَالَ: حَدَّثَنِيهِ عَامِرُ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: نَظِّفُوا أَفْنِيَتَكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَخَالِدُ بْنُ إِلْيَاسَ يُضَعَّفُ.

**واتە: لە صاڵحی كوڕی ئەبو حەسانەوە دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە سەعیدی كوڕی موسەییەب بوو دەیفەرموو: خوای گەورە خۆی باش و بێ كەموكوڕیە شتی باشی خۆشدەوێت، پاكە و پاك و خاوێنی خۆشدەوێت، بەڕێزەو بەڕێزی خۆشدەوێت، بەخشندەیە و بەخشندەیی خۆشدەوێت، خۆتان ماڵەكانتان خاوێن ڕابگرن، خۆتان مەچوێنن بە جولەكەكان.**

## پەردە دادانەوە لەکاتێکدا پیاو دەچێتەلای ژنەکەی و جووت دەبێ لەگەڵی

٤٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِسْتِتَارِ عِنْدَ الجِمَاعِ

٢٨٠٠ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ نِيْزَكَ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُحَيَّاةَ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالتَّعَرِّيَ فَإِنَّ مَعَكُمْ مَنْ لاَ يُفَارِقُكُمْ إِلاَّ عِنْدَ الغَائِطِ وَحِينَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى أَهْلِهِ، فَاسْتَحْيُوهُمْ وَأَكْرِمُوهُمْ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ وَأَبُو مُحَيَّاةَ اسْمُهُ: يَحْيَى بْنُ يَعْلَى.

**واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئاگاداربن خۆتان رووت مەکەنەوە چونکە مەلائیکەتان لەگەڵە، لێتان جیانابنەوە مەگەر لەکاتی چوونەسەرئاو، یان لەکاتێکدا پیاو دەچێتەلای ژنەکەی و جووت دەبێ لەگەڵی، شەرمیان لێ بکەن و رێزیان بگرن).**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی چوونە گەرماو

٤٣ - بَابُ مَا جَاءَ فِي دُخُولِ الحَمَّامِ

٢٨٠١ - (**حسن**) حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ دِينَارٍ الكُوفِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُصْعَبُ بْنُ الْمِقْدَامِ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ لَيْثِ بْنِ أَبِي سُلَيْمٍ، عَنْ طَاوُوسٍ، عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَدْخُلِ الحَمَّامَ بِغَيْرِ إِزَارٍ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُدْخِلْ حَلِيلَتَهُ الحَمَّامَ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَجْلِسْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا بِالخَمْرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ طَاوُوسٍ، عَنْ جَابِرٍ إِلاَّ مِنْ هَذَا الوَجْهِ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: لَيْثُ

بْنُ أَبِي سُلَيْمٍ صَدُوقٌ وَرُبَّمَا يَهِمُ فِي الشَّيْءِ وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: لَيْثٌ لاَ يُفْرَحُ بِحَدِيثِهِ، كَانَ لَيْثٌ يَرْفَعُ أَشْيَاءَ لاَ يَرْفَعُهَا غَيْرُهُ فَلِذَلِكَ ضَعَّفُوهُ.

واتە: لە جابیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ باوەڕی تەواوی بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە ڕێگە نەدات ژنەکەی بچێتە گەرماوی دەرەوە، هەرکەسێ باوەڕی تەواوی بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە نەچێتە گەرماوی دەرەوە بەبێ پشتەماڵ، هەرکەسێ باوەڕی تەواوی بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە لەسەر سفرە و خوانێ دانەنیشێ شەرابی لەسەر دانرا بێ با نەش خواتەوە).

٢٨٠٢ - (**ضعيف**) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادٍ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي عُذْرَةَ، وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى الرِّجَالَ وَالنِّسَاءَ عَنِ الحَمَّامَاتِ ثُمَّ رَخَّصَ لِلرِّجَالِ فِي الْمَيَازِرِ. هَذَا حَدِيثٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ وَإِسْنَادُهُ لَيْسَ بِذَاكَ القَائِمِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چونە گەرماوە گشتیەکانی قەدەغەکرد لە پیاوان و لە ئافرەتان، لەپاشدا ڕێگەی دا بە پیاوان بە پشتەماڵەوە بچن.

٢٨٠٣ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ أَبِي الجَعْدِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ الهُذَلِيِّ، أَنَّ نِسَاءً مِنْ أَهْلِ حِمْصٍ، أَوْ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ دَخَلْنَ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: أَنْتُنَّ اللاَّتِي يَدْخُلْنَ نِسَاؤُكُنَّ الحَمَّامَاتِ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ امْرَأَةٍ

تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا إِلاَّ هَتَكَتِ السِّتْرَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ رَبِّهَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە مەلیحی هوزەلیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ژنانی خەڵکی حیمصی یان شام چوون بۆلای عائیشە رەزای خوای لێ بێ، فەرمووی: ئێوە خەڵکی ئەو ناوچەیەن کە ژنەکانیان دەچنە گەرماوە گشتیەکان؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: من خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ جل و بەگەکەی خۆی دابنێ و خۆی رووت بکاتەوە لە غەیری ماڵی خۆیدا ئەوە بێگومان هەتکی پەیمانی شەرم و شکۆی نێوان خۆی و نێوانی پەروەردگاری خۆی کردوە).

## دەربارەی مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە وێنە و سەگی تێدا بێت

## ٤٤ - بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَلاَ كَلْبٌ

٢٨٠٤ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ شَبِيبٍ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ وَاللَّفْظُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، قَالُوا: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا طَلْحَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةُ تَمَاثِيلَ. هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە سەگ و وێنەی تێدا بێت).

٢٨٠٥ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّ رَافِعَ بْنَ إِسْحَاقَ، أَخْبَرَهُ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ، عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ نَعُودُهُ، فَقَالَ أَبُو

سَعِيدٍ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ تَمَاثِيلُ، أَوْ صُورَةٌ شَكَّ إِسْحَاقُ لاَ يَدْرِي أَيُّهُمَا قَالَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێی راگەیاندین: (مەلائیکە ناچێتە مالێکەوە پەیکەر و وێنەی تێدا بێت).

٢٨٠٦ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ، قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُجَاهِدٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَتَيْتُكَ البَارِحَةَ فَلَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَكُونَ دَخَلْتُ عَلَيْكَ البَيْتَ الَّذِي كُنْتَ فِيهِ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ فِي بَابِ البَيْتِ تِمْثَالُ الرِّجَالِ، وَكَانَ فِي البَيْتِ قِرَامُ سِتْرٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ، وَكَانَ فِي البَيْتِ كَلْبٌ، فَمُرْ بِرَأْسِ التِّمْثَالِ الَّذِي بِالبَابِ فَلْيُقْطَعْ فَلْيُصَيَّرْ كَهَيْئَةِ الشَّجَرَةِ، وَمُرْ بِالسِّتْرِ فَلْيُقْطَعْ وَيُجْعَلْ مِنْهُ وِسَادَتَيْنِ مُنْتَبَذَتَيْنِ تُوطَآنِ، وَمُرْ بِالكَلْبِ فَيُخْرَجْ، فَفَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ ذَلِكَ الكَلْبُ جَرْوًا لِلْحَسَنِ أَوِ الحُسَيْنِ تَحْتَ نَضَدٍ لَهُ فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَفِي البَابِ عَنْ عَائِشَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (جیبریل هات بۆ لام پێی فەرمووم: دوێنێ هاتم بۆ سەردانت واتە شەوی رابردوو، هیچ شتێ رێگری ئەوەی لێ نەکردم کە بێمە ژوورەوە بۆ ئەو مالەی کە تۆی لێ بوو ئەوە نەبێ کە پەیکەرێ لەبەر دەرگاکە بوو، لەناو مالەکەدا پەردەیە هەبوو وێنەی لەسەر بوو. هەروەها مالەکە سەگێکی تێدا بوو، بۆیە فەرمان بکە با سەری پەیکەرەکە ببڕدرێت تا وەك درەختی لێ بێت، وە فەرمان بکە پەردەکە بدڕێنرێت و بکرێتە دوو راخەر پێی بخرێتە سەر هاتوچۆ بکرێت بەسەریدا، فەرمانیش بکە سەگەکە دەربکرێت).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەموو ئەو کارانەی ئەنجام دا، سەگەکە هی حەسەن و حوسەین بوو لەژێر تەرواڵەکەدا بوو فەرمانی دا کرایەدەرەوە. - (نضد)تەرواڵە جل و بەرگی لەسەر هەڵئەچنرێت وەك قەرەوێڵە وەهایە - .

## کەراهەتی هەیە پیاو پۆشاکی ڕەنگ کراو و ئاوریشم لەبەرکات

## ٤٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ لُبْسِ الْمُعَصْفَرِ لِلرَّجُلِ وَالقَسِّيِّ

٢٨٠٧ - **(ضعيف الإسناد)** حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ البَغْدَادِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي يَحْيَى، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَحْمَرَانِ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الوَجْهِ. وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُمْ كَرِهُوا لُبْسَ الْمُعَصْفَرِ، وَرَأَوْا أَنَّ مَا صُبِغَ بِالحُمْرَةِ بِالمدَرِ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ إِذَا لَمْ يَكُنْ مُعَصْفَرًا.

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێ بەلای پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم تێپەڕی دوو پۆشاکی سوری لەبەردا بوو، سڵاوی کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەڵام ئەو وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە.

٢٨٠٨ - **(صحيح المتن)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ هُبَيْرَةَ بْنِ يَرِيمَ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ وَعَنِ القَسِّيِّ وَعَنِ الْمِيثَرَةِ وَعَنِ الجِعَةِ قَالَ أَبُو الأَحْوَصِ: وَهُوَ شَرَابٌ يُتَّخَذُ بِمِصْرَ مِنَ الشَّعِيرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی ئەمانەی نەداوە: ئەنگوستیلەی زێڕ

لەدەست کردن - بۆ پیاوان - وە لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی قەسی و عەصفەراناوی ئەوەی بە گیای گەزنە رەنگ دەکرێت، هەروەها خواردنەوەی (جعة) شەربەتێکە لە جۆ دروستکراوە لە میصر.

٢٨٠٩ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَبْعٍ وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ الجَنَازَةِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ، وَرَدِّ السَّلاَمِ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، أَوْ حَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَآنِيَةِ الفِضَّةِ، وَلُبْسِ الحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَالقَسِّيِّ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَأَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ هُوَ: أَشْعَثُ بْنُ أَبِي الشَّعْثَاءِ، وَأَبُو الشَّعْثَاءِ اسْمُهُ سُلَيْمُ بْنُ الأَسْوَدِ.

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردین بە حەوت شت و رێگری حەوت شتیشی لیّ کردین، فەرمانی پێکردین بە شوێنکەوتنی جەنازە و سەردانی نەخۆش و، نزا بۆ کەسێ بپژمێ واتە کاتێ کە پژمی و وتی: (الحمد لله)، پێ بڵێین: خوا رەحمەت پێ بکات، کەسێ با کردینگی کردین بۆسەر سفرەو خوانێ بچین، کەسی ستەم لێکراو سەرخەین، بەجێهێنانی سوێند واتە کەسێ سوێندێکی خوارد لەسەر شتێ گوناهو تاوان نەبێ بۆی جێبەجێ بکەین، بڵاوکردنەوەی سلاو، رێگری ئەمانەشی لیّ کردین: لەدەست کردنی ئەڵقە و ئەنگوستیلەی زێڕ، خواردن و خواردنەوە لە حاجەت و قاپ و قاچاغی زیودا، لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم و دیباج و ئاوریشمی ئەستور و قەسی.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی سپی

٤٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الْبَيَاضِ

٢٨١٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ مَيْمُونِ بْنِ أَبِي شَبِيبٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْبَسُوا الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ.

واتـە: لـە سـەمورەی کـوڕی جوندوبـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (پۆشـاکی سـپی لەبەرکەن چونکە ئەوە خاوێنتر و باشترە، بیشیکەن بە کفن بۆ مردووەکانتان).

## دەربارەی مۆڵەتی لەبەرکردنی پۆشاکی سور لەلایەن پیاوانەوە

٤٧ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي لُبْسِ الْحُمْرَةِ لِلرِّجَالِ

٢٨١١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْثَرُ بْنُ الْقَاسِمِ، عَنِ الْأَشْعَثِ وَهُوَ ابْنُ سَوَّارٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةٍ إِضْحِيَانٍ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِلَى الْقَمَرِ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، فَإِذَا هُوَ عِنْدِي أَحْسَنُ مِنَ الْقَمَرِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ الأَشْعَثِ. وَرَوَى شُعْبَةُ، وَالثَّوْرِيُّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُلَّةً حَمْرَاءَ حَدَّثَنَا بِذَلِكَ مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، ح، وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي

إِسْحَاقَ، بِهَذَا. وَفِي الحَدِيثِ كَلاَمٌ أَكْثَرُ مِنْ هَذَا سَأَلْتُ مُحَمَّدًا، قُلْتُ لَهُ: حَدِيثُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ أَصَحُّ أَمْ حَدِيثُهُ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ؟ فَرَأَى كِلاَ الحَدِيثَيْنِ صَحِيحًا. وَفِي البَابِ عَنِ البَرَاءِ، وَأَبِي جُحَيْفَةَ.

واتە: لە جابیری کوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: لە مانگە شەوێکی زۆر ڕووناکدا پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم دی، سەیری مانگم دەکردو سەیری پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم دەکرد پۆشاکێکی سووری لەبەردا بوو لەلای من ئەو زۆر لەمانگەکە جوانتر بوو.

## دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی سەوز

## ٤٨ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّوْبِ الأَخْضَرِ

٢٨١٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ إِيَادِ بْنِ لَقِيطٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي رِمْثَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ إِيَادٍ، وَأَبُو رِمْثَةَ التَّيْمِيُّ اسْمُهُ: حَبِيبُ بْنُ حَيَّانَ، وَيُقَالُ اسْمُهُ: رِفَاعَةُ بْنُ يَثْرِبِيٍّ.

واتە: لە ئەبو (رمثة)وە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم دی دوو پۆشاک(بوردەی) سەوزی لەبەردابوو.

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشاكی رەش

٤٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّوْبِ الأَسْوَدِ

٢٨١٣ - (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ زَكَرِيَّا بْنِ أَبِي زَائِدَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ شَيْبَةَ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ غَدَاةٍ وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ.

**واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە فەرموویەتی: جارێ بەیانیەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ چوەدەرەوە شاڵێنەیەكی پێچابوو بە خۆیەوە لەمووی رەش دروستكرا بوو.**

## ئەوەی هاتووە دەربارەی پۆشاكی زەرد

٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّوْبِ الأَصْفَرِ

٢٨١٤ - (حسن) حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ الصَّفَّارُ أَبُو عُثْمَانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ حَسَّانَ، أَنَّهُ حَدَّثَتْهُ جَدَّتَاهُ صَفِيَّةُ بِنْتُ عُلَيْبَةَ، وَدُحَيْبَةُ بِنْتُ عُلَيْبَةَ، حَدَّثَتَاهُ، عَنْ قَيْلَةَ بِنْتِ مَخْرَمَةَ، وَكَانَتَا رَبِيبَتَيْهَا، وَقَيْلَةُ جَدَّةُ أَبِيهِمَا أُمُّ أُمِّهِ، أَنَّهَا قَالَتْ: قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَتِ الحَدِيثَ بِطُولِهِ، حَتَّى جَاءَ رَجُلٌ وَقَدْ ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ، وَعَلَيْهِ تَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَسْمَالُ مُلَيَّتَيْنِ كَانَتَا بِزَعْفَرَانٍ وَقَدْ نَفَضَتَا وَمَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَسِيبُ نَخْلَةٍ. حَدِيثُ قَيْلَةَ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَسَّانَ.

**واتە: قەیلەی كچی مەخرەمە فەرموویەتی: خۆر بەرزبوەوە پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه**

وسلم سڵاوی خوات لێ بێ، فەرمووی: (وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ)، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوو پۆشاکی کۆنی بە زەعفەران رەنگکراوی لەبەردا بوو رەنگەکەی وەری بوو بەڵام شوێنەواری پێوە مابوو، لقە دار خورمایەکیشی پێ بوو،

## دەربارەی بەکارهێنای زەعفەران بۆ پیاو کەراهەتی هەیە

## ٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّزَعْفُرِ وَالخَلُوقِ لِلرِّجَالِ

٢٨١٥ - (**صحيح**) حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ (ح) وحَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّزَعْفُرِ لِلرِّجَالِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَرَوَى شُعْبَةُ، هَذَا الحَدِيثَ عَنْ إِسْمَاعِيلَ ابْنِ عُلَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ التَّزَعْفُرِ حَدَّثَنَا بِذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: حَدَّثَنَا آدَمُ، عَنْ شُعْبَةَ. وَمَعْنَى كَرَاهِيَةِ التَّزَعْفُرِ لِلرِّجَالِ: أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ، يَعْنِي أَنْ يَتَطَيَّبَ بِهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگەی نەداوە پیاو زەعفەران بدات لەخۆی یان بیدات لە جل و بەرگی.

٢٨١٦ - (**ضعيف الإسناد**) حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَفْصِ بْنَ عُمَرَ، يُحَدِّثُ، عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبْصَرَ رَجُلاً مُتَخَلِّقًا قَالَ: اذْهَبْ فَاغْسِلْهُ، ثُمَّ اغْسِلْهُ ثُمَّ لاَ تَعُدْ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ اخْتَلَفَ بَعْضُهُمْ فِي هَذَا الإِسْنَادِ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: مَنْ سَمِعَ مِنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ قَدِيمًا فَسَمَاعُهُ صَحِيحٌ، وَسَمَاعُ شُعْبَةَ وَسُفْيَانَ مِنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ

صَحِيحٌ إِلاَّ حَدِيثَيْنِ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ زَاذَانَ، قَالَ شُعْبَةُ: سَمِعْتُهُمَا مِنْهُ بِآخِرَةٍ. يُقَالُ: إِنَّ عَطَاءَ بْنَ السَّائِبِ كَانَ فِي آخِرِ أَمْرِهِ قَدْ سَاءَ حِفْظُهُ. وَفِي البَابِ عَنْ عَمَّارٍ، وَأَبِي مُوسَى، وَأَنَسٍ وَأَبُو حَفْصٍ هُوَ: أَبُو حَفْصِ بْنُ عُمَرَ.

واتە: لە یەعلای کوڕی مورڕەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی دی زەعفەرانی لەخۆی دابوو، فەرمووی: (بڕۆ بیشۆ، پاشان بیشۆ، لەپاشدا جارێکی تر بەکاری مەهێنە).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاوریشم کەراهەتی هەیە

٥٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ

٢٨١٧ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ الأَزْرَقُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَوْلَى أَسْمَاءَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ، يَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ لَبِسَ الحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ. وَفِي البَابِ عَنْ عَلِيٍّ، وَحُذَيْفَةَ، وَأَنَسٍ وَغَيْرِ وَاحِدٍ وَقَدْ ذَكَرْنَاهُ فِي أَبْوَابِ اللِّبَاسِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ قَدْ رُوِيَ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ عُمَرَ. وَمَوْلَى أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ وَيُكْنَى أَبَا عُمَرَ. وَقَدْ رَوَى عَنْهُ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَعَمْرُو بْنُ دِينَارٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: بۆ خۆم گوێم لە پێشەوا عومەر بوو گێڕایەوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەی لە دونیا ئاوریشم لەبەربکات لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەری ناکات).

٥٣ - بَابٌ

٢٨١٨ - **(صحيح)** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَسَمَ أَقْبِيَةً وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ قَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي، فَدَعَوْتُهُ لَهُ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا فَقَالَ: خَبَأْتُ لَكَ هَذَا، قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: رَضِيَ مَخْرَمَةُ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ اسْمُهُ: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ.

واتە: لـە میسـوەری کـوڕی مـەخرەمـەوە ڕەزای خـوای لـیّ بـیّ دەگێڕنـەوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جۆرە پۆشاکێکی دابەش دەکرد هیچ شتێکی دانەنا بۆ مەخرەمە، مەخرەمە وتی: ئەی کوڕی خۆم هەستە با بـڕۆین بۆ لای پێغەمبەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم بـەڵکو شـتێکمان بـداتیّ، منـیش لەتەکی ڕۆشتم، وتی: بڕۆ ژوورەوە پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بۆ بـانگ بکـە، وتـی: بـۆم بـانگ کـرد، پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم هاتـەدەرەوە بـۆ لای پۆشاکێکی لەوانە لەبەردا بـوو کـە دابەشـی کردبـوون، فـەرمووی: (ئەمـەم بـۆ تـۆ شاردۆتەوە). وتی: مەخرەمە سەیری کرد، وتی: جا مەخرەمە ڕازی بوو.

٥٤ - بَابُ مَا جَاءَ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ

٢٨١٩ - **(حسن صحيح)** حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ. وَفِي البَابِ عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ، وَعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَابْنِ مَسْعُودٍ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری ئەو نازو نیعمەتانەی کە بەخشیویەتی بە بەندەکەی پێوەی دیاربێ و بیبینێت).

## ئەوەی هاتووە دەربارەی خوف ڕەش

٥٥ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْخُفِّ الأَسْوَدِ

٢٨٢٠ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَنَّادٌ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ دَلْهَمِ بْنِ صَالِحٍ، عَنْ حُجَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ فَلَبِسَهُمَا ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، إِنَّمَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ دَلْهَمٍ وَقَدْ رَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ دَلْهَمٍ.

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کە نەجاشی - پاشای حەبەشە - جووتێ خوفی ڕەشی سادەی بێ نەخشی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش لەپێی کردن، پاشان دەستنوێژی گرت، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەریاندا.

## دەربارەی ڕێگری لە هەڵکێشانی مووی سپی

٥٦ - بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ

٢٨٢١ - (صحيح) حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ الهَمْدَانِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ، وَقَالَ: إِنَّهُ نُورُ الْمُسْلِمِ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ قَدْ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ، وَغَيْرِ وَاحِدٍ عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ڕەزای خوای لێ

بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رێگری کردووە لە هەڵکێشانی مووی سپی سەر و ریش، فەرمووی: (گومان مووی سپی نور و رووناکی موسوڵمانە).

## راوێژکار ئەمینداره و جێگەی باوەڕە

٥٧ – بَابُ أَنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ

٢٨٢٢ – (صحيح) حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُوسَى، قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ. هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَقَدْ رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنْ شَيْبَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ النَّحْوِيِّ، وَشَيْبَانُ هُوَ صَاحِبُ كِتَابٍ وَهُوَ صَحِيحُ الحَدِيثِ، وَيُكْنَى أَبَا مُعَاوِيَةَ. حَدَّثَنَا عَبْدُ الجَبَّارِ بْنُ العَلَاءِ العَطَّارُ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، إِنِّي لَأُحَدِّثُ الحَدِيثَ فَمَا أَخْرِمُ مِنْهُ حَرْفًا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (راوێژکار ئەمیندارەو جێگەی باوەڕە).

٢٨٢٣ – (صحيح بما بعده) حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ جُدْعَانَ، عَنْ جَدَّتِهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ. وَفِي البَابِ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنِ عُمَرَ. هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ أُمِّ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (راوێژکار ئەمیندارەو جێگەی باوەڕە).

